## پێڕست

٢٨- تی.ئێس.ئیلیەت

٢٩- میلان کوندیرا

٣٠- ڕۆبرت فرۆست

٣١- عەزرا پوەند

٣٢- خورخە لویس بۆرخیس

٣٣- جۆر سیمینون

٣٤- ویلیام فوکنە

٣٥- جان دۆس پاسۆس

٣٦- گی دی موپاسان

٣٧- تۆماس مان

٣٨- ویلام سومرست موام

٣٩- ئیسماعیل گادارە

٤٠- گۆستاف فلۆبیر

٤١- کارلۆس فوینتس

٤٢- ویلیام سارۆیان

٤٣- لیڤ تولستۆی

٤٤- ئالدۆس هاکسلی

٤٥- ئەدوارد مۆرگان فۆرستر

٤٦- ستندال

٤٧- ئەنتوان چیخۆف

٤٨- کارلۆ گولدونی

٤٩- ویلا کارتر

٥٠- ستیفن کرین

٥١- سارا ئورن جیوئیت

٥٢- ڕەی.ب. ویست (کوڕ)

٥٣- پگی هاردینگ لاف

٥٤- ناتانیل هارتون

٥٥- ماری بولتە

٥٦- کاترین ئانن پورتر

٥٧- ئۆ.هنری

٥٨- ئامبروز بیرس

٥٩- نیکۆلای گوگول

٦٠- ئیدگار ئالن پۆ

٦١- شیروود ئەندرسن

٦٢- ئیڤان تۆرگینیف

٦٣- لویچی پیراندیللو

٦٤- ئساك بابیل

٦٥- ئەلبیر کامۆ

٦٦- جیمز جۆیس

٦٧- وایت برینیت

٦٨- فلانیری ئوکونور

٦٩- فیودور میخائیلۆفیچ دۆستۆفسکی

٧٠- ماریۆ بارگاس یوسا

٧١- دەیڤید هیربرت لۆرانس

٧٢- بیرتۆلت بیریشت

٧٣- بۆریس باسترناك

٧٤- ئالکسندر پوشکین

٧٥- هنریك ئە پسن

٧٦- ڤیکتر هۆگۆ

٧٧- کاواباتا یاسوناری

٧٨- مەکسیم گۆرکی

٧٩- فرانز کافکا

٨٠- سیرڤانتس

٨١- هانس کریستیان ئەندرسن

٨٢- دوروتی پارکر

٨٣- ئەمیل زۆلا

٨٤- گارسیا لۆرکا

٨٥- میخائیل شۆلۆخۆف

٨٦- چرنیشفسکی
٨٧- جۆرج برنادشو
٨٨- تیوفیل گوتیە
٨٩- نیکۆس کازانتزاکیس
٩٠- جان پۆل سارتەر
٩١- فریدریك ویل هیل نیتشە
٩٢- جاك لندۆن
٩٣- هریت بیچەر ستۆ
٩٤- پیرل باك
٩٥- برنارد مالامورد
٩٦- جۆن کیتس
٩٧- ویلیام شەکسپیر
٩٨- شارلۆت برونتە
٩٩- ئیمیلی برۆنتە
١٠٠- ئانن برۆنتە
١٠١- ئۆسکار وایڵد
١٠٢- سۆلجنیستن
١٠٣- جۆزیف کونراد
١٠٤- ئالکسی تۆلستۆی
١٠٥- نیکۆلای نیکراسۆف
١٠٦- چارلز دیکنز
١٠٧- ویلیام وردز ورس
١٠٨- سەمۆئیل تایلۆر کۆلریج
١٠٩- جۆرج گۆردون بایرۆن
١١٠- پرسی بیش شیللی
١١١- والتیر ساڤیج لەندۆر
١١٢- لۆرد ئالفرید تینیسۆن
١١٣- رۆبیرت براونینگ
١١٤- ئیلیزابیت بەریت براونینگ

١١٥- ئیدوارد فیتزجیراڵد

١١٦- ئیرسکین کاڵدویل

١١٧- ساول بیلۆ

١١٨- شارل پیر بۆدلیر

١١٩- ئارچیباڵد مکلیش

١٢٠- ماکسویل ئاندرسۆن

١٢١- پۆل ڤالیری

١٢٢- جان ئارتۆر رامبۆ

## وتەیەك

### حەمە كەریم عارف

***ئـەم بەرهەمـە، هـەوڵێكی بچـكۆلەیەو رێنمایەكـە بـۆ ناسـاندنی كۆمەڵـە نـاودارێكی گـەورەی جیهـانی ئـەدەبیات و قوڵكردنـەوەی تێگەیشـتنی خوێنـەرو مشـت و ماڵـدانی زەوقی هونەری وەرگر.***

***هەڵبەتـە بەنـدە قەناعـەتی تـەواوم بـەوە هەیـە كـە كـەلتورو بەرهـەمهێنانی كـەلتوری رووبـارێكی لێـك دانـەبڕاوەو لەسەرچـاوەوە تـا رێژگـە مـوڵكی سـەر لەبـەری تـیرەی بەشـەرەو هـیچ بەرهـەمێكی مـەعریفی نییـە بـە تـەنیا زادەی هـزرو بـیرو خـەیاڵی یـەك نووسـەر بـێ. هـەر نووسـەرێك بگـری قـەرزارباری سەرچـاوەكانی بـەر لـە خۆیـەتی...***

***بەندەش لەم حاڵە بەدەر نیم و بەدەم ئەركی ژیان و پەیدا كردنی بژێوییەوە ئـەم كـارەم ئەنجامـداوە كـە رەنگـە لـە چەشـنی خۆیـداو بـۆ كتێبخانـەی كـوردی جـۆرە پێشەنگایەتییەكی تێدا بێ... جا ئەم كارە وێڕای ئەوەی پەلەپڕوزێی و بگرە تەمبەڵی پێوە دیارە، بەڵام كلیلێكە بۆ چوونە ناو دنیای ئەدەبیاتی ئەو ئەدیبە ناودارانـەی كـە لێرەدا ناویان هاتووە. هەڵبەتە پتر ئەو ئەدیبانەی لە خۆ گرتووە كە جێ دەستیان لە ئـەدەبیاتی جیهانیـدا دیـارە. بـە هـەر حـاڵ ئـەم بەرهەمـە تـەنیا رێنمایەكـە بـۆ ئـەوەی خوێنـەر بخاتـە سـەر راستـە رێگـاو ئیدی بـە خـۆی هـەنگاو بنـێ و مـەنزڵ بداتـە چـاو، چـونكە ئـەم كتێبـە تـەنیا پێناسـەیەكی چـڕو پـڕو كورتەیـەكی زۆر كـورتی ژیـان و بەرهـەمی ئـەو ئەدیبانەیـە كـە جـێ دەسـتیان لـە خزمـەتی ئـەدەبیاتی نەتـەوەیی و مرۆڤانیدا دیارە..***

***ئەم بەرهەمە، راستەوخۆ لەم سەرچاوانەوە وەرگیراوەو وەرگێڕدراوەو هەڵێنجراوەو ئامادەكراوە:***

**١- تـاریخ ادبیـات روس/ جلـد ١، ٢، ڤیكتـورس تـراس/ ترجمـە علـی بهبهـانی چ١/١٣٨٤**

**٢- تاریخ ادبیات روسیە/ جلد ١، ٢، د.س. میرسكی/ ترجمە ابراهیم یونسـی چ١ /١٣٥٤**

٣- تاريخ ادبيات روسى/ استاد سعيد نفيسى چ١/ ١٣٦٧
٤- دليل القارى الى الادب العالمى/ ترجمه محمد الجورا ١٩٨٦ گ١
٥- ستارگان درخشان/ گرد اورنده/ ازاد مهر، شهباز ١٣٣٨
٦- زندگينامه مشهورترين نوسيندگان و شاعيران. زهرا رچائى چاپ هفتم ١٣٨١
٧- موسوعه ادباو امريكا/ الجزو ١، ٢/ ١٩٧٨ الدكتور نبيل راغب
٨- مئه قصيده من الشعر الانگليزى/ ترجمه د. رزوق فرج رزوق بغداد ١٩٧٨
٩- خمسون قصيده مترجمه عن الشعر الانگليزى الحديپ. ترجمه الدكتوره وفاو عبداللگيف زين العابدين ٢٠٠٥
١٠- كبار الكتاب كيف يكتبون ترجمه كاڤم سعدالدين بغداد ١٩٨٦
١١- مێژووى ئەدەبياتى جيهان. وەرگێرانى حمەكەريم عارف
١٢- ديدارى چيرۆكڤانى: و: حمەكەريم عارف ٢٠٠٥
١٣- پەلكە رەنگينە/ حمەكەريم عارف ٢٠٠٣
١٤- ئەو ديوى مەرگ/ حمەكەريم عارف/ ٢٠٠١
١٥- رياليزم و دژە رياليزم لە ئەدەبياتدا -٢٠٠٤، و: حەمەكەريم عارف
١٦- نوسيندگان روس به سرپرستى خشايار ديهيمى - ١٣٧٩.

## ١- ئالین، مارسیل

## Allain, marscel

مارسیل ئالین(١٨٨٥-١٩٦٩) رۆماننووسێکی فەرەنسییە، لە پاریس چاوی بە دنیا هەڵێناوە بە هاوکاری پیرسوڤیستر(فانتۆماس)ی کە قارەمانێکی خەیاڵییە خوڵقاندو دروستکرد،ئەم قارەمانە کەسێکی خاپینۆك و نادروستە،هەزاران تاوان دەکات و لە سزاو زیندان هەڵدێت.ئالین لە لایەن وەشانکارێکەوە راسپێردرا کە پێنج رۆمانی خەیاڵی بۆ بنووسێت،بەڵام لە ماوەی سی ودوو دانە مانگدا،سی ودو بەرگی لە رۆمانی فانتۆماس بڵاوکردەوە.چیرکەکە بە ناساندنی کەسێکی مەندو مەنگ و رازدارو سڕقایم لە میوانییەکدا دەست پێدەکات کە هەر هەموویان ئەو بە سەبەبکاری کوشتنی بیلتام دەزانن،بەڵام زاتی ئەوە ناکەن نێوی بێنن.ئەم دژمنە سەرسەختەی دەسەڵاتدارانی ئاسایش کێیە؟لەوە بە دواوە ئیدی روداوی ناخۆشی ونبوون و دیارنەمان وبێ سەروشوێن بوونی خەڵکانی ناسراو وبەنێوبانگ دێتە گۆڕێ کە لە لایەن (ژۆڤ)ی خەفێ و ئەمنەوە پەیگیری دەکرێت.مارسیل ئالین،پیاوێکی پڕکارو زۆر وەستایە لە دروستکردنی کەش وهەواو هاماج وئۆتمۆسفیری ترسناکدا.قارەمانی رۆمانەکەی لە هەموو جۆرە تاوانێکدا کاراو کارامەیە،لە هەموو شوێنێکدا هەیە و لە هیچ شوێنێکدا دیار نییە،ئاشقی پیشەکەی خۆیەتی و پیاوکوژی بەلاوە وەکو ئاوخواردنەوە وایە.یازدە دانە فیلم لە بەشە زۆرو زەبەنەکانی رۆمانی فانتوماس چێکراوە کە بە پێشەنگی فیلمانی جاسووسی و پۆلیسی دێنە ژماردن.فانتوماس بووەتە جێگەی سەرنجی گەلەك لە شاعران و نوسەران، لەوانە:جان کۆکتۆ،ئانتۆن ئاپولینیر کە مارسیل ئالینی بە "سوڵتانی سورریالیستەکان" نێوبردووەو دەربارەی رۆمانەکەی، لە نووسینێکدا گوتویەتی: "وابزانم زنجیرە کتێبی فانتۆماس تاقە بەرهەمە کە بە تاسەوە هەموویم خوێندووەتەوەو تووشی هەر کەسێکیش بوویم هەمان رەئی هەبووەو لەم رووەوە هاوسەلیقەی من بووە."هەروەها مارسیل ئالین رۆمانێکی رادێویی بە نێوی (پیاوی سەربڕاو)ەوە نووسیوە.ئەگەرچی ئەمرۆکە رۆمانی جاسووسی و پۆلیسی زۆرە،بەڵام نکوڵی لەوە ناکرێت کە مارسیل ئالین بە فانتوماس بەرهەمێکی زۆر جوانی پڕ لە داهێنانی لە پاش خۆی بەجێهێشتووە.

## ٢ - ئاندرێیڤ، لیونید نیکولایوڤیچ

## Andreyev,leonid nikolayevich

یەکێکە لە نووسەرە روسە بەناوبانگەکان،لە سالآنی(١٨٧١- ١٩١٩)دا ژیاوە.خوێندنی لە زانستگەی مۆسکۆ تەواو کردووە و لە سالّی ١٨٩٧دا دکتۆرای لە بەشی ماف وەرگرتووە.دۆستایەتی نزیکی دەگەلّ ماکسیم گۆرکی دا هەبووە.لە سالّی ١٨٩٨دا چەند چیرۆکێکی لە گۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەو رۆژگارەدا بلأوکردەوە.زۆری پێ نەچوو کە لە نێوان هەردوو رێبازی ریالیزم و،کە ماکسیم گۆرکی نوێنەری هەرەدیاری بوو،سەمبولیزمدا کە لەو رۆژگارەدا بەسەر ئەدەبیاتی روسیدا زالّ بوو، پایەیەکی تایبەتی وەدەست هێنا. ئاندرێیڤ ژیانی خۆی وەقفی ئەدەبیات کردبوو.بۆیە چ شتێکی سەرنجراکێش لە ژیانی ئاساییدا نییە،تەنیا ئەوە نەبێت کە کاتێ خوێندکاری زانکۆ بوو لە ئەنجامی ئەشقێکی ناکامدا، هەولّێکی خۆکوژی دابوو.ئاندرێیڤ لە لایەنگرنی شۆڕش بوو،وتەنانەت لە مالّەکەی خۆیدا کۆبوونەوەی نهێنی دەکرد.هەرچەندە خەلّکی لە رێگەی ئەو چیرۆکانەوە کە لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلأوی دەکردنەوە دەیانناسی،لێ شۆرەت و نێوبانگی راستەقینەی لە سالّی ١٩٠٣دا و پاش بلأوبوونەوەی چیرۆکی (موغارەو تەمتومان) دەستی پێکرد.ئاندرێیڤ ویستویەتی لەم چیرۆکانەدا نێروی توندی غەریزە ئینسانییەکان کە بەسەر پاکترین و بێگەردترین خەلّکیشدا زالّ دەبێت نیشان بدات و کۆمەلّگەی خورافاتی و مەزەبی کە مەسەلە غەریزی و شەهوانییەکان قەدەغە دەکات، بە کۆمەلّگەیەکی زیانبەخش بناسێنێت.هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر کەوتنە رەخنە لە بونیادی ئەخلاقی چیرۆکی موغارەو بێ پەروایی نووسەر لە وەسفی دیمەنانی دزێودا، ئەوجاش بە یەکێك لە چیرۆکە هەرە باشەکانی ئاندرێیف زانراوە. شەڕەکانی نێوان روس و ژاپۆن بوونە ئیلهامبەخشی بەرهەمێکی ئاندرێیڤ بە ناونیشانی(زەردەخەنەی سوور) کە لە سالّی ١٩٠٤دا بلأوبووەوە.ئاندرێیڤ لە سالّی ١٩٠٢وە کەوتە نووسینی شانۆنامان و یەکەمین بەرهەمی شانۆنامەی (ئەندێشە)بوو لە سێ پەردەدا،ولە سالّی ١٩٠٢دا نمایش کرا.قارەمانی شانۆنامەکە لاوێکە بە ئارەزووی خۆی دەکەوێتە کاری نووسین،بەلأم هەرگیز نووسین و بەرهەمەکانی خۆی بلأوناکاتەوە.بەردەوام بە هزرو بیری خۆی دەفشێ و خۆی بە ئازاد و بەختەوەر دەزانێ و هەر بۆ تاقیکردنەوەی توانای رۆحی و دەروونی خۆی ،دەکەوێتە سەر کەلّکەلّەی ئەوە کە گەشتێك بە دنیای شێتێتیدا بکات و ئازارو عەزابەکانی شێتایەتی بجەرببێنێت. ئیدی خۆی لەم گەمە ترسناکە دەدات و بەو نیازەی کە دکارێت لەم تالوکەیە دەرباز بێت،خۆی دەکات بە شێت،وهەلّدەستێت ژنە ئازیزەکەی خۆی دەکوژێت و لە ئەنجامدا دەکەوێتە زیندان..لە زینداندا تووشی ئەو دلّە راوکەیە دەبێت کە بەراستی شێتە یان دەوری شێت دەبینێت و ئەم مەسەلەیە بۆ ئەوانی دی باس دەکات.هەمووان بە شێتی دەزانن و ئەوەی لێ ناسەلمێنن کە خۆی بە شێت نیشان دەدات.شانۆنامەی ئەندێشە هەرچەندە شانۆنامەیەکی ئیستیعاری تەواوە، بەلأم رەنگدانەوەی بنەما نەهلیستییەکانیشە. بە

بۆچوونی ئاندرێیڤ نە لە ناخی مرۆڤدا و نە لە دەرێیدا جگە لە ئەندێشەی شەخسی شتێکی دی هەیـەو هـەر ئـەم بـیرو ئەندێشـەیەیە کـە مـرۆڤ دەخاتـە گۆشـەگیری و خەڵوەتگەیـەکی ترسناکەوە. ئاندرێیف کۆمەڵێك شانۆنامەی تری هەن لەوانە: بەرەو ستێران کە لە ساڵی ١٩٠٥دا نمایش کرا،ژیانی بەشەر،کە لە ساڵی ١٩٠٧دا بڵاو بووەوەو بۆ زمانانی فەرەنگی پاچڤە کراو بووە مایەی ستایشی خەڵکی و شورەتی ئاندرێیف. دەمامکانی رەش،کە لە ساڵی ١٩٠٩دا وئۆقیانوس کە لە ساڵی ١٩١١دا بڵاوبوونەوە. کورتە چیرۆکی (حەوت لە سێدارەدراو)کە دوای کوشتارەکەی شۆڕشگێڕانی ساڵی ١٩٠٥،لە ساڵی ١٩٠٨دا بڵاو بووەوە،باشتر گوزارشتی لە مەیل و ئارەزووە کۆمەڵایەتییەکانی نووسەر کردووە. ئەم شانۆنامەیە بریتییە لە ژیانی دەروونی پێنج زندانی سیاسی و دوو جینایەتکار لە زینداندا کە چاوەڕوانی حوکمی دادگان و هەریەکەیان جۆرە مجێزو ورەیەکی هەیە،بەڵام لە دوا ساتدا، لەو کاتەدا کە دەبێ بۆ شوێنی ئیعدام ببرێن،هەست بە برایەتی یەکتر دەکەن و بە هێمنییەکی سەیرەوە بەرەو مەرگ دەرۆن،و وەك بڵێی لەو ساتە غەریب و باڵایەدا بەرەو نوورو روناکییەکی جوان بلەزن.واتە لە پاڵ ئەو رەشبینییەدا کە باڵی بەسەر ئەم بەشەدا کێشاوە،جۆرە تروسکەیەکی ئومێدەواریش بەدی دەکرێت. نووسەر لەم شانۆنامەیەدا نارەزایی خۆی لە هەنبەر سزای ئیعدام دەردەبڕێت..نووسەر شانۆنامەیەکی تری بە ناونیشانی (ئانفی سا)هەیە.ئەم شانۆنامەیە چوار پەردەیە،لە ساڵی ١٩٠٩دا نمایش کراوەو یەکێکە لە کارە هەرە بەناوبانگەکانی نووسەر و لە هەموو کارەکانی دیکەی پتر لەسەر شانۆکانی ئەورووپادا نمایش کراوە.دوا شانۆنامەی نووسەر بە ناونیشانی (یکاترینا ئیڤانۆڤنا)یە، کارێکی سەرکەوتووە،لە چوار پەردەداو لە ساڵی ١٩١٢دا بڵاوبووەتەوە. لە هەمان ساڵدا شانۆنامەیەکی چوار پەردەیی دیکەی لە ژێر سەرناڤی (پرۆفیسۆر ستوریتسین)بڵاوکردەوە.ئەم شانۆنامەیە ژینگەی رۆشنبیرانی روسیای کەمێك بەر لە شۆرشی ١٩٠٥ پیشاندەدات.نووسەر لەم کارەیدا ویستوویەتی نێروی غەریزە سێکسییەکان لە نێو چینێکی خوێنەواری رۆشنبیردا پیشان بدات کە نکوڵی لە هەموو لایەنە واقیعیە بەدەنییەکان دەکات و لە ئەنجامدا دەبنە قوربانی ئەو هەڵوێستەی خۆیان،مامۆستایەك کە سەرگەرمی داهێنانی بەرهەمەکانی خۆیەتی خەڵکێکی زۆر لە ستایشکەران و قوتابیان و پەیرەوان دەوریان داوەو بە تەواوەتی ژینگەی رێك و پێکی خانەوادەو سەرکێشی و بێپەروایی ئەندامانی ئەو خانەوادەیەی فەرامۆش کردووە،تا رۆژێك دەگەڵ لۆدمیلای شاگردو قوتابی خۆیدا کە کیژێکی هۆشنە پەیوەندی پەیدا دەکات،و دەگەڵیدا دەچێتە گەشت و گەڕان و دوای چەند جارێك کە غەریزە سەرکێشەکانی خۆی هەوساردەکات،سەرەنجام دەگەڵ کیژەدا هەڵدێ و لە حاڵێکا کە نێروە شەهوانییەکانی بەسەریا زاڵ بووە،لە کاتی مومارەسەی کاری سێکسیدا بە هۆی هەڵچوونی لە رادەبەدەر دووچاری سەکتە دەبێت و دەمرێت.ئاندرێیف لەم شانۆنامەیەدا خەیاڵ و واقیعی

هونەرمەندانــە ئاوێتــە کــردووەو شــێوازێکی تــازەی بــەکاری شــانۆنامە نووســی بەخشــیوەو سەرکەوتنێکی گەورەی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە..

## ٣- ئانوی. جان

## Anouilh,jean

لە ساڵی ١٩١٠دا لە شاری بوردو لە دایك بووە.بابی خەیات و داکی وێلۆنـژەن بوو.خوێنـدنی زانکۆیی لە سۆربۆن تەواوکردووە.هەر لە لاوییەوە بەهرەو زەوقی لە بواری شانۆدا بە دیار کەوتووە.ماوەیەك سکرتێری و بەردەستی دەرهێنەر (لویس جوڤیت)ی کردووە.کاری نووسەری بە شانۆنامەی سڤۆر دەست پێکردووە کە لە ساڵی ١٩٣٢دا نمایش کراوە. ئیدی بەرەبەرە خۆی لە مەیدانی شانۆدا تاقیکردووەتەوە.ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٣٣دا شانۆنامەی (لاماندارین)ی پێشکەش کراو سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.لە ساڵی ١٩٣٥دا شانۆنامەی (زیندانییەك هەبوو)ی پێشکەشکراو لەمەشیا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا.بەڵام لە ساڵی ١٩٣٧دا شانۆنامەی (رێبوارێکی بێ تێشوو) سەرکەوتنێکی گەورەی بە دەست هێنا.ئەم شانۆنامەیە باسی گەنجێك دەکات کە لە کاتی جەنگدا یادگەو زاکیرەی خۆی لە دەست داوەو لە رابردوودا دەژی..لە ساڵی ١٩٣٨دا شانۆنامەی (ژنی کێوی) پێشکەشکرا کە دەربارەی ئەشقێکی مەحاڵە، سەرکەوتنێکی زۆری بەدەست هێنا..هەر لەو ساڵەدا (١٩٣٨) کۆمیدیای (ئەنجوومەنی سەمای دزان)ی نمایش کرا و دەنگێکی فرەی دایەوە..ئیدی ئانوی لەوە بە دواوە لەسەر شانۆ و شانۆنامە نووسین بەردەوام بوو.بابەت و ناوەرۆکی ژمارەیەك لە شانۆنامەکانی لە ئەفسانانی کۆنی یۆنانییەوە وەرگیراوەو بە شێوەیەکی نوێ و هاوچەرخ داڕێژراونەتەوەو بنەماکانی تراجیدیای کۆنیان تیا ڕەچاوکراوە..ژمارەیەکی تری شانۆنامەکانی ئانوی زادەو بەرەنجامی خەیاڵی رووتن.ئانۆی،شانۆنامەکانی خۆی بە گوێرەی نێوەرۆك و تیمە بەسەر چەند دەستەیەکدا دابەش کردووە کە شانۆنامانی خۆش و ناخۆش لە خۆدەگرن.دەستەی شانۆنامانی سوور لە ساڵی ١٩٤٣دا بڵاو بووەوە ئەم شانۆنامانە لە خۆ دەگرێت: ( کۆڕی سەمای دزان- ١٩٣٢،ژوانێك لە سانلیس- ١٩٤١، لیوکادیا-١٩٣٩).دەستەی شانۆنامانی رەش، لە ساڵی ١٩٤٦دا بڵاو بووەوە بریتییە لە: (سڤۆر،ژنی کێوی،رێبواری بێ تێشوو،ئۆریدیس-١٩٤١،ئانتیگۆن-١٩٤٤،رۆمیۆ و جولێت- ١٩٤٦،میدی-١٩٥٣).ئانوی کۆمەڵە شانۆنامەیەکی تری هەیە بە نێوی شانۆنامانی درەخشان کە لە ساڵی ١٩٥١دا بڵاوبووەتەوەو ئەم شانۆنامانەی لە خۆ گرتووە: (کۆلۆمب- ١٩٥١،بانگهێشت بۆ کۆشك-١٩٤٧،مەشق یان ڤیانی سزادراو-١٩٥٠،سیسیل یان رێبازی باوکان-١٩٥٤)ئانوی زنجیرە بەرهەمێکی مێژوویشی بڵاوکردووەتەوە، یەکێك لەوانە: بکت- ١٩٥٩ کە شاکاری ئانوی یە.بکت، یەکێکە لە کاراکتەرە هەرە درەخشانەکانی نمایشنامەکانی.شانۆنامە خۆشەکانی(جان ئانوی) چێژی تاڵی و شیرینی ژیانیان تێدایە و زۆربەی هەرە زۆریان کۆتاییەکانیان خۆشە.بەڵام شانۆنامە ناخۆشەکانی سەر ڕێژن لە نائومێدی و رەشبینی،بیرەوەری و یادگارانی کۆن هەوێن و بابەتی سەرەکی شانۆنامەکانی (جان ئانوی) پێکدێنن و تام و بۆنی شانۆنامەکانی پیراندیللوی ئیتاڵیایی دەدەن.لە

گۆشـەنیگای ئـانوی یـەوە بەشـەر لـە ڕێگـەی بیرەوەرییـەوە بـە ڕابـردووەوە گـرێ دەخـوات و هــەرگیز نــاتوانێ لــە ڕابــردوو بخەلەســێت..پــرس و دۆزی زەوجینــیش بابــەتێکی دیکــەی شـانۆنامەکانیەتی کـە لـە زۆربەیانـدا پەیوەنـدی مەعنـەوی دوو مـرۆڤ کـە هەریەکـەیان بـە ڕابــردووی تایبــەتی خۆیــەوە بەنــدە، مــەحاڵ دەنــوێنێ.بەشــەر لــە هەنبــەر چارەنووســە جۆراوجۆرەکاندا دەستەوستانە و هیچ مەفەڕێکی نییە، مەگەر پەنا بەرێتـە بـەر هێـزی خـەیاڵ و دنیـای خـەونان و تـەوس و تـوانج لـە دنیـای پوچی و بێهودەییـدا.دنیـای بێهودەیـەیی تاقە داڵـدەو پەناگەیـە لـە بەرانبـەر چارەنووسـدا.(جـان ئـانوی) بـە حـوکمی ژیـانی بـە پیـت و پـڕ بەرهەمی بە گەورەترین شانۆنامەنووسی نەسلی خۆی دێتە ژماردن و نێوبانگێکی فرەی، بە تایبەتی لە دەرێی فەرەنسادا هەیە..

## ٤- ئاشار، مارسیل

## Achad, marcel

مارسـیل ئاشـار(١٨٩٩-١٩٧٤) یەکێکـە لـە شانۆنامەنووسـەکانی فەرەنسـا.خـەڵکی شـاری (لیـون)ـە و لـە سـاڵی ١٩٢٢وە دەسـتی بـە شانۆنامەنووسـی کـردووە..یەکـەمین بەرهـەمی شانۆیی،شـانۆنامەیەکە بـە ناونیشـانی(ئـەو کەسـەی لـە مـەرگی خۆیـدا ژیـا)..بـەڵام یەکـەمین سـەرکەوتنی بەرچاو ودیاری مارسـیل ئاشـار لـە سـاڵی ١٩٢٤دا و بـە شـانۆنامەی (دەخـوازی دەگـەڵ منـدا گەمـە بکـەی؟) بـە دەسـت هـات.شـانۆنامەیەکی خەیاڵئـەنگێزو سـەتیرئامێزو زۆر جـوان بـوو دەربـارەی مەیـدانی سـێرك..دوای ئـەوە شـانۆنامەیەکی مێـژوویی و هونـەری بـە ناونیشـانی (مـالبۆرۆ دەچـێتە جـەنگ) نمـایش کـرا کـە سـەرکەوتنی گـەورەی بـە دەسـت هێنا..ئاشار نزیکەی سی کۆمیدیای نووسیوە کە هـەر هـەموویان سـەرکەوتوون لەوانـە: (من تۆم خۆش ناوێ-١٩٢٦،ژیان جوانە-١٩٢٨،ژنی خامۆش کە لە یـەکێك لـە شـانۆنامەکانی بن جۆنسـونەوە وەرگـیرا بـوو،جینی مـانگ زەدە-١٩٢٩،دۆمینـۆ-١٩٣١،ئێمـە بـۆ ڤالپـاریزۆ دەڕۆین-١٩٤٨)..

ئاشار لـە شـانۆنامەکانیا بایـەخ بـە شـتە زۆر وردەکـانی ژیـان دەدات،کە هەنـدێجار زۆر تـاڵ و ناخۆشـن، لـە وەسـف و وێنـەگرتنی ژینگـە جۆراوجۆرەکـان و داب و نەریتانـدا زیـاتر لایـەنی فـەنتازی و سـەرگەرمی و خەیاڵپـەروەری و هـەجوو داشـۆرین لەبەرچـاو دەگرێـت تـا لایـەنی واقیعبینی.شانۆنامەکانی ئاشار تێکەڵەیەکن لە کۆمیدیای فەنتازی و شانۆنامانمی سەتیرو.. بابەتی دڵخوازی ئاشار لـە زۆربـەی شـانۆنامەکانیا، بێوەفـایی ژنـان و شـێتایەتی و شـەیدایی دڵدارانە، کە شانۆنامەی (جینی مانگ زەدە) دڵگیرترین نموونەیانە..

## ٥- ئارنۆڵد، ماتیو

## Arnold,mathew

شاعیرو ڕەخنەگرێکی ئینگلیزە،لە ساڵانی (١٨٢٢-١٨٨٨)دا ژیاوە.بابی بەڕێوەبەری یەکێك لە قوتابخانە گەورەکانی روگبی بوو.ئارنۆڵد لە ژینگەیەکی رۆشنبیریدا پەروەردە بووەو لە قوتابخانەکانی روگبی و ئۆکسفۆردا خوێندنێکی باشی کردووەو ئەدەبیاتی سەردەمی کۆن فێر بووە.لە ساڵی ١٨٥١دا بووە بە سەرپەرشتیاری پەروەردەو فێرکاری و سی وپێنج دانە ساڵ لەم کارەدا ماوەتەوەو لە ساڵی ١٨٨٨دا کۆچی دوایی کردووە. ئارنۆڵد بە حوکمی ئەم کارەی سەفەرێکی زۆری بۆ وڵاتانی ئەورووپایی کرد و لەم رێگەیەوە تەجروبەو ئەزموونێکی فراوانی بە دەست هێنا..خوێندنەوەو شارەزایی ماتیو ئارنۆڵد لە مەڕ کەلتورێن جۆراوجۆر بوو بە بناغە وهێمی لێکۆڵینەوەو رەخنە وشیعرەکانی. ئارنۆڵد دەیویست ئەوەی دیتوویەتی بە هاووڵاتیانی خۆیی نیشان بدات و خەڵکی ئینگلیستان لە بازنەی تەنگی کەلتوری ناوچەیی خۆیان دەربازبکات و بە گرینگی و بایەخی کەلتوری کۆنی باشوری ئەورووپایان ئاشنا بکا..ئەم هزرو خەیاڵە جۆراوجۆرو دەوڵەمەندانە کردیانە کارێك کە ئارنۆڵد سەرباری سەرقاڵییە فرەکانی دەست بداتە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵێك بەرهەمی هەمەجۆر و لە ماوەی دە ساڵدا پێنج دیوانە شیعریش بڵاوبکاتەوە.یەکەم دیوانی لە ساڵی ١٨٤٩دا لە ژێر سەرناڤی(خۆشگوزەرانی ئاوارەو چەند چامەیەکی دی) بڵاو بووەوە.ئارنۆڵد ویستویەتی لە هەندێ شیعرێن ئەم دیوانەدا سازشێك لە نێوان قەوغای ژیان وئارامی تەبیعەت ،کارو ئیسراحەت،هەراو بێدەنگیدا بەرپا بکات،لەو چامەیەدا کە دیوانەکەی بەناوەوە ناوناوە بۆ دنیای درەخشانی یۆنانی کۆنمان بکێش بکات و ئیلهامی شاعیرانە و هزری قوول پێکڤە گرێ بدا.ئەم دوو فاکتەرە سەرەکییە لە شیعرەکانی سەردەمی کامڵبوونی شاعیردا زیاتر پەرەدەسەنەن.دیوانی دووەمی لە ژێر سەرناڤی (ئیمپیدۆکلس لەسەر لوتکەی کێوی ئەتینا و چەند شیعرێکی دی)لە ساڵی ١٩٥٢دا بڵاوبووەوە.چامەی ئیمپیدۆکلس سەربهوردی ئەو فەیلەسوفەیە کە بە گوێرەی ئەفسانەیەك خۆی خستە زارکی کێوی گڕکانی ئەتیناوە.چامەی (میرۆپ-١٨٥٨)هەوڵێکی ئارنۆڵدە لە مەیدانی شیعری شانۆیی.ئارنۆڵد کە لایەنگر و هەواداری گەڕانەوەی هونەری یۆنانی کۆن بوو، هەر بە وەرگێڕانی شاکارانی یۆنانی کۆنەوە نەوەستا،بەڵکو شتی لە شانۆنامەکانیشیان وەردەگرت و گۆڕانی تیا دەکردن و لە نوێ دایدەڕشتنەوە..ئارنۆڵد لە ساڵی ١٨٥٣دا بۆ یەکەمجار شیعرەکانی خۆی لە ژێر سەرناڤی (کۆ هۆزانان) بە ناوی خۆیەوە بڵاو کردەوەو چەندین شیعری ،لەوانە چامەی ئیمپیدۆکلس لەسەر لوتکەی ئەتینا،لە دیوانەکەی لابرد هەندێ شیعری تازەی خستە سەر..دیارترین شیعرێن ئەم دیوانە چامەی داستانی زۆراب و رۆستەمە کە لە شانامەی فیردەوسی شاعیری مەزن و داستانبێژی ئێرانی وەرگرتووە.لەگەڵ چامەی تریستان و ئیزۆڵت،کە چیرۆکێکی دڵگیرەو هەمیشە مایەی سەرنجی شاعیرانی رۆمانتیك بووە.ئارنۆڵد گۆڕانی تیا کردووەو فۆرمێکی تازەی پێ بەخشیوە.قارەمانی چیرۆکەکە لێرەدا ئیزۆڵتی قژزێڕین نییە،بەڵکو

ئیزۆڵتــی ســپی دەســتە،ژنی تریســتان و دایکــی دوو فرزەنــدە.باشــترین شــیعری ئارنۆڵــد لاوانەوەکانیـەتی کـە شـیعری (کێـوەلی سـکۆلارو ترسـیس)ــەکە لـە یـادی مـەرگی یـەکێك لـە هاورێکـانی گوتویەتی،پایەیـەکی تایبـەتی لـە نێویانـدا هەیـە و بـە خۆشـئاهەنگترین شـیعری ئارنۆڵد دەژمێردرێ. ئارنۆڵـد شـیعری لـە قاڵب و کێشی جۆراوجۆردا داناوە،کە هەنـدێ جـار قافیەکانیان نارێکن،هەنێجار بێ قافیـەن و هەنـدێجار بـێ کێش و قافیـەن و لـە قـاڵبی شـیعری ئـازادان.وێـڕای ئەمـەش شـێوازو تـۆن وریـتم و ئاهـەنگ و پێکهاتـەو چـەمکی شـیعرەکانی نیشانەو بەڵگەی زەوق و سەلیقەی تایبـەتی شاعیرن.گرینگترین شیعری ئارنۆڵـد لـە تەمـەنی بەر لە چل و پێنج ساڵی دانراون.لە ساڵی ١٨٥٧دا لە زانستگەی ئۆکسفۆردا کورسی شیعری وەرگـرت و دوای ماوەیـەك وازی لێهێنـا.دەسـتی لـە دانـانی شـیعر هـەڵگرت و کـاتی خـۆی بـە تـەواوەتی بـۆ فەلسـەفەو هـزری رەخنـەیی و لێکۆڵینـەوە دەربـارەی ئـەدەبیات، خوداناسـی و فێرکردن و پەروەردە تەرخانکرد.لەو سەروبەندەدا زنجیرە وتارێکی لە زانستگەی ئۆکسـفۆردا بـە ناونیشـانی (دەربـارەی پاچڤەی بەرهەمـەکانی هۆمـەر) پێشـکەش کرد،بەرهـەمێکی تـری بریتی بوو لە راپۆرێك دەربارەی کاری پەروەردەیی لە ژێر سەرناڤی (پـەروەردەی گشتی لـە وڵاتی فەرەنسـادا).هـەوەڵین نووسـینی رەخنـەیی ئارنۆڵـد لـە سـاڵی ١٨٦٥دا لـە ژێـر سـەرناڤی (چەند وتارێك لەمەڕ رێبازی رەخنە) بڵاو بووەوە. لە ساڵی ١٨٦٧دا وتـارێکی بە ناونیشـانی (دەربـارەی لێکۆڵینـەوەی ئـەدەبیاتی سـیڵت) بـڵاو بـووەوە. ئارنۆڵـد شـارەزاییەکی فـرەی لـە مەیـدانی فێرکـردن و پـەروەردەو سیاسـەت و ریفـۆرمی کۆمەڵگـەدا هەبوو،ولـە هـەموو ئـەم بوارانەدا قەڵەمڕانی کردووە. لە روانگەی ئارنۆڵدەوە چینی ئەشراف و ئەرستۆکرات بە هـۆی کەڵکەڵـەی موڵکـداری و تـەماعکاری فـرەوە، قـابیلی چـاکبوون نییـە. چـینی ناوەراسـت سەروسـەختی دەگـەڵ کـەم هۆشـی و توڕەهاتاندایـە و چینی خـوارووەش هـەر پارەیـەکی بینـی رووەدەکاتە قومارو خواردنەوەو رابواردن.ئیدی هەموو ئومێدێکی ئارنۆڵد بە چینی ناوەراسـت دەبێـت و هـەموو هـەوڵی خـۆی بـۆ چاکسـازی ئـەم چینـە تـەرخان دەکـات.لـە سـاڵی ١٧٦٩دا کتێبـی (کـەلتوورو ئەنارشـیزم) ی بڵاوکـردەوە کـە لەوێـدا کۆمـەڵێك پێشـنیازی دەربـارەی کـەلتوورو فێرکـردن و پـەروەردە پێشـکەش کـردووە وکـەلتووری بـە گـەوەترین فاکتـەری چارەسـەری دژواریـەکان زانیـوە.ئارنۆڵـد بـاوەری وابـووە کـە لـە هـەردووك رووی پراکتیکـی و هزرییــەوە پێتڤییــە بگەڕێینــەوە ســەر کــەلتووری یۆنــانی کۆن،کــە باشــترین سەرچـاوەی مەعریفەتـە. دوو کۆگوتـاری ئارنۆڵـد لـە ئـەمریکادا بـە ناونیشـانی : (کـۆی گوتارەکـان لـە ئـەمریکا)و (شارسـتانیەت لـە ئـەمریکا) بڵاوبووەتـەوە.سـەبارەت بـە ئـاین، ئارنۆڵـد پێـی وایـە دەبێـت دەسـت لـە مەسـەلە میتافیزیکییـەکان هـەڵبگیرێت..بـەڵام بـۆ خـۆی ئەفسـانانی ئـاینی جولەکەو مەسیحی لە شیعرەکانیا پاراستووە.. لـە مەیدانی مەسـەلە ئاینییەکانـدا، لـە سـاڵی ١٨٧٠دا کتێبـی ( سـەنت پـۆل و مـەزەبی پرۆتسـتانت) ولـە سـاڵی ١٨٧٣دا (ئـەدەبیات و دۆگما)ی بڵاوکردووەتەوە..ئارنۆڵد لە مەیدانی رەخنەدا یەجگار بە نێوبانگـە،و لـەم مەیدانـەدا تا رادەیەك لەژێر کاریگەری (سەنت بۆف)ی رەخنەگری بناڤ و دەنگی فەرەنسیدایە..لـە رووی

شیعرییەوە بە یەکێك لە شاعیرە بەرجەستەکانی سەردەمی ڤیکتۆریا دەژمێردرێت..ژیانی کە تێکەڵەیەك بووە لە ئەقڵ و لۆژیك و ئیلهام وسەرۆی سەر ڕێژ لە دەردو ڕەنجی شاعیرانە لە شیعرەکانیا ڕەنگی داوەتەوە و هەموو خەم و خولیایەکی ئەوە بووە چۆن دنیایەکی بێ غەل و غەش و شادییەکی ئەبەدی بە دەست بێت، وەکو گوتمان ئارنۆڵد پیاوێکی یەجگار ڕۆشنبیر بووەو بە بۆچوونی هەندێ لە ڕەخنەگران ئەم ڕۆشنبیرییە دەوڵەمەندە بووەتە مایەی خەفە بوون و دامرکانەوەی زەوق و بەهرەو ئیلهام و سەرۆی ڕاستەقینەی شیعریی ئارنۆڵد.

## ٦- ئالفيرى، ڤيتوريۆ

## Alfieri, vittorio

یەکێکـە لـە شـاعیرو شانۆنامەنووسـەکانی ئیتاڵیـا و لـە سـاڵانی (١٧٤٩-١٨٠٣)دا ژیـاوە. تەمـەنی یـەك سـاڵان بـوو کـە بـابی مـرد.لـە قوتابخانـەی شـەوانە ڕۆژی سـوپایی تورن،کـە لـە قوتابخانــە هــەرە باشــەکانی ئــەوروپا بووە،خوێندوویــەتی وکــە ئــەکادیمیای ســوپایی تەواوکرد،دەسـتی کـرد بـە گەشـت و سـەفەرانی دوورو درێژ،هـەوەڵجار سـەردانی شـارەکانی ئیتاڵیــای کــرد و پاشــان ســەفەری وڵات و شــارەکانی ئــەوروپای کــرد وەك: پــاریس، ڤیەنا،پروس،روسیا و لەندەن و لە میانەی ئەو گەشت و سەفەرانەدا گیانی دژە ستەمکاری لە لا گەشایەوە..ئیدی خەڵکی لە گۆشەنیگاو روانگەی ئەوەوە بوون بە دوو گروپـی قێزەونـەوە: گروپـی خولآمـانی بەدبـەخت و ڕۆژ ڕەش و گروپـی فـەرمانرەوایانی زاڵـم و سـتەمکار.. تـەنیا ئینگلتـەرای بـە مەڵبەنـدی ئـازادی دەزانـی..ئـالفیری لـە سـاڵی ١٧٧٣وە لـە سـەفەر گەرایـەوەو زیـاتر وەختـی خـۆی بـە ئەسـپ سـواری و ڕابـواردن و خوێندنـەوەوە بەسـەر دەبرد.لـە سـاڵی ١٧٧٥دا یەکەمین تراجیدیای خـۆی بە ناونیشـانی کلیۆپـاترا نمـایش کـرد..سـەرکەوتنی ئـەم بەرهەمـە کردیـەکارێك ئـالفیری لـە ژینگـەو کۆمەڵگـەی ئـەهلی ڕابـواردن و خۆشـگوزەرانی دووربکەوێتەوەو گۆشـەگیری هەڵبـژێرێت.ئیدی زۆر بـە گـەرمی کەوتـە خوێندنـەوەی بەرهەمـە کلاسـیکیە ئیتاڵیـایی و لاتینییـەکان و نووسـینی تراجیـدیا..ئـالفیری لـە سـاڵانی١٧٧٤-١٧٨٧دا کۆمەڵێك تراجیدیای نووسی کە ئیلهام وسـەرۆی هـەموویانی لـە ئەفسانانی کـۆن و هەسـتی مرۆڤدۆسـتانە و دژە سـتەکارییەوە وەرگرتبـوو..بـەڵام جیهـانبینی مرۆڤدۆسـتانە و ئازادیخوازانـەی ئـالفیری کـە لـە ژێـر کاریگـەریی هەواڵـەکانی شـۆرشـی فەرەنسـادا شـکۆفەی کردبوو،دوای ئەوەی سەردانی فەرەنسای کرد و لـە نزیکـەوە توندرەویی شـۆرشـگێرەکانی بـە چاوی خـۆی بینـی، بـە تەواوەتـی پوکایـەوە.جا ئـالفیری نائومێـدی خـۆی لـە بەرهـەمێکی دا بـە نێـوی (میزۆگـالۆ) کـە بـە مانـای (ئـەنتی فەرەنسـیان) دێـت لـە سـاڵی ١٧٩٨دا دەربڕیـوە.ئـەم بەرهەمـە بریتییــە لــە کۆمــەڵێك وتــارو ژمارەیــەکی زۆر لــە شــیعری هــەجوئامێز کــە شــاعیر نائومێـدی خـۆی لـە شـۆرشـی فەرەنسـاو بەڵێنـەکانی ئـازادی، بـە شـێوازێکی تونـد دەربڕیـوە بێئەوەی لایەنگری لە نەیارانی شۆرشیش کردبێت..یانی دوورکەوتنەوەی خۆی لە سیاسـەت نیشانداوەو بەس.ئیدی ئەم شاعیرە لەوە بەدواوە هەموو هەوڵێکی خۆی بۆ تراجیدیا نووسی تەرخانکردووە..قارەمانـانی ئـەم تراجیدیانـە بوونـەوەرانی ئەفسـانەیی و میتـا بەشـەری بـوون کە خۆیان لە جەنگ و کاروکردەوەی نزمی زەمینی هەڵدەقورتاند..ئالفیری هونـەری تراجیـدی کرد بـە هۆیـەك تـا دوو پرەنسـیپی هەڤدژ، واتـە ئـارەزووی شـکۆمەندی و پوچـەڵی دنیـایی لـە بەرانبەر یەکدا دابنێت و ئەو شکۆمەندییەی کە لە ژیانی واقیعیدا بوونی نەبوو لەسـەر شـانۆ بەرجەسـتە بکـات. سـەبارەت بـە ژیـانی سـۆزداری، ئەشـق و ڤیـانی ئـالفیری بـۆ کۆنتێسـەی ئالبانی،یەکێکــە لــە ئەشــقە ڕۆمانتیکــە هــەرە بــە نێوباگــەکانی و بــوو بــە سەرچـاوەو ئیلهامبەخشــی گــەلێك لــە غــەزەل و تراجیـدیا گـەورەکانی.ئـالفیری جگـە لـە بەرهــەمی

شانۆیی،بەرهەمێکی گەورەشی بڵاوکردەوە کە بە ژیننامەی خۆی دێتە ژماردن.ئەم بەرهەمە بە ناونیشانی (ژیان) لە ساڵی ١٧٩٠دا لە پاریس نووسراوەو تا ساڵی ١٨٠٣ چەند بەشێکی دیکەشی بۆ زیاد کراوەو لە ساڵی ١٨٠٤دا دوای مردنی بڵاوبووەتەوە..نووسەر لەم بەرهەمەدا مەبەستی بووە سەربهوردی مەعنەوی و هەزری خۆی بگێڕێتەوە کە لە وێدا بەوپەڕی وردی رابردووی خۆی لە مەحەك دەدات و گیانێکی تازە بە هەچوار قۆناغی ژیانی خۆی دەبەخشێت، واتە قۆناغی منداڵی، مێردمنداڵی، لاوی و قۆناغی پوختە بوون و پیری..سێ قۆناغی یەکەم ،قۆناغی دەرکەوتنی بەهرە،قەریحە، دوودڵی و دژبێژییەکانی شاعیرێکە کە هێشتا لە هەوڵوتەقەلای دۆزینەوەی رێگەی خۆیدایە و سەرەنجام تەسلیم بە هونەری خۆی دەبێت..ئالفیری بەدەم وەسف و وێنە جوان و رەنگینەکانی ئەم کتێبەوە پەردە لە رووی دنیای ناخ و دەروون وسۆزو گوداز و دەردو ئازار و هوروژانە رۆحییەکانی خۆی لادەبات. ئەم کتێبە (ژیان) هەرکە بڵاوبووەوە، سەرکەوتنێکی زۆر باشی بە دەست هێناو پێشوازییەکی گەرم وگوڕی لێکراو بە یەکێك لە شاکارەکان هاتە ژماردن.ئالفیری لە ساڵی ١٨٠٠وە تا١٨٠٣ شەش دانە کۆمیدیای سیاسەت ئامێزی لە قاڵبی مێژوویی و خەیاڵیدا نووسی. تەنیا کۆمیدیای (تەلاَق )دەربارەی داب و نەریتە.ئالفیری ١٧ پارچە شیعری هەجوئامێزی هەیە کە لە نێوان ساڵانی ( ١٧٧٧-١٧٩٧)دا بە تۆن و زمانێکی توند لە واری هەجوو رەخنەی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا نووسیوونی.غەزەلەکانی بریتیە لە سێ سەد پارچە کە دەنگدانەوەو ڕەنگدانەوەیەکی راستگۆیانە و راستەوخۆی ژیانی ئاشقانە،خەم و نیگەرانی،رەشبینی و گەشبینییەکانی نووسەرێکی پەریشان بیرە..بەلاَم وێرای هەموو ئەمەش هەر بە نووسەرێکی گەورەو دیاری مەیدانی تراجیدیا دەژمێردرێ. لە ساڵانی ( ١٧٨٧- ١٧٨٩ )دا نۆزدە تراجیدیای بە زمانی فەرەنسی نووسیوە کە هەندێکیان لە دوای مردنی بڵاوبوونەتەوە. ئەم تراجیدیانە لە شێوەو فۆرمدا کلاسیکن و لە تیمەو نێوەرۆکدا لایەنی رۆمانتکیان بەسەردا زاڵە..تراجیدیاکانی بەزۆری لە مێژوو وئەفسانانەوە وەرگیراون و هەڵێنجراون وەك: ( ئانتیگۆنا،ڤیرجینیا،ئاگامەمنوون،ئوریستە، برۆتۆ، میرا.) وهەندێکیان لە تەوراتەوە وەرگیراون وەك: ( سائول) کە بە شاکاری ئەو دەژمێردرێ.ژمارەیەکیشی لە مێژووی سەدەکانی ناڤین و تازەوە وەرگرتوون وەك: ( فیلیپۆ،ماری ستوارت،ودۆن گارسیا..)ئالفیری جگە لەو بەرهەمانە کۆمەڵێك نووسینی هەمەجۆری دیکەی هەن کە بیرو بۆچوونی ئەو لە بواری جوانیناسیدا نیشان دەدەن.. ئەوەی پەیگیری بەرهەمە شانۆییەکانی ئالفیری بکات زۆر بە ئاسانی کەسایەتی ئالفیری لە پشت پەردەی کاراکتەرەکانییەوە دەبینێت.. بێگومان بەرهەمەکانی کارێکی فرەیان کردووەتە سەر نووسەرانی پاش خۆی...

## ٧- ئاریوستو، لۆد ڤیکۆ

## Ariosto, Ludovico

شاعیرێکی ئیتاڵییه له نێوان ساڵانی ( ١٤٧٤- ١٥٣٣ )دا ژیاوه.نۆبەرەی داك و بابی بووه، به خۆیـەوە دە خوشـك و بـرا بـوون.بـابی ئەفسـەرێکی پایەبـەرزی شـاری فیرارا بـوو.خوێنـدنی راسـتەقینەی لـه فیرارا کـردووه و لقـی مـافی کـه بـابی بـۆی دیـاری کردبـوو تـەرك کـردو و بـه حەزی خۆی لقی زمان و ئەدەبیاتی کۆنی هەڵبژارد،کەوته خوێندنەوەی هۆزانێن لاتینـی و بـه زمـانی لاتینـی شـیعری هۆنـدەوە..زۆری پێنەچـوو بـابی مـرد و ناچـار بـوو بـەرێوەبردنی کاروباری خانەوادەکەیان بگرێته ئەتۆ،لەبەر ئەمه بوو به کاتب و سکرتێری پیاوانی نێوداری شار و چەند شۆرەتی ئەدەبی زیاتر دەبوو،وەزع و حاڵی کۆمەڵایـەتی باشتر دەبوو،تـا ئـەنجام بنەماڵەی ئیسته (                )که ماوەیەکی زۆر فەرمانرەوای شاری فیرارا بوون داڵدەیان دا و گرتیانه خۆ..لـه ساڵی ١٥٢٧دا دەگـەڵ ( ئالیسـاندرا بینۆچـی )دا کـه لـه جوانیـدا یـەجگار بـه ناوبانگ بوو وئاریوستو چەندین ساڵ بوو دڵی پێوه بوو،زەماوەندی کرد.لـه سـاڵی ١٥٢٢دا بوو به فەرمانـداری یـەکێك لـه شارەکان،هەرچـەنده ئـەم کـاره دەگـەڵ گیـانی شـاعیرانەی ئـەودا تێکی نەدەکردەوه،بەڵام لەبەر دەستکورتی به ناچاری قەبوڵی کرد.ئیدی زۆر به جددی کەوته رێکخسـتن و خزمـەتی شـارەکە،بەڕادەیەك لـه کۆتـایی کارەکەیـدا، لـه سـاڵی ١٥٢٥دا شـار بـه تەواوەتی له پاشاگەردانی و پەشێوی و تالان و برۆ خەلەسی بوو،و باری سەرشـانی خـەڵکی هەژارو رەش و رووتی شاری تـەواو سووك کـرد..لـەوه بـه دواوه هـیچ کـارێکی دیکـەی قـەبوڵ نەکرد و بۆ فیرارا گەڕایـەوەو میراتـی خانەوادەکـەیانی بەسـەر هەقدارانـدا دابەشـکرد و لـه نێـو خانەوادەو منداڵەکانیا به خۆشی و ئاشتی و ئارامی ژیانی بەسەربرد.

ئاریوستو،بەرهەمی زۆره. شیعره لیریکییەکانی که به زمانی لاتینی له نێوان سـاڵانی ١٤٩٣- ١٥٠٣دا نووسیونی باشترین شیعری سەردەمی لاوی شاعیرن که بەوپـەڕی راسـتگۆیی ئەشـق و شادی و لەزەتی ژیانی له قاڵب و چوارچێوەی چامەێن یەجگار ناسـك و جوانـدا بەرجەسـته کردووه. ساتیرەکانی که ژمارەیان حەوت دانەیه له ساڵانی ( ١٥١٧- ١٥٢٥ )دا نووسـراون،له سـاڵی ١٥٣٤داو دوای مردنـی شـاعیر بڵاوبوونەتـەوه. ئـەم شـیعرانه بـه شـێوازێکی یـەجگار رەوان و راسـتگۆیانه خـەون و خۆزیـا ودەردو رەنجـه دەوونییـەکانی خـۆی و کۆمەڵگـەی رۆژ نیشاندەدەن.ئاریوستو،پێنج کۆمیدیی نووسیوه،لەوانه:( سەندوقۆکه،له پێنج پەردەدایه و له سـاڵی ١٥٠٨دا،هەرچـەنده شـاعیر لـه پێشـەکییەکەیدا دەڵێـت خـۆی لـه لاسـایی کردنـەوەی شانۆی یۆنانی و لاتینی دوور گرتووه،بەڵام سێبەری شانۆیی سەردەمانی کۆن بەسەر رۆحـی شـانۆنامەکەو کاراکتەرەکانییـەوه دیـاره.حازرکـەری رۆحان،لـه سـاڵی ١٥٢٠دا نووسـراوه،له سـاڵی ١٥٣٠دا نمـایش کراوه،هەرچـەنده بابەتەکـەی سـاتیر ئامێزه،بـەڵام کۆتاییـەکی ساردوسڕی هەیه..کۆمیدیای لینا،که له پێنج پەردەدایه و له ساڵی ١٥٢٩دا نمایش کرا و بـه باشـترین کۆمیـدیای ئاریوسـتو لـه قەڵـەم دراوه، شـاعیر بـه شـێوازێکی دینـامیکی پڕجـۆش

وێنەیەکی ئەو شارەی کە تیایا ژیاوەو ئەو گەندەڵیەی کە لە کۆمەڵگەی سەدەی شازدەدا باوبووە،دەخاتە بەرچاو. شانۆنامەی توێژەران،لە ساڵی ١٥١٨دا دەستی پێکردو بە نیوەچڵی مایەوەو پاشان لە لایەن کوڕەکەیەوە تەواو کراو لە دوای مردنی خۆی بڵاوبووەوە. کۆمیدیاکانی ئاریوستو بە زۆری لە دەرباری شاری ( فیرارا )دا بەوپەڕی ڕێزو شکۆوە دەخرانە سەر شانۆ..بەڵام شاکاری ئاریوستو بەیتی سوارچاکی (ئۆرلاندۆی توڕەیە) کە بریتییە لە ٤٦ کۆپلە، لە ساڵی ١٥٠٢دا دەستی پێکراوە،بەشێکی لە ساڵی ١٥١٦دا بڵاوبووەتەوە و پاشان لە ساڵی ١٥٣٢دا بە تەواوەتی چاپ بووە. ئەم شاکارە بە چاولێکەری ئەو داستانانەی کە لە سەرانسەری ئەوروپای باشوردا با بوون،دانراوە..ئەو خاڵەی کە ئەم بەرهەمەی جوان کردووە و جیای کردووەتەوە،ئەو تواناو دەسەڵاتەیە کە شاعیر لە ریزبەندی ڕووداو وریتمی چیرۆکەکەدا بەکاری بردووە. کەم بەرهەم هەیە هێندەی ئەم بەرهەمە پڕبێت لە وێنەی واقیعی دنیای ئینسانی و ئەو هەموو خەون و خەیاڵ و تەنز و ناسکییە شیعرییەی لە خۆگرتبێت..لەسەرەتاوە وا دێتە بەرچاو کە شاعیر جڵەوی خۆی بە وێنەێن زەینی و ورۆحی داهێنان سپاردبێت،بەڵام بەزەبری وەستایی لە هونەرو زاڵی بلیمەتی، توانیویەتی بەوپەڕی وردبینی لە سەرانسەری بەیتەکەدا هاوسەنگی بەرهەمەکە بپارێزێت و بە گشتی لە هەرچل و شەش کۆپلەکەدا ،کۆشکی شیعرێکی زۆر ناسك و بە ریتم و مەزن بینا بکات.دەوڵەمەندی هزرو تۆن و ئاوازی ڕەنگاو ڕەنگی ئەم بەرهەمە هەموو جیلوەکانی قۆناغی رێنیسانسی ئیتالیایی لە خۆدا بەرجەستەکردووەو تێپەڕبوونی رۆژگار هەرگیز پرشنگ و درەوشانەوەی کز نەکرووە..

ئاریوستو،دوا ساڵەکانی تەمەنی بە باخەوانی لە باخەکەی خۆیداو بە پێداچوونەوەو چاککردنەوەی دیوانی شیعرەکانی کە لە سڵی ١٥٣٢دا بڵاو بووەوە، رابوارد. لە ساڵی ١٥٣٣دا کۆچی دوایی کرد بێ ئەوەی بەرپرسانی پایەبەرزی دام و دەزگای حکومەتی یان ئاینی وەکو پێویست پەی بە بایەخی بلیمەتی ئەو بەرن..

## ٨- ئاریستۆفان ( ئاریستوفانس )

## Aristophanes

شاعیرو كۆمیدیا نووسێكی یۆنانیه له ساڵانی (٤٤٥- ٣٨٥ پ.ن) ژیاوه.ئەم شاعیره له سەردەمێكدا ژیاوه كه ئازادی خەڵكی ئەتینا له لایەن خەڵكی ئەسپارتەوه زەوت كرابوو..ئیدی كەوتووەته دژایەتی جەنگ و دیموكراسیەتی پاشكەوتوو، وچل و چوار بەرهەمی لەو بوارەدا نووسیوه كه تەنیا یانزه كۆمیدیای ماوه.كۆمیدیای ( میوانان) له بەرهەمه هەوەڵینەكانی ئاریستۆفانه و لەوێدا میتۆدی فێركردن وپەروەردەی باوی ئەو رۆژگارەی داوەته بەر تەوس و توانجان.( بابلییەكان )ی له ساڵی ٤٢٦پ.ز نمایش كراوەو لاوازی و سستی دام ودەزگای حكومەتی ئاتین نیشاندەدات.كۆمیدیای ( ئارخانیاس ) له بەرهەمه زۆر كۆنەكانی ئاریستۆفانه، هەرچەنده له رووی بونیاد وپێكهاتەوه پوخته نییه و بەرهەمی سەردەمی لاوی شاعیره،بەلاّم جۆره بەهرەو بلیمەتییەكی پێوه دیاره،شاعیر لەم بەرهەمەدا هێرش دەكاته سەر لایەنگرانی شەڕو شەڕی ئەسپارتییەكان به شێوەیەكی ساتیرئامێز وێنه دەگرێ..شانۆنامەی ( هێزی سواره ) له ساڵی ٤٢٤پ.ز نمایش كراوەو بابەتەكەی كردووه به دەستاوێزو بیانوویەك بۆ هێرشی توندو تیژ بۆ سەر دیموكراسی كلیونی ڕابەری عەوامخەڵەتێنی و پڕ دەسەڵاتی دیموكراسی.كۆمیدیاكانی سەردەمانی كۆن كه زیاتر دژی خەڵكانی تایبەتی دەنووسران،له قاڵبی ئاوازو سروودی دەستەجەمیدا پێشكەش دەكران، وچونكه جۆره گۆساخی و تانەو تەشەرێكی ئاشكراو راستەوخۆیان له خۆگرتبوو، دەبوونه مایەی كەرب و كینان.ئیدی تاقمی كۆرس له شێوەی لیبۆكاندا، به جل و بەگی حەیواناتەوه كاروباری واقیعی رۆژیان به شێوەیەكی كۆمیكی حەیابەره پێشكەش دەكرد. ئایستۆفانیش له قاڵبی كۆمیدی دا، دژی دیموكراسی پاشكەوتوو و هەر جۆره مەیل و ئارەزوویەكی تازەگەری له مەزەب و فەلسەفەو فێركردن و پەروەردەدا دەوەستا و له رێگەی ئاوێتەكردنی واقیع و خەیاڵ و وێنەێن زەینییەوه هونەری خۆی له نووسینی كۆمیدیادا دەنواند و دەسەلماند.له كۆمیدیای ( هێزی سواره ) دا هەموو خەڵكی ئاتینای له شێوەی تاكێكدا نیشانداوه،تاكێك كه نێوی میللەته وله شێوەی پیرەمێردێكایه كه كەوتووەته حاڵی منداڵیەتی وجڵەوی خۆی داوەته دەست كۆمەڵێك خزمەتكاری خاپینۆك تا به كەیفی خۆیان بەملاو بەولایدا بەرن. كلیون لەم كۆمیدیایەدا له شێوەی یەكێك له خوڵاّم و خزمەتكارەكاندا به دیار دەكەوێ. كۆمیدیای ( هەورەكان ) كه ئاریستۆفانس به شاكاری كۆمیدیاكانی خۆیی دەزانێ، له ساڵی ٤٢٣دا نمایش كراوه، هۆی شۆرەت و نێوبانگی ئەم كۆمیدیایه ئەوەیه كه یەكێك له كاراكتەرەكان رەمزه بۆ كەسایەتی سوكرات كه له و موناقەشەو گێنگەشه یەی نێوان لایەنگرانی پەروەردەی كۆن و پەروەردەی تازەدا بەشداری دەكات.

ئاریستۆفان، لەم كۆمیدیایەدا گاڵته به چەنەبازی دەكات و ئەوه نیشاندەدات كه له روانگەی سەفسەتەچییه چەنەبازەكانەوه هیچ ئلوهیەت و خوادارییەكی ئەفسانەیی له ئارادا نییه،تاقه ئلوهیەتێك كه دانی پێدا دەنەن، ئلوهیەتی هەورەكانه. تاقمی كۆرس كه رەمزی هەورەكانن،

به جلكی ژنانەوە دەردەكەون،بە كەپووی درێژەوە خۆیان لە چارشێوی كەوەییەوە پێچاوە. كۆمیدیای ( ژەنگە سوورەكان ) لە ساڵی ٤٢٢پ.ز نمایش كراوەو وەكو هەموو شانۆنامەكانی ئاریسۆفان هێرشێك بوو بۆ سەر داب و نەریت و حكومەت و دەسەڵاتی زەمانە. ئەم شانۆنامە كۆمیك و جوانە بووە مایەی پەسندی ڕاسین،شانۆنامە نووسی فەرەنساوی،و بووە سەرچاوەی ئیلهامی شانۆنامەی ( خودانێن مەرافعە ) .كۆمیدیای (ئاشتی ) لە ساڵی ٤٢١پ.ز دا نمایش كراوەو دژایەتی ئاریستۆفان لە هەنبەر شەڕ نیشاندەدات. كۆمیدیای ( باڵندەكان ) لە ساڵی ٤١٤ دا نمایش كراوەو وڵاتێكی خەیاڵی نیشاندەدات كە بە كۆمەكی باڵندان لە نێوان ئەرز و ئاسماندا دروستكراوە، ئاریستۆفان چونكە بە خۆی تەبیعەت و گیانلەبەرانی خۆشویستووە،لەم شانۆنامەیەدا باڵندەكانی بە ئینشایەكی یەجگار ناسك ستایش كردووەو جوانترین ئاوازی بۆ هونیونەتەوەو لە هیچ شانۆنامەیەكیدا نەگەییوەتە ئاستی ناسكی ئەم شانۆنامەیە . شانۆنامەی ( لی سیس تراتا ) لە ساڵی ٤١١پ.ز نمایش كراوەو نارەزاییەكە لە هەنبەر شەڕ. لەم شانۆنامەیەدا بەرقەراری و بەركەماڵی ئاشتی بە ( لی سیس تراتا )كە ژنێكی بە ڕاستی سەلارو كەیبانۆی خەڵكی ئاتینە سپێردراوەو نووسەر گەرەكیە ئەوەمان نیشان بدات كە حكومەت و دەسەڵاتی پیاوان دووچاری ناكامی بووەو هەموو شتێك لە سەردەمی دەسەڵاتی پیاواندا گەندەڵ بووە، كەواتە تاقە دەرمانی دەردی ڕۆژ ڕەشی یۆنان لەوەدایە كە جڵەوی كاروباران بە ژنان بسپێردرێت.كۆمیدیای ( ژنان لە تسموفوریا ) دا لە ساڵی ٤١١پ.ز نمایش كراوەو بریتییە لە هەجوێكی دڵگیری تراجیدیاكانی ئۆرپید.. كۆمیدیای (قورباقان ) لە ساڵ ٤٠٥پ.ز نمایش كراوە. ئورپید كە هەمیشە لە لایەن ئاریستۆفانەوە گاڵتەی پێكراوە، ساڵێك بەر لە نمایشكردنی ئەم شانۆنامەیە كۆچی دوایی كردووە. ئاریستۆفان لەم شانۆنامەیەدا وا وێنا دەكات كە خواوەندی تراجیدیا بە خەمی مەرگی ئەم نووسەرە گەورەیە گیرۆدە بووە، بۆیە دەچێتە ژێر زەوی تا شاعیر لە تاریكی گۆڕەوە بۆ دنیای روناك بگێرێتەوە. ئاریستۆفان ویستویەتی ئەوە نیشانبدات كە بەرهەمە گەورەكانی یۆرپید دەگەڵ نووسەرەكەیاندا فەوتاون كە هەڵبەتە ئەو بۆچوونە دروست نەبووە، چونكە كاریگەریی یۆرپید بەسەر ئەدەبیاتی نەسلەكانی دواترەوە حاشا هەڵنەگرە. كۆمیدیای ( ئەنجوومەنی ژنان ) لە ساڵی ٣٩٢پ.ز نمایش كراوە، لەم كۆمیدیایەدا،ژنانی موحتەرەم پیشان دەدرێن كە بەفێڵ جلكی مێردەكانیان لەبەر دەكەن، لە ئەنجوومەنی شورای ئاتیندا ئامادە دەبن و یاسایەك پەسند دەكەن كە بە گوێرەی ئەو یاسایە حوكم بە دەست ژنان دەسپێردرێت. ئاریستۆفان لە بندێڕی ئەم شانۆنامە كۆمیكییەدا گاڵتە بە كەڵكەڵەی ئەو تازەگەرییە دەكات كە لە ئاتیندا بووەتە مایەی شەڕو گەندەڵی. لەبەشی دووەمی شانۆنامەكەدا گەنجێك نیشان دەدات كە لەبەر گوێڕایەڵی بۆ یاسا ناچاردەبێت زیاتر دڵی پیرەژنان رازی بكات تا دڵی ژنانی گەنج.دوا شانۆنامەی ئاریستۆفان ( پلوتوس)ـە لە ساڵی ٣٨٨پ.ز نمایش كراوە. پلوتوس خواوەندی

سەروەت و سامانە و نووسەر لەم شانۆنامەیەدا هێرش دەکاتە سەردابەشکردنی ناعادیلانەی سەروەت و سامان..

ئاریستۆفانس، کەسایەتیەکی تێکەڵ و پێکەڵی هەیە: لە لایەکەوە لایەنگری باوەرو ئیمانی کۆنە، لە لایەکی ترەوە خواوەندان لە قاڵبی ساتیردا نیشان دەدات و گاڵتەیان پێەکات.لە لایەکەوە لایەنگری ئەخلاقەو نووسینەکانی دەخاتە خزمەتی ئارمانج و ئارمانی گەورەوە، لە لایەکی ترەوە بێپەرواو بە خۆشی و شادییەوە عەیب و کەم وکورپییە ئەخلاقیەکان باس دەکات.. لە هەمان کاتدا شۆخیباز و تەنزنووس و خودان هزرو بیری بەرزە..ئاریستۆفان بە دوا شاعیری مەزنی یۆنانی کۆنی سەدەی پێنجەمی پ.ز دەژمێردرێ..

## ٩- ئانا زیگەرز

**١٩٠٠-١٩٨٣**

**شینی.....شین**

((١))

**خا ئانا زیگەرزی خاوەنی ئەم رۆمانە یەکێکە لە ئەدیبە هەرە بەناوبانگەکانی ئەڵمانیا و بە لوتکەیەکی ئەدەبی تازەی ئەڵمانیا دەژمێردرێ. بەدەگمەن ئەدیبێك دەبینرێ کە وەکو ئەو پابەندی هونەری چیرۆکڤانی بێ بە هەموو ژانرەکانییەوە.واتە رۆمان وچیرۆك و ئەفسانەو حیکایەت. هەڵبەتە لەم بوارەدا شێوازێکی هونەریانەی دوور لە خۆپەرستی هەبووەو هەڵیداوە بابەتەکانی لە واقیعەوە هەڵێنجێ و کاراکتەر و قارەمانانی چیرۆکەکانی لە قوڕە خۆشەی واقیع دروستبکات،هەر بۆیەش دەبینین نووسینەکانی ئەم نووسەرە گەورەیە کە بەلوتکەیەکی قوتابخانەی ریالیزمی تازە دەژمێردرێ، بە راستگۆیی و بابەتی و گەرم و گوری خودی ئاوێتە بە خەم و ئەندێشەی مرۆڤانی ئاواو ئاوەدانە.ئەم راستگۆییە هونەرییەش لەسەرانسەی بەرهەمەکانیدا بەرجەستەو دیارە.بەڵکو راستگۆیی بەشێك بووە لە ژیانی چ وەکو هونەرو چ وەکو هەڵوێست لێی لانەداوە.ئانا زیگەرز کە ناوی راستەقینەی (سینی راد فانی) یە لە ساڵی ١٩٠٠دا لە شاری مایس هاتووەتە دنیاوە.کیژیماڵێکی دەڵەمەند بووە.بابی لە بازرگانە زەنگینەکان بووە، سەوداو مامەڵەی عەنتیکەوات وشتی کۆنینەو تابلۆ و کەڤالێن هونەری دەکرد.زیگەرز خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە زێدی خۆی تەواو کردووە .پاشان مێژووی هونەرو فەلسەفەو لقەکانی زمانی لە هەردووك زانگۆی کۆلۆنیا وهایدلبرگ خوێندووەو لە ساڵی ١٩٢٤دا تێزێکی لەسەر نیگارکێشی بە ناوبانگ رامبراندت پێشکەش کردوو دکتۆرانامەی لەسەر وەرگرت.لە ساڵی ١٩٢٨دا یەکەم رۆمانی بەناوی (کروبیج)ەوە بڵاوکردەوەو خەڵاتی(گلایست)ی لەسەر وەرگرت.وئیدی سەری رۆمان وچیرۆکی کرایەوە.**

**زیگەرز یەکێکە لەو ئەدیب و نووسەرانەی بەربەرەکانی دەسەڵاتی نازی دەکرد.هەر بۆیەش نازییەکان دەزیندانیان هاویشت.وبەرهەمەکانیان سوتاند.لێ کە بەر بوو لە رێگەی سویسراو پاشان فەرەنساوە هەڵات و لە مەکسیك گیرسایەوە.یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی یەکێتی نووسەرانی ئەڵمانیا کە گۆبڵزی وەزیری پرۆپاگەندەی ئەڵمانیا هەڵیوەشاندەوە، بۆیە نووسەران و رۆشنبیرانی**

دەربەدەرو دوورە وڵاتی ئەڵمان یەکێتییەکەیان دامەزراندەوەو یەکەم کۆنگرەیان لە پاریس گرت.

زیگەرز، لە ساڵی ١٩٣٥دا بەشداری یەکەم کۆنگرەی جیهانی نووسەرانی لە پاریس کرد کە لە سایەیدروشمی(بەرگری لە کەلتور) گیراو وتەیەکی کاریگەری بە ناوی ( ڤیانی نیشتمان) پێشکەشکرد.پاشان لە دووەم کۆنگرەی جیهانی نووسەراندا لە مەدرید لە ساڵی١٩٣٨دابەشداری کرد، هەروەها لە کۆنگرەی سێیەمیشدا کە لە پاریس گیرا بەشداری کرد.

((٢))

لە ساڵانی ئاوارەیی و دەربەدەریدا رۆمانی (خاچی حەوتەم-١٩٤٢)ی بڵاو کردەوە.هۆلیوود لەساڵی ١٩٤٤دا ئەو رۆمانەی کرد بە فیلمی سینەمایی وسبنسەر تریسیی ئەکتەری بە ناوبانگی ئەمریکی رۆڵی سەرەکی تێدا بینی .شایانی باسە ئەم رۆمانە ٦٠٠ هەزار نوسخەی لێ چاپکراو شۆرەتێکی بێ وێنەی لەو سەردەمەدا بە دەست هێنا.لە ساڵی ١٩٤٤دا رۆمانێکی دیکەی بە نێوی ( پەرینەوە-١٩٤٣) بڵاوکردەوە. لەم رۆمانەدا مەسەلەی خۆشەویستی بە شێوەیەکی هونەری جوان پیشاندراوە و ئەوە بەرجەستە کراوە کە سروشت و شێوەو پێکهاتەی کۆمەڵ،مرۆڤ بە ئاستی چاکە یان خراپەدا ئاراستە دەکات.

زوڵمو زۆری نازییەت، مەکسیکی کرد بە نیشتمانی دووەمی ئەو وزۆری دیکەی وەکو ئەو کە لە دۆزەخی نازییەت هەڵاتبوون و مشەختی بووبوون.زیگەرز لە مەکسیکۆی پایتەختدا گیرسایەوەو کەوتە مشورخواردنی نووسەرانی دەربەدەری ئەڵمان وکۆکردنەوەو بەسەر کردنەوەیان، لەوێندەر(بزاڤی ئەڵمانیای ئازاد)یان دامەزراندو گۆڤارێکیان بەناوی( گۆڤاری ئەڵمانیای ئازاد)ەوە دەرکرد.زیگەرز هەر لەوێ بوو بە سەرۆکی (یانەی هاینریش هاینە)ی دژ بەفاشیزم.

پاش دووەم جەنگی جیهانی و لە ساڵی ١٩٤٧دا بۆ ئەڵمانیا گەرایەوەو لەوساوە تا مردنی لە ساڵی ١٩٨٣دا لە ئەڵمانیای دیموکراتیدا نیشتە جێ بوو. لە ساڵی ١٩٥٠دابە سەرۆکی یەکێتینووسەرانی ئەڵمانیا هەڵبژێردراو لە هەموو کۆنگرەکانی دیکەشدا هەر بەسەرۆکی مایەوە تا ساڵی ١٩٧٨و لە کۆنگرەی هەشتەمدا رایگەیاند کە لەبەر باری تەندروستی و پیر بوون حەز دەکات واز لە سەرۆکایەتی یەکێتی نووسەران بێنێ،بەڵام بەشدارانی کۆنگرە وەکو رێزنان لە کارە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکانی بە سەرۆکی فەخری یەکێتی نووسەرانیان هەڵبژارد.

زیگەرز پاش گەرانەوەی لە تاراوگە گەلەك خەڵاتی گەورەو نایابی لەسەر كارە ئەدەبی و هەڵوێستە شۆرشگێرییەكانی وەرگرت، لەوانە:خەڵاتی بۆشنەر ساڵی ١٩٤٧،لەسەر رۆمانی (خاچی حەوتەم). خەڵاتی ئاشتی لینین ساڵی ١٩٤٩.خەڵاتی هونەرو ئەدەبیاتی نیشتمانی لە ساڵانی ١٩٥١، ١٩٥٩، ١٩٧١.

زیگەرز، جگە لە رۆمان گەلەك چیرۆكی كورت و درێژی هەیە لەوانە: ( هێزی بندەستان-١٩٤٥،گەشتی كیژانی مردوو-١٩٤٣،روناكی سەر سێدارە-١٩٦١، دیداری تایبەتی-١٩٧٣،راپەرینی راوچیانی ماسی لە سانت باربارە-١٩٢٨، مردووەكان هەر بەگەنجی دەمێننەوە-١٩٤٩،قرێری بنجبڕ-١٩٥٩،هاورێیانی سەفەر-١٩٣٥،ترانسیت-١٩٤٣، ومتمانە-١٩٦٨) دیارە زیگەرز لە وڵاتانی ئەڵمانیزماندا جەماوەرێكی فراوانی خوێنەری هەیە و بەرهەمەكانی خراونەتە سەر زۆربەی زمانە زندووەكانی جیهان. ئەم نووسەرە بەرهەمی یەجگار زۆرە لەسەر نیشتمان و گەلی خۆی.بەڵام نیشتمانی دووەمی (مەكسیك)و ئەمریكای لاتینی فەرامۆش نەكردووەو پانتاییەكی گەورەی لە كارە ئەدەبییەكانیدا داوەتیٚ.و لە زۆر رۆمانیدا بەرجەستەی كردوون لەوانە: (دەریای كاریبی) و رۆمانی (شین.. شین) دیارە مەكسیك خودانی شارستانییەتیكی رەسەنە، هونەری وێنەو رەسمی سەر دیواری ماڵان و تەلاران بەشێكی دیاری ئەو وڵاتە بەدەستەوە دەدات..

((٣))

(جاشینی... شین)كە لە ساڵی ١٩٦٥دا بڵاوبووەتەوە چیرۆك و سەرگوروشتەی سواڵەتسازێكی مەكسیكییە بە نێوی بنیتۆ كە لە هەمان كاتدا چیرۆكی ونبوون و گەران و دۆزینەوەی خودە.. مرۆڤی سادەو ساكاری مەكسیكی لە رێگەی هونەری رەسەنی خۆیەوەكاریًكی ئاشكرای لە زیگەرز كردووە .رەسمی سەر دیواران-فریسكۆ-دیارترین بەڵگەی لێهاتوویی هونەری میللی مەكسیكە،كە ئەم هونەرە كاریگەرییەكەی لە بەرهەمێن نووسراو وخوێنراو دیارترەو بەشێوەو رەنگ و هێڵ و هێڵكارییان هزرو بیرێكمان دەداتیٚ كە حەرف وپیتان ناتوانن گوزارشتی لێبكەن..ئەمە گەل ومیللەتی مەكسیك و بۆچوونی ئانا زیگەرزە دەربارەی،كە لە هونەردا ئاوێتە بوون.ئەزموونی راستە قینەی ئەم رۆماننووسە تێكۆشەرە لە ولاتی تاراوگەدا پتر لە رۆمانی(شینی...شین)دا بەرجەستە بووە. قارەمانی رۆمانەكە بە دووی رەنكی شیندا كە رەنگی خۆشەویستو دڵخوازییەتی، دەگەریٚ،كە بەهۆی

جەنگەوە لە ولاّتی خۆیدا دەچێتە قاتی ودەستناکەویٚ.قارەمانەکە بە جۆریٚ هۆگرو ئاوێتـەی رەنگـی شـین دەبێـت، دەبێـت بـە بەشـێك لـە خـۆی و لێـی جیـا نابێتـەوە.. قارەمانەکـە دوای مەشـەقەتو مانـدووبوونێکی زۆر ئـەو رەنگـەی لای (رۆبـن)ی خزمـی چـنگ دەکـەویٚ، کـە رۆبـن –ش پـاش هـەولٚ وکۆششـێکی زۆر لـە نـاو دارو پـەردوو وپاشماوەی کاناندا دەیدۆزێتـەوە.و بـەم دۆزینەوەیـەی خـۆی شـادو دلٚخـۆش دەبیٚ و بەلٚێن بەخۆی دەدات کە رازی ئەم دۆزینەوەیە بپارێزێت.بەلاّم کە دلٚنیا دەبێت بینیۆ تەنیا لە رەنگەکە ناگەرێت وەکو رەنگ،بەلٚکو رەنگەکە بووە بە بەشێك لە خۆی، ئیدی بە ئەندازەی پێویستی خۆی لەو رەنگەی دەداتیٚ. واتە رەنگ لەم روانگەیەوە هونەرو کەلەپورە نەك کالاّیەکی بازاری .رەنگی شین رەمزی واقیعی مرۆڤی سادەو رەسەنی مەکسیکە.نووسەر لە روانگەی مرۆڤێکەوە نـەك لـە روانگـەی گەشـتیارێکەوە مامەلٚـەی لە تەك ئەم بابەتـە دا کردووەو ئەوەی سـەلماندووە کە داهێنـانی دەگمـەن لـە خـودی هەر مرۆڤێکدا هەیە و بەزەبری راستگۆیی هونەری و دلٚسۆزی بۆ هونەر گەشەو نەشو نمـا دەکـات، ژیـان و بەرهـەمێن ئـەم نووسـەرەمان بەلٚگـەی زنـدووی ئـەو راسـتییەن و(شینی...شین) لەو بەرهەمانەیە کە پیر نابن..

---

سەرچاوە:

١-الازرق..الازرق/انا زیغرز-ترجمە: د.سامی حسین الاحمدی/ دارالمامون-١٩٨٨
٢-انازیگرز،سفر حافل بالنصال والعصا،المتالق-عمر علی شریف/ گولان العربی ٧٨/ ١١/ ٢٠٠٢

# ١٠ - ئۆرويل، جۆرج

نێوی ڕاستەقینەی (ئێریك ئارتۆر بلێر)ە.لە ساڵانی ( ١٩٠٣-١٩٥٠)دا ژیاوە.لە هندوستاندا، لە خێزانێکی ئینکلیزی-هندی هاتووەتە دنیایە.بابی فەرمانبەری ئیدارەی کەشفی قاچاغ بوو. خوێندنی لە کۆلیجی ئیتون لە بەریتانیا تەواوکردووە.لە ساڵی ١٩٢٢دا پاش ئەوەی کۆلیجی تەواوکرد لە دەزگای کۆلۆنیالی بیرمانی دا، لە هندو چین کەوتە کارکردن.لە ساڵی ١٩٢٨دا دەستبەرداری ئەم کارە بوو تا خۆی بۆ کاری ئەدەبی تەرخان بکات. لەم قۆناغەدا خووی دایە خوێندنەوەو موتاڵای بەرهەمی نووسەرانی میناکی: جیمس جۆیس، ت.س.ئیلیوت و د،ه. لۆرانس، کە کارێکی زۆریان تێکرد. کە بۆ ئەوروپا گەڕایەوە ماوەیەك بە هەژاری ودەستکورتی لە فەرەنساو لەندەن ژیا. بیرەوەرییەکانی ئەم سەفەرەی لە کتێبی: (هەژاری لە پاریس ولەندەن-١٩٣٣)دا وەسفکردووە. لە هەمان ساڵدا چیرۆکی (ڕۆژانی بورمە)ی بڵاوکردەوە. ئەمە چیرۆکێکی خەیاڵئەنگێزە لەمەڕ کێشەو ململانێ نەژادییەکان لە ئاسیادا. ئورویل لە ساڵی ١٩٣٦دا کەوتە ڕۆژنامەنووسی،پاشان لە شەڕەناوخۆیەکانی ئەسپانیادا، لە ریزی لەشکری شۆڕشگێڕاندا بەشداری کردو بەسەختی زامدار بوو.کاتێ کە قەتڵ و عامی خەڵکی بە دەستی کۆمۆنیستەکان کە بەوپەڕی دکتاتۆریەت دەسەڵاتیان گرتبووە دەست ، بینی، زۆر نیگەران بوو.وبۆچوونی خۆی لە کتێبی : (بەیادی کاتالۆنیا- ١٩٣٨)دا دەربارەی سۆسیالیزم تۆمار کرد. لەوە بە دوواوە بیروباوەڕی ئورویل بە تەواوەتی لەق بوو.ئەو گۆڕانە ڕوحییە لە بەرهەمەکانی ئەم قۆناغەیدا ڕەنگی داوەتەوە، لەوانە: (مەزرای گیانلەبەران-١٩٤٥) ئەمە چیرۆکێکی خەیاڵی و ئیستیعاریی توندە دەربارەی دکتاتۆریەت.(هەزارو نۆسەدو هەشتاو چوار-١٩٤٩)کە نائومێدی نووسەرو خەونی خەمناك و پێشبینییەکی ترسناك لەمەڕ دیموکراسی ئایندە دەخاتە بەرچاو. ئورویل لە ساڵی ١٩٣٩دا کتێبی: (بەدووای هەوادا)ی بڵاوکردەوە کە پەیوەندییەکی نزیکی بە ژیانی واقیعی و گۆڕانی ڕوحی ئەو و ئەو قۆناغەی کە لە دەزگای ئاسایشدا کاری دەکرد ،هەیە. ( شێرو کەرگەدەن-١٩٤١) وتارێکە دەربارەی سۆسیالیزم و وەسفی وەڵاتی ئینگلتەرا لە قۆناغی کێشماکێشدا. (کیژی کەشیش-١٩٣٤) و (جادەی بەرەو بارەننازی ویگان-١٩٣٧)و..هتد. ئورویل لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا دەگەڵ ڕادیۆی بی بی سی و لە ١٩٤٣ بە دوواوە دەگەڵ ڕۆژنامانی کرێکاریی وەك تریبون و ئۆبزێرڤەردا هاوکاری کردووە. لە ساڵی ١٩٤٩وە بە تەواوەتی لە کۆمەڵگە دوور کەوتووەتەوەو کونجی تەنیایی گرت و لە ئەنجامدا بە نەخۆشی دەردەباریکە مرد. گوتارەکانی ئورویل بریتین لە : (گوتارێن ڕەخنەیی١٩٤٥) و(ئینگلتەرا، ئینگلتەرای ئێوە) کە لە ساڵی ١٩٥٣دا لە دوای مردنی بڵاوبووەوە. لە (ڕاوە فیل و چەند وتارێکی دیکەدا-١٩٥٠) ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن گوندییانی بیرمانی لاوێکی کارمەند

ناچاردەکەن بە کوشتنی فیلێك و لاوەکە دەکەوێتە ئەم بیرەی کە لەم قەتڵە خەمناکەدا چ ئەرکێکی قورسی لەسەر شان بووە.

ئورویل،وەکو خۆی دەڵێت لە کارەکەی خۆیدا، لە بیرمانی ، ئەگەرچی کارێکی گرینگ نەبووە، ئەزموونێکی فرەی بەدەست هێناوەو بۆ مەحکومکردنی شێوەی رژێمی کۆلۆنیالی سوودی لە بچووکترین خاڵ وەرگرتووە. بەلای ئوریلەوە ڕۆماننووس پسپۆڕو زانای زانستی ئەخلاقە، هەر لەو پێودانگەوە ڕێگەی سیاسی خۆی دۆزیوەتەوە، ڕێگەی یاخیبوونی لە زەبرو زەنگ و زوڵم و زۆری لایەنگرانی فرانکۆ و ستالین دۆزیوەتەوەو کەشفکردووە. هەڵوێستی ئورویل لە نێو نووسەرانی نەسلی خۆیدا بێ وێنە بووە. ئەو نەسلی خۆی هاندەدا کە لە سەرەتادا بە قووڵی بیر لە مەسەلەکان بکەنەوەو پاشان بکەونە ڕەخنەی سیاسی و ئەدەبی..

ئەوەندەی من ئاگادار بم تا ئیستا (مەزرای گیانلەبەران و هەزارو نۆسەدو هەشتاو چوار) ی لە لایەن چەند کەسێکی جیاوازی وەکو ڕێزداران: ئازاد مستەفاو محمەدشاکەلی و حەکیم کاکەوەیس و ئەدیب نادرەوە کراون بە کوردی.

## ١١- ئەستۆریاس، میگل ئە نخل

خـــەڵکی گواتیمالایـــە.لـــە نێـــوان ســـاڵانی ( ١٨٩٩-١٩٧٤)دا ژیـــاوە. ئەســـتۆریاس لـــە گواتیمالاسیتی، لـە بنەماڵەیـەکی بازرگانـدا لـە دایکبـووە. لقی مافناسـی زانکـۆی تـەواوکردووەو پلـەی دکتـۆرای وەرگرتـووە. لەسـاڵی ١٩٢٤دا سـەفەری لەنـدەن و پاشـان پاریسـی کـردو لـە زانستگەی سۆربۆندا، لە بەشی نەژادناسیدا درێژەی بە خوێندن داوەو لە بواری ئاینانی کۆنی ئەمریکای ناوەندیدا بووە بە پسپۆڕ. لە ساڵی ١٩٣٠دا لە شاری مەدرید کتێبی (ئەفسانانی گواتیمالا)ی بڵاو کردەوەو وەڵات و زاگەی خۆی لە میانەی ئەفسانانی منداڵییەوە بە خەڵکی ناساند. ئەم کتێبە لەگەڵ بڵاوبوونەوەیدا زۆر بە باشی دەنگی دایەوە. پۆل ڤالیری پێشەکی بۆ نووسیبوو. ئەستۆریاس دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٤ ڕۆمانی (ئاغای سەرکۆمار)ی نووسی کە بە شاکاری ئەو دێتە ژمارتن. ئەم رۆمانە ڕێگە نەدرا لە گواتیمالادا بڵاو ببێتەوە. ئەم ڕۆمانە وێنەیەکی زندووی حکومەتی (ئیسترادا کابریرا)ی سەرکۆمارە کە لە ساڵانی ١٨٩٨-١٩٢٠دا بە شێوەیەکی زۆر دکتاتۆریانە فەرمانڕەوایی وڵاتی گواتیمالای دەکرد. ئەستۆریاس لەم ڕۆمانەدا واقیعی ژیان بە شێوازێکی شاعیرانەو رەفتاری نامرۆڤانەی دام و دەزگای حکومەتی دەگەڵ ڕەش و ڕووتی کۆمەڵگەو زوڵم و زۆرو دڵڕەقی ونامەردی دەسەڵاتداران ودەستڕۆیان دەرهەق بە بێنەوایان ودابونەریتی جەماوەری خەڵکی گواتیمالا، زۆر بە جوانی دەردەبڕێت و بەرجەستە دەکات..ڕۆمانی (ئاغای سەرکۆمار) لە ساڵی ١٩٤٦دا لە مەکسیك و پاشان لە ئەرجەنتین و دواتر لە فەرەنسادا بە چاپ گەیی و لە ساڵی ١٩٥٢دا خەلاّتی باشترین ڕۆمانی بیانی وەرگرت و لەوە بە دواوە نووسەرەکەی ناوبانگی جیهانی دەرکرد. یەکێك لە کارەکانی دیکەی ئەستۆریاس چیرۆکی (پیاوانی گەنمە شامی)یە، ئەفسانانی خەیاڵئەنگێزی وڵاتەکەی لەگەڵ ژیانی جووتیاران لە نێو هەردو کێواندا ئاوێتە دەکات.جووتکاران کە گەنمە شامیان بەلاوە خۆراکێکی خوایی و پیرۆزە، بەر تاڵان و بڕۆی خەڵکانێك دەکەون کە گەنمەشامی تەنیا بە خۆراکێکی ئاسایی دەزانن کە دەکرێ سوودی لێوەربگیرێ. سەرەنجام جووتیاران دژی ئەم خەڵکە تالاّنچییە ڕادەپەڕن و لە جەنگەڵ و لێرەواراندا بەهۆی جادووگەرانەوە لە نێویان دەبەن.( پیاوانی گەنمەشامی) لێوان لێوە لە شیعرو شیعرییەتی نایاب و نائاسایی و وەسفێکی راستگۆیانە و ڕەنگینی دابونەریت و بیرو باوەڕی دەوڵەمەندو دڵگیری خەڵکی گواتیمالایە. ئەستۆریاس ساڵانێك سەرنووسەری یەکێك لە ڕۆژنامە ئەدەبییەکان بووە. لە ساڵی ١٩٤٢دا بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی نیشتمانی و لەوە بە دوواوە چەند پۆستێکی سیاسی وەرگرتووە. لەم قۆناغەدا کۆمەڵە چیرۆکێکی بڵاوکردەوە کە سێ چیرۆکی لەخۆگرتبوو بە ناوی: ( گەردەلوول، پاپای کەسك، وچاوانی نێژراوان) کە هەرسێکیان

بــه گــرنگترین بەرهــەمی ئــەو دەژمێــردرێن و لــەو چــیرۆکانەدا یــاخیبوونی جووتیــارن دژی مۆنۆپۆلیستان بەرجەسته کراوه. ئەستۆریاس له ساڵی ١٩٤٦دا پۆستی پاشکۆی رۆشنبیریی لـه سەفارەتی بەلچیك وەرگرت.پاشان به هەمان پۆست چووه ئەرجەنتین و فەرەنسا..لـه ئەرجەنتین چیرۆکی ( پشووەکانی گواتیمالا )ی لـه سـاڵی ١٩٥٦دا بلاو کـردەوه.. لـه سـاڵی ١٩٦١دا چیرۆکی (گۆلاوی گەدا) و لە ساڵی ١٩٦٣دا چیرۆکی (ژنی دووڕەگ)ی بلاو کردەوه که که هەردووکیانی له داب و نـەریت و خووخـدەی ولاتەکـەی خۆیـەوه هـەڵێنجاوه. لـه سـاڵی ١٩٦٦دا بـوو بـه سـەفیری وڵاتـی خـۆی لـه پـاریس، و خـەلاتی ئاشـتیی لینینـی وەرگـرت..ئەسـتۆریاس چەندین دیوانیشـی بلاوکردووەتەوه که له ڕووی خەیاڵپەروەری و گوزارشتی تایبەتییەوه به شیعرو بەرهەمی یەکجار جوان دێنه ژماردن.. یەکێك لەوانه دیـوانی: (دووشـەممەی پرشـنگداری بـەهار)ە. ئەسـتۆریاس لـه ساڵی ١٩٦٧دا خەلاتی نۆبلی ئەدەبیاتی وەرگرت و لـه سـاڵی ١٩٦٨دا لـه پـاریس پیشـانگایەکی لەمەڕ (هونـەری قـەومی مایـا) ڕێکخسـت..لـه سـاڵی ١٩٧٠دا دەسـتی لـه سـەفارەت کێشـایەوەو لـه هــەمان سـاڵدا بـۆ سـەرۆکایەتی ئەنجوومـەنی داوەرانـی فیسـتیڤاڵی کـان هەڵبـژێردرا. لـه سـاڵی ١٩٧٠دا چـیرۆکی (دەسـبڕی خوانـەناس)ی بـلاو کـردەوه.. ئەسـتۆریاس لـه نووسـیندا شـێوەی تایبـەتی خـۆی هەیـه کـه دەکـرێ نێـوی ( ریـالیزمی جـادوویی ) لێبنـرێ.. ڕەگـی خەیاڵپـەروەری بەرهەمـەکانی ئەسـتۆریاس دەچـێتەوه سـەر واقیعـی ڕۆژانـەی ولاتەکـەی ..بـیرو بـاوەڕی ئابـادو ئەژدادی و خورافاتپەروەری، باوەڕبوون به ئەفسوون و جادوو له لایەکەوەو هـەژاری و بێنـەوایی لـه لایـەکی تـرەوە، لـه باوەشـی جوانیی سروشـتی ناوچەی یەکسـاندا بـه قەڵەمێکی ئەفسوونکارو شاعیرانه خراوەته ڕوو..دووا ڕۆمانی ئەستۆریاس، بەر له مردنی به نێوی ( هەینی ژان) له ساڵی ١٩٧٢دا له بۆینس ئایرسدا بلاو بووەوه.. ئەستۆریاس چەندین وتـارو باسـی لـه پـاش بـەجێماوه لەوانه: مەسەله کۆمەڵایەتییەکان (١٩٢٣)، و ڕۆمانی ئەمڕۆ (١٩٦٣)..هتد.

## ١٢- ئەشیل (ئەخیلس) ،تایتۆس

چیرۆكنووسێكی سەدەی دووەمی زاینی یۆنانییە.تا ماوەیەكی زۆر واباوبووە كە ئەشیل لە ڕۆماننووسە هەرە كۆنەكانی یۆنانە. لێ پاشان لە میلان دەستنووسێك دۆزراوەتەوە كە بۆ ئاخرو ئۆخری سەدەی دووەم و سەرەتاكانی سەدەی سێیەمی زاینی گەڕاوەتەوەو ئەوەی ساغكردووەتەوە كە ئەشیل لە سەدەی دووەمی پاش زاین ژیاوە..ئەشیل لە ئەسكەندەریە هاتووەتە دنیا كە لە پێنجەمین بەشی چیرۆكە بەناوبانگەكەی خۆیدا باس و ستایشی كردووە.لە ئەسكەندەریەدا زانستەكانی وەخت و ڕۆژی خوێندووەو زانستی واتاناسی و ڕوونكاری، یاساكانی سەرف و نەحو، مێژوو و زانستانی خوێندووەو فێربووە. هەرچەندە لە بەرهەمەكانیدا هەندێ نیشانانی خوانەناسی بەدی دەكرێت، بەلاّم وەكو باوە چووەتە سەر ئاینی مەسیح و تەنانەت پلەو پایەی ئاینیشی وەرگرتووە.

بەرهەمەكانی ئەشیل بریتین لە زانستی ئیشتیقاق، مێژوو، وبەرهەمێكی گرینگ لە ئەستێرەناسیدا كە تەنیا هەندێ بەشی پەراگەندەی لێ ماوەتەوە. گرنگترین بەرهەمی ئەشیل ڕۆمانی (سەربهووردی ڤیانی لیوكیپە وكلیتۆفۆن)ە، ئەم ڕۆمانە دڵدارییە هەشت بەرگە..كلیتۆفۆن لاوێكی نۆزدە سالاّنە، ئاشقی (لیوكیپە)ی دۆتمامی خۆی بووە، كە دەژنەوێ كیژێ ناچارە مێرد بە پیاوێكی دیكە بكات، بە دووقۆڵی بۆ ئەسكەندەریە دەڕەڤن. جووتە دڵدار لە دەریادا گیرۆدەی چەرمەسەری یەك لە دووی یەك دەبن وەك: تۆفان، غەرقبوونی كەشتی، دزانی دەریایی و ئەوجۆرە شتانە.بەهەرحاڵ لە یەكدی دادەبڕێن و سەرەنجام پاش زنجیرە ڕووداو وبەسەرهاتێكی زۆر دژوارو ناخۆش كە نووسەر بە تێرو تەسەلی باسیان دەكات، بە یەكتر شادوشكور دەبنەوە..ئەم ڕۆمانە لەو ڕووەوە كە لایەنی سێكسی تێدا زاڵبووەو دەگەڵ دابونەریت و نەزاكەتی باوی ڕۆژدا تێكی نەكردووەتەوە بەر ڕەخنەو ئیرادی ڕەخنەگران كەوتووەو لە لایەكی تریشەوە لە ڕووی پاراوی زمان و ڕەوانی شێوازەوە جێگەی ستایش بووە.. بەهەحاڵ بابەتە پڕ سۆزو گودازو ئاشقێنییەكەی مایەی پەسندی جەماوەری خەڵك بووە و كاریگەرییەكی فرەی بەسەر هونەری ڕۆماننووسیی تازەی ئەوروپادا هەبووە...

## ١٣- ئەلكساندری، ڤاسیلی

شاعیرێکی ڕۆمانیاییە، لە ساڵانی (١٨٢١-١٨٩٠)دا ژیاوە. ئەلکساندری لە مۆلداڤیا، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند لە دایکبووە. لە ساڵی ١٨٤٥دا پاش ئەوەی کۆلیجی فەرەنسایی شاری یاسی ی تەواو کرد، بۆ درێژەدانی خوێندن روویکردە فەرەنسا.بەلاّم هیچ کارنامەو شادەتنامەیەکی وەرنەگرت..پاشان ماوەیەکی کەم لە ئیتاڵیا مایەوە. ژینگەی ئیتاڵیا بوو بە ئیلهامبەخشی هەوەڵین شیعرەکانی. کە بۆ ولاّتی خۆی گەڕایەوە بەڕێوەبەرایەتی شانۆی نەتەوەیی یاسی ی لە ئەستۆگرت. لەوێدا ئاشقی (ئیلینا نیگری)ی ئەکتەر بوو، ولە گەڵیدا بۆ ڤینیس و سیسیل رۆیی..ئیلینا لە ڕێگەدا مرد و ئەلکساندری زنجیرە شیعرێکی لیریکی و غەزەلی خۆی پێشکەش بەو کرد. ئەلکساندری پاشان بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە لە شۆرشی ساڵی ١٨٥٨ی ولاّتەکەیدا بەشداری کرد. پاش شکستی شۆڕش لە پاریس گیرسایەوەو لەگەڵ یەك دوو دۆستیا گۆڤاری (ئایندەی ڕۆمانیا)ی دامەزراند.. کە بۆ رۆمانیا گەرایەوە بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ئەدەبیاتی (رۆمانیا لیتیرارا)ی لە ساڵی ١٨٥٣دا لە ئەستۆگرت..لە ساڵی ١٨٥٥دا ولاّتی بەجێهێشت تا لە جەنگی قرمدا بەشداری بکات..لە پاریسدا یەکەمین دیوانی (بالاد)ی خۆی بە زمانی فەرەنسی بلاّوکردەوە.لە (مونپلیە)دا لە سۆنگەی بلاّوکردنەوەی (سترانی خەڵکی لاتین)دا تاجی فەخری درایەو شیعرەکەی لە لایەن (میسترال)ەوە پاجڤەی سەر زمانی پروڤانسی کرا..بایەخی راستەقینەی ئەلکساندری لە ئامادەکردن و بلاّوکردنەوەی ئەو زنجیرە سترانە میللی و شوانکارەییانەدایە کە تا ساڵی ١٨٧٥ لەسەر بلاّوکردنەوەیان بەردەوامبوو، کە ئاوازو گۆرانی ئەڤینداری ،هۆزانێن خەمبار، نیشتمانی یان ئەفسانەیی دڵگیرو جوانی میللی وعامیانەیە..یەکێك لە بەرهەمەکانی تری ئەلکساندری (ئەفسانانی هەمەرەنگ)ە کە لە ساڵانی ١٨٦٢-١٨٦٧دا بلاّو بووەوە.. دیارە ئەم بەرهەمە ڕەنگدانەوەی شکۆ وجوانی ئەوروپای رۆژهەلاّتییە..

ئەلکساندری لە بواری شانۆشدا هەندێ بەرهەمی بلاّوکردووەتەوە کە لە رووی کۆمەلاّیەتیەوە بە بەرهەمی بایەخدار دەژمێردرێن وەك: کۆمیدیای (نەجیمزادەو نۆکیسەکان) کە لەساڵی ١٨٧٤دا خرایە سەر شانۆ..ئەم کۆمیدیایە وێنەیەکی رەنگینی کۆمەڵگەی سەردەمی نووسەرە کە لەلایەکەوە نۆکیسەو تازەپیاوتووەکان، بە مەبەستی کامەرانی وبەرژەوەندی خۆیان، هەموو هەستێکی نیشتمانپەروەری، خانەوادەیی و شەرەفداری و ڕەسەن پایەماڵ دەکەن و لە لایەکی ترەوە نەجیمزادەو رەسەن و ئەسلّزادە هەوڵدەدەن کە دابو نەریت و کەلەپوری نەتەوەیی لە مەترسی لە نێوچوون رزگار بکەن ..زمانی شانۆنامەکەو هەردوو قارەمانی کۆمیدیاکە کە نوێنەری دوو دەستەی جیاوازن، یەکجار جوانە.شانۆنامەی (سەرچاوەی بلاندوزی) شانۆنامەیەکی شیعرییە لە سێ بەشدا کە لە ساڵی ١٨٨٤دا خراوەتە سەر شانۆ و سەرکەوتنێکی کەم وێنەی بە دەستهێناوە. ئەلکساندری لەم شانۆنامەیەدا ئیلهام و سەرۆی لە بابەتێکی کۆنی

کۆنەوە وەرگرتووەو ویستوویەتی بەم کارە ، خەڵکی رۆمانیا لە ئەسڵ و فەسڵی لاتنییان ئاگادار بکاتەوە، ئەوەیان وەبیر بخاتەوە کە ئەسڵیان لاتینییە.

ئەلکساندری کاریگەرییەکی تەواوی بەسەر ئەدەبیات و سیاسەتی وڵاتی خۆیەوە هەبووە.. ئەم سیاسەتوانە کە هەمیشە بۆ یەکێتیی و سەربەرزی وڵات لە خەباتدا بووەو لە ڕای ناساندنی وڵاتدا بەردەوام لە سەفەردا بووە. هەرگیز شیعرو شاعیری فەرامۆش نەکردووە.. بەیت و هۆنراوەو کۆمیدیا رەخنەییەکانی کاریگەرییەکی شایستەی کردووەتە سەر هاووڵاتیانی و وەکو نووسەرێك کە هەموو ژیانی خۆی وەقفی سەربەرزییە فەرمیەکانی وڵاتی خۆی کردووە، خۆی و بەرهەمەکانی هەمیشە لە دڵی جەماوەردا گەورەو بە نرخ بووە....

## ١٤- ئۆسترۆفسکی، نیکۆلای ئەلیکسیۆڤیچ
## Ostrouvskiy,Nikolay Alekseyevich

چیرۆکنووسێکی سۆڤیەتیە، لە سالآنی ١٩٠٤-١٩٣٦دا ژیاوە. لە خێزانێکی هەژارو دەسکورتی خەڵکی ئۆکرانیا هاتووەتە دنیا.منداڵیەتی بە شوانکارەیی بردووەتە سەر.لە تەمەنی یازدە ساڵیدا لە خوارنگەیەکی ویستگەی قیتاردا دەست بەکاربووە.رۆژی دە-دوانزە سەعاتان کاری دەکردوبەزۆری کاتی فراڤینی، لە کوشکی رۆژنامە فرۆشییەکەی ویستگەی قیتاردا بە خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤاران دەگوزەراند. لە تەمەنی پازدە ساڵیدا دەچێتە ریزی سوپای سوورو لە بەر ئازایەتی ودڵسۆزی خۆی دەبێتە مایەی ئافەرینی بەرپرسان ودامودەزگا فەرمییەکان. لە ساڵی ١٩٢٠دا لە شەڕی ناوخۆدا بە خەستی زامدار دەبێتوچارەسەروماڵیجەی یەك ساڵی رەبەق درێژە دەکێشێتوبینایی چاوی ڕاستی لە دەست دەداتوچاوی چەپیشی تەواو کز دەبێت.لە ساڵی ١٩٢٤دا بوو بە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستوهەموو وەختی خۆی بۆ بەشی لاوانی حیزب تەرخان کرد.لە کۆتایی هەمان ساڵدا ئیفلیجوزەمینگیر دەبیٚوبە ناچاری دەستبەرداری هەموو کاروچالاکییەك دەبێت. بەڵام رۆحی چەلەنگوزندووی ئەو سەر بۆ بێکاری دانانەویٚنیٚ،وئەوەبوو دەستی دایە رۆماننووسینوسەربهوردی خۆی خستە قاڵبی چیرۆکە کەوەو هەوەڵجار بە زنجیرە بڵاوی کردەوەو پاشان لە ساڵی ١٩٣٥دا لە ژێر سەرناڤی(پۆلاٚ چۆن ئاودرا) بڵاوبووەوە کە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا.چیرۆکەکە باسی واریقاتی ژیانی لاوێکی کۆمۆنیستی دەردەدارو چاوکزو پروش دەکات کە لە پێناوی سەرکەوتنی سۆسیالیزمدا تا رادەی گیان فیداکرن دەخەبتیٚ. ئەم چیرۆکە بۆ زۆربەی هەرە زۆری زمانە ئەوروپاییەکان پاچڤە کراوەو تا ساڵی ١٩٥٠شەش ملیۆن دانەی لێفرۆشراوە.ئوسترۆفسکی کە بەم سەرکەوتنە خۆشحاڵ بوو بوو، لە ساڵی ١٩٣٤دا دەستی بە نووسینی چیرۆکێکی دیکە کرد بە نێوی(فەرزەندی تۆفان) کە بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٩٣٧دابلاٚو بووەوە.ئەم چیرۆکە باسی ئەو رووداوانەیە کە لە ساڵآنی ١٩٢٠-١٩٢٣دا لە پۆلآندا دژی بۆڵشەویزم روویان داوە.قارەمانانی ڕۆمانی (فەرزەندی تۆفان) خەڵکانێکی ورەبەرزو گەشبینوفرە ئومێدوهێڤین ونموونەونوێنەری خەڵکی روسیای سۆڤییەتین.جا ئەم رۆمانە هەرچەندە بایەخی هونەری خۆی هەیە،بەڵام زیاتر لە رووی کۆمەلآیەتی وگونجانی دەگەڵ دەسەلآتی رژێمی کۆمۆنیزمدا سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو زەمینەیەکی بە پیتی بۆ پەرەسەندنوگەشەکردنی رۆماننووسی لە روسیای سۆڤییەتیدا خۆشکرد.کۆمیتەی ئەدەبیی حیزبی کۆمۆنیست کە زۆر دڵبەندی تازەیی بۆچوونەکانی ئۆسترۆفسکی بوو بوو، لێبڕا کە بایەخی زیاتری بداتیٚویارمەتی بدات کە بەرگی دووەمی ڕۆمانی ناڤبری تەواوبکات.بەڵام تەمەن مەودای نەداو رۆمانەکە بە نیوەچڵی وناتەواوی مایەوە..

مەخابن تا ئیستا هیچ بەرهەمێکی ئەم نووسەرە نەکراوە بە کوردی..کە بەڕاستی رۆمانی (چگونه فولاد ابدیده شد) شایستەی وەرگێڕانە..

## ١٥- ئۆتوی، تۆماس Otwey,Thomas
(١٦٥٢-١٦٨٥)

شانۆنامەنووسێكی ئینگلیزە،لە بنەماڵەیەكی ئاینی بووە.هەوەڵجار لە كۆلیجی وینچستەر دەستی بە خوێندن كردووەوپاشان چووەتە كۆلیژی ئاینیی ئۆكسفۆرد.پاش مردنی بابی لە ساڵی ١٦٧٢دا، بێ ئەوەی شادەتنامەی زانسگایی بە دەست بێنێ دەسبەرداری خوێندن بوو وبۆ لەندەن ڕۆیی.لە لەندەن دەستی دایە كاری نواندن لە شانۆدا.هەرچەندە لە كارەكەیدا سەركەوتوو نەبوو،لێ ئەزموونێكی زۆری بۆ نووسینی بەرهەمە شانۆییەكانی بەدەست هێنا. یەكەمین تراژیدیای ئۆتوی بە نێوی(ئەلكیبیادس-alcibiades ) لە ساڵی ١٦٧٥دا سەركەوتووانە خرایە سەر شانۆو بووە مایەی ئەوەی كە ئاشقی خاتوو باری ی ئەكتەری شانۆنامەكە ببێ.

ئەوجا تراجیدیای شیعریی(دۆن كارلۆس-Doncarlos ) لە ساڵی ١٦٧٦دانمایش كراو سەركەوتنێكی زۆر باشی بە دەست هێنا:شا لەگەڵ ئیلیزابت دی فرانس دا زەماوەند دەكات، بەلاّم گومان لە هاوسەرە گەنجەكەیو دۆن كارلۆسی كوڕی خۆی دەكاتو بە خیانەت تۆمەتباریان دەكات.ئاگری ئەم دڵپیسییە كە لە لایەن هەندێ لە دەرباریانەوە خۆشدەكرێ، دەبێتە باعیسی كوشتنی ئیلیزابتی نازدارو كوڕە لاوەكەی خۆی، لێ پاشای تۆڵە ئەستێن هەركە پەی بە بێگوناحی ئەو جووتە دەبات، لە بەردەم جەستەی ژنە گەنجەكەیدا بە چۆكدا دێو دەست بە گلەیی لە دڵپیسی خۆیو هاندانو تێزە تێزەی دەرباریەكانی دەكات. ئەم تراجیدیایە كە لاوازی بەشەرو ئەنجامو ئاكامی شوومی خانەگومانی نیشان دەدات، زۆرجار لەگەڵ ئۆتیلۆی شەكسپیردا دێتە بەراوردكردنو بە هاوتای ئەو دادەنرێ.ئۆتوی پاشان هەندێ شتی لە بەرهەمەكانی مولیرو ڕاسینەوە وەرگرتو لە ساڵی ١٦٧٨دا كۆمیدیایەكی زۆر جوانودڵگیری بە نێوی (دۆستایەتی بە پێی مۆدی ڕۆژ) پێشكەش كرد. لە هەمان ساڵدا بە مەبەستی دووركەوتنەوە لە خاتوو باری كە بووبوو بە ماشقەی ڕۆچیستر، لەگەڵ لەشكری سوپاییدا بۆ هۆڵەندا ڕۆیی. زۆری نەبرد بۆ وڵات گەڕایەوەو دەستی بە كاری شانۆیی كردەوە.

شانۆنامەی (هەتیو)ی كە بە شیعری ئازادەو لە ساڵی ١٦٨٠دا پێشكەشكرا، لە بەرهەمە هەرە بە نێوبانگو پڕبایەخەكانی شاعیرە.بابەتی شانۆنامەكە بریتییە لەوەی كە دوو برا ئاشقی كیژێكی هەتیو دەبن كە لە ماڵی ئەواندا دەژی.ئیدی ڕووداوە خەمناكەكانی ناو ئەم شانۆنامەیە دەبێتە هۆی ئەوە كە ئەم دوو برایە یەكدی بكوژنو كیژەكەش ژەهرخوارد دەكرێ.ئەم بەرهەمە بە تەواوەتی لایەنی خەمناكی بەرهەمەكانی ئۆتوی كە تەژی هەستوسۆزی ناسكن، دەردەخا.كۆمیدیای(بەختی سەرباز) لە ساڵی ١٦٨١داو باشترین تراجیدیای ئۆتوی بە نێوی(ڕزگاربوونی ڤینیس) لە ساڵی ١٨٦٢دا لە پێنج پەردەداو لە قاڵبی شیعری ئازادا پێشكەش كران. (ڕزگاربوونی ڤینیس) كە بەشاكاری ئۆتوی دەژمێردرێت، سەركەوتنی گەورەی بە دەست هێناو لە پاش بەرهەمەكانی شەكسپیر پتر لە هەر بەرهەمێكی شانۆیی دی لە هەرتك سەدەی

هەڤدەو هەژدەیەمدا لەسەر شانۆیان مایەوەو نمایش کرا.ئۆتوی لەم بەرهەمەدا نموونەیەکی تەواوی هەستی خەمناکی خۆی بەرجەستە دەکاتو والتەر سکۆت گوتەنی بۆ کچە قارەمانی ئەم شانۆنامەیە پتر لە قارەمانانی بەرهەمەکانی شەکسپیری وەك جولیتو دیزدەمۆنا فرمێسك هاتووەتە ڕشتن. ئۆتوی لە ساڵی ١٦٨٠دا بوو بە لەلەو سەرپەرشتیاری کیژی چارلزی دووەمی پاشای ئینگلتەرا کە دوای ساڵێك ئەم کارەی لە دەست داو ساڵانی ئاخروئۆخری تەمەنی بە هەژاریو دەستکورتی رابواردو سەرەنجام بە هەژاریو برسیەتی لە میوانخانەیەکدا کۆچی دوایی کرد.ئۆتوی شاعیرێکی یەکجار پڕ بەهرەو تەبیعەت ناسكو تا رادەی شێتی هەستیار بوو...(سکالای شاعیر لە خواوەندی شیعر) بە ناوبانگترین بەیتی شاعیرە. لە ساڵی ١٩٣٢دا کۆبەرهەمی شاعیر بلاوکرایەوە.

ڤۆڵتیر دەربارەی ئۆتوی دەڵێت: "ئەگەر شەکسپیر لە کورنی بە گەورەتر دەزانریٚ، ئەوا دەبیٚ دان بەوەدا بنەین کە راسین بە بەراورد لەگەڵ ئۆتوی دا، لەگەڵ ئەم شاعیرە ناسك تەبعو شیرین زمانەدا، هیچ نموودو رەونەقێکی نەبووە، بۆ سەلماندنی ئەم خاڵەش ئەوە بەسە کە چاوێك بە تراجیدیا بچووكو جوانەکەیدا، بە (هەتیو)دا بخشێنین.".

## ١٦- ئادام، پول ( Adam,paul )

یەکێکــە لــە چیرۆکنووســەکانی فەرەنســا. لــە ســاڵانی(١٨٦٢- ١٩٢٠)دا ژیــاوە. لــە پــاریس هاتووەتە دنیایە.لە تەمەنی بیست ساڵیدا یەکەم رۆمانی بە ناونیشانی (گۆشتی نەرمە) بڵاو کردووەتەوە. ئەم رۆمانە بووە مایەی ئەوەی شکاتی لێبکریٚ‌و بدرێتە دادگا، بەڵام لە دادگادا هیچی لەسەر نەبوو بە ماڵ‌و تەبریٚ بوو.ئەم رۆمانە بە شێوازی ناتورالیزم‌و بە چاولێکەری ئەمیل زۆلا نووسراوە. لە ساڵی ١٨٨٦دا دووەمین ڕۆمانی ئادام بە ناونیشانی (خۆت) بڵاوبووەوە. ئەم رۆمانە شیکردنەوەیەکی دەروونیە دەربارەی زەوجینی نەگونجاو،وزیاتر لە قوتابخانەو رێبازی سەمبولیزمەوە نزیکە.ئادام پاشان لە ساڵی ١٨٨٦دا بە هاوکاری دەگەڵ (مۆراس)دا کۆمەڵە چیرۆکی (چای لە ماڵی میراندا) بڵاوکردەوە.ئیدی لەوە بەدواوە بەگەڵ بزوتنەوەی سەمبولیزم کەوت. لە رۆژنامەو گۆڤارە پێشڕەوەکانی ئەم بزووتنەوەیەدا دەست بەکار بوو.(پول ئادام) کە خووی دابووە کونج‌و کەلەبەرە نهێنییەکانی رۆح، لە ساڵی ١٨٩١دا ئەزموونەکانی خۆی لە دوو توێی کتێبێکدا بە ناوی (بوون)خستە روو.ئیدی لەوە بەدواوە چالاکییە ئەدەبییەکانی کەوتنە زیادی وپەیتا پەیتا بەرهەمی بڵاو دەکردەوە، لەوانە: (جبەی سوور-١٨٩١) دەربارەی حوکمڕانانی شارانە.(رازی خەڵکان-١٨٩٥)دەربارەی پرسە ئاڵۆزەکانی کۆمەڵگەیە.(بازیل‌وسۆفیا-١٨٩٩)کە سێبەرو کاریگەری چیرۆکی (سالامبۆ)ی ڤۆلتێری پێوە دەبینریٚ.(پول ئادام) پاش چەندین ئەزموونی جۆراوجۆر لە دنیای رۆماننووسیندا، لە ئەنجامدا رێگەی خۆی دۆزییەوەو زنجیرە رۆمانێکی حەماسی گەورەی لە ژێر سەرناڤی (زەمان‌وژیان)دا بڵاوکردەوە کە ئەم چیرۆکانەی لە خۆ گرتبوو: (دەسەڵات-١٨٩٩)کە بریتیە لە سەربهوردی داستانی ماڵباتی هیریکورت لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی یەکەمدا، کە لە راستیدا سەربوری ماڵباتی خودی نووسەرە.(پول ئادام)لەم بەرهەمەدا هێزو دەسەڵاتی پەنهان‌و لە بن نەهاتووی نەژادی دەخاتە روو. ئەم رۆمانە بە پێچەوانەی بەرهەمەکانی دیکەی نووسەر، دوورە لە هەر کاریگەرییەکی ئاڵۆزوبە تەمتومانی رێبازی سەمبولیزم،وبە جۆرە تازەگەرییەك لە رۆمانی مێژووییدا دەژمێردریٚ کە شیکردنەوەیەکی قوڵی سایکۆلۆجی ئاوێتە بە رووداوە سیاسی‌وسوپاییەکان دەکات.(فەرزەنی ئوسترلیتزا-١٩٠١)ئەمە وەسفێکی تیرو تەسەلی سەردەمی ناپلێونە کە ئاوێتەی نۆڕینێکی فەلسەفی کراوە،رووداوەکانی ئەم چیرۆکە لە ژینگەی پڕ جم‌وجوڵی زەمانی جەنگدا روو دەدەن.(فریو-١٩٠٣) کە هەڵکشان‌وداکشانی بەردەوامی رۆحێك لە نێوان ئارەزووی قارەمانییەتی، هەستی ترس‌ودڵەڕاوکیٚ،ئازادی لە سیاسەت، ژیانی ئاسودەو ئارام،راستگۆیی‌و پاکی‌وبیگەردی قۆناغی گەنجایەتی‌و دەسیسەو پیلانی کۆمەڵگەی ئاینی،بە قەڵەم‌وئینشایەکی زۆر دڵگیرو پەسند وەسف دەکات. (لە بەر هەتاوی مانگی تەمموز-١٩٠٣)دوا چیرۆکی زنجیرە رۆمانە گەورەکەی پول ئادامە کە گەلەك لەو رووداوانەی بەسەر

قارەمانـانی چـیرۆکەکەو بەسـەر فەرەنسـادا دێـن هونەرمەندانـە دەگێڕێتـەوە.ئـادام بـە زەبـری شیکردنەوەی قوڵی دەروونـی ژیان‌وبـەردەوامی بـە قارەمانـانی بێشـوماری ڕۆمانـە حەماسیەکەی خـۆی دەبەخشـێت‌و لـە قۆنـاغی لاویانـەوە تـا قۆنـاغی کامـڵ بـوون‌و پیربوونیـان دەسـبەرداریان نابێ.دیارە ئەم ڕۆمانە لە مێژووی ژیانی پول ئادامدا بە خاڵێکی گرینگ دەژمێردرێت...پول ئادام زۆر نووسینی هەمەجۆری دیکەشی هەیە وەکو بیرەوەری‌و گەشت،نووسینی ڕەخنەیی‌و گوتارێن ڕەنگاو ڕەنگ،کۆی بەرهەمەکانی دەگاتە شەست بەرگێك کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا تەنیا ژمارەیەکی کەمیان دەخوێنرێنەوەو خوێنەریان هەیە..

## ١٧- ( ئەراگۆن، لویس-Aragon,louis )

یەكێكە لە شاعیرو رۆماننووسە بە ناوبانگەكانی فەرەنسا. لە ساڵانی (١٨٩٧- ١٩٨٢)دا ژیاوە.لە پاریس و لە بنەماڵەیەكی ناوەنجیحاڵ هاتووەتە دنیایە.منداڵێكی زیتەڵ و بە هۆش و گۆش گوساخ بوو. هەر ئەم زیتەڵەیی و گوساخییەی بەرەو راپەڕینی پڕ هەراوهوریای دادائیزمی بكێش كرد..دادئیزم زادەو بەرەنجامی نائومێدی و پەشێوی و یاشاگەردانیەكانی زادەی جەنگی جیهانی یەكەم بوو. ئەراگۆن لە دووای شكستی دادائیزم بوو بە یەكێك لە دامەزرێنەرانی رێبازو قوتابخانەی سورریالیزم. ئەم قوتابخانەیە بە شێوەیەكی فەرمی لە ساڵی ١٩٢٣دا دامەزراو مانیفێستەكەی لە ساڵی ١٩٢٤دا بلاّو بووەوە. قوتابخانەی سورریالیزم لەسەر بناغەی دەركەوتنی ناخودئاگاو نووسینی خۆبەخۆیی و پابەند نەبوون بە داب و نەریت و كۆت و بەندی ئەخلاقی و ئەستاتیكی دامەزرابوو.ئەراگۆن لە ساڵی ١٩٢٤دا كتێبی (شەپۆلە خەونان)ی بلاّو كردەوە كە لەوێدا كەوتبووە عەوداڵی شتە غەریب وعەجیبەكان و لە هەموو داب و نەریتێكی باو لایدابوو.كتێبی (جووتیاری پاریسی- ١٩٢٦) راپۆرێكە دەربارەی دوو دیمەنی شار: یەكێكیان گەڕەكی كۆنی (ئۆپرا)وئەویتریان (بوت شومون) كە وەسفی دیمەنانی ئەم دوو گەڕەكە لە جیهانی تۆسن و هەوسارپچڕیووی خەیاڵەوە هەڵقولاّوە.قەڵەمی بە هێزی ئەراگۆن رەنگێكی تازەی بە هەموو دیەمەنەكان بەخشیوەو واقیعیەتێكی بالاّتر لە واقیعی ئاسایی پێ بە خشیون.لە ساڵی ١٩٢٨دا نامەیەكی دەربارەی (شێوەی نووسین)بلاّوكردەوە..دەنگ و تۆنی ئەراگۆن لە بەرهەمەكانی ئەم قۆناغەیدا دلێرانەترو تەنزئامێزترە لە جاران و سەبارەت بە كاروباری واقیعی ژیان یاخییانەترە..ئەو شتانەی بە شێوەی ئەقلاّنی و ئەخلاقی نووسراوە، لە بەرهەمەكانی ئەم قۆناغەدا بەر هێرشی توندی ئەراگۆن دراوە.ئەراگۆن لە ساڵی ١٩٣٠دا سەفەرێكی سۆڤییەتی كرد تا لە كۆنگرەی نووسەراندا، لە شاری خاركۆف، بەشداری بكات.لە گەڕانەوەیدا بۆ پاریس بەوپەڕی ڕاشكاوی لایەنگری خۆی لە كۆمۆنیزم راگەیان و هاتە سەر ئەو باوەڕەی كە هەر هەوڵێك بۆ گۆڕینی میتۆدو رێچكەی ژیان تەنیا لە رێگەی كۆمۆنیزمەوە دێتە دی.لە دووای ئەوە ئیدی لە هەڤاڵانی سورریالیستی خۆی دابڕا. لە هۆزانی (هورالورال!) كەوتە ستایشی سۆڤیەت.شێوازی سورریالیستی شیعرەكانی ئەراگۆن لە دیوانی: (ئاگری شادی-١٩١٩)و(راپەڕینی بەردەوام-١٩٢١-١٩٢٤)دا بەرجەستەو دیارە..لە ساڵی ١٩٣٤دا (زەنگەكانی شاری بال)ی بلاّوكردەوە. لە ساڵی ١٩٣٦دا رۆمانی(گەڕەكە جوانەكان)ی بلاّوكردەوە، كە لەم رۆمانەیاندا وێنەیەكی ژیانی شاری پاریسی گرتووە. ئەراگۆن لەم بەرهەمانەیدا كە دژایەتی سیاسەتی فەرەنسای بەر لە جەنگی جیهانی یەكەمی كردووە،بە چاویلكەی باوەڕی ماركسیستی تەمەشای هەموو شتێكی كردووە،باسی گەندەڵی چینی سەرمایەداری كردووەو چارەنووسی تاكی بە ملكەچی رووداوە خەمناكەكانی مێژوو زانیوە. چیرۆكی ( رێبوارانی گالیسكە-١٩٤٢) هەندێ بیرەوەریانی

سـەردەمی منداڵیـەتی ئـەراگۆنی لـەخۆ گرتـووە.لەسـەرەمی داگیرکردنـی فەرەنسـا لـە لایـەن هیتلەرەوە، هەستی نیشتمانپەروەری لای ئەراگۆن جێی هەموو شتێکی تری گرتەوەو پەیوەندی بـە بزووتنـەوەی بەرگرییـەوە کـردو دەسـتی دایـە خـەباتی نهێنـی. لـەوە بـە دوواوە هۆزانـە سوورریالیستییەکانی ئەراگۆن لە هونەری نەوکلاسیك نزیك بووەوەو کەوتە بایەخدان بە قافیەو نێوەرۆك‌وشێوەو گەڕایەوە بۆ سەرچاوەکانی هۆزانێن ئاسایی‌و باوی سەدەکانی ناڤین‌و شیعرێن جەماوەری. شیعری (دڵشکاو-١٩٤١)هەندێ جار هەستی دەروونی ئەووهەندێ جار ئازارو نائومێدی هاوبەشی مرۆڤانی وکۆمەڵایەتی‌و نیشتمانپەروەری دەردەبڕن.شیعرە نیشتمانییەکانی ئەراگۆن بە ناونیشانی:(موزەخانەی گیرڤن‌ودیانی فەرەنساوی) لە نێوان ساڵانی ١٩٤٢و١٩٤٤دا پەیامێکی پەنامەکی بوو بۆ بزووتنەوەی بەرگری.پاش ئەوە ئەراگۆن زنجیرەیەك شیعری شێوە غـەزەلی بـە ناونیشـانی ئیلـزا تریـولی هاوسـەرییەوە بڵاوکـردەوە لەوانـە: (چـاوانی ئیلـزا-١٩٤٢، ئیلـزا-١٩٥٩، دێوانـەی ئیلـزا-١٩٦٣). بـوونی ئیلـزا لـە زۆر شـیعری دیکەشـدا سـەرۆو ئیلهامبەخشی ئەراگۆن بووە وەك: چاوان‌و بیرەوەری، قافڵەکانی من-١٩٥٤، رۆمانی ناتەواو-١٩٥٦،وشاعیران-١٩٦٠..ئەراگۆن لە ساڵانی ١٩٤٩-١٩٥١دا چەندین کتێبی بە ناونیشانی کۆمۆنیستان بڵاوکردووەتـەوەو لـە بەرهـەمێن ئـەم قۆناغـەدا گەڕاوەتـەوە بـۆ دنیـای واقیعـی‌و هاوبەشیەتی بەرژەوەندییە مرۆڤانییەکان، چ لە رووی هێڵە شۆڕشگێڕییەکەوەو چ لە رووی هزرین وسەرۆی ئاشقانەوە...هەڵبەتە بەرهەمە پەخشانییەکانی ئەراگۆن-ش زیاتر شەقڵی شیعرییان هەیە وەك (رۆمانی ناتەواو) کە جۆرە ئاوازێکی ئەڤینداریانەیە...

## ١٨- ئەلکسی، پۆل (Alexis,paul)

شانۆنامەنووس‌ورۆماننووسێکی فەرەنسییە،لە ساڵانی(١٨٤٧-١٩٠١)دا ژیاوە.پۆل ئەلکسی لە لاویدا لە فەرەنسا ئاکنجی بووە.دۆستایەتی وئاشنایەتی دەگەڵ! ئەمیل زۆلا پەیداکردووە.لە سەرەتاوە یەکێك بووە لە داکۆکیکارە سەرسەختەکانی ڕێبازوقوتابخانەی ناتورالیزمی ئەدەبی، یەکەمین کاری ئەدەبی کورتە چیرۆکێك بووە بە نێونیشانی (پاش جەنگ)کە لە زنجیرەی (چیرۆکێن شەوانی مدان)دا بلاّوبووەتەوە.قارەمانی چیرۆکی (پاش جەنگ) کەشیشێکی گەنجە کە لە شەڕدا زامدار دەبێت، لە ڕێگەی گەڕانەوەدا لە لایەن بێوەژنێکی چاوبەگریانەوە کە جەنازەی مێردەکەی بە عەرەبانەیەك بۆ زاگەی خۆی دەباتەوە،چاودێری و پەرستاری دەکرێت، بەدەم ڕێگەوە جۆرە هاوخەمی وهاودەردی و هەڤبەستەگییەکیان لە نێواندا پەیدا دەبێت کە سات بە سات جدیتر دەبێت و کار دەگاتە رادەیەك کە ژنەی تاین لە پاڵ جەنازەی مێردەکەیدا لە باوەشی کەشیشی زامدار دەخزێ. غەریبی بابەتەکە دەکاتە کارێك کە وەزع وحاڵەکە، لە حاڵەتی خەمباری و خەمناکی بێتە دەرێ وتوانا ودەسەلاّتی ئەلکسی لە گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا دەکاتە کارێك کە تایبەتمەندییە سایکلۆجی و ئەخلاقییەکانی هەردووك قارەمان فرە سادەو ئاسایی بنوێنێ. هەڵبەتە ئەم چیرۆکە (پاش جەنگ) نموونەیەکی زندووی ڕێبازو قوتابخانەی ئەدەبی ناتورالیزمە. ئەلکسی هەر لە هەمان ساڵدا رۆمانی (رۆژانە یاداشتەکانی مستەر مۆر)ی بلاّوکردەوە، پاشان رۆمانی (کۆتایی کاری لوسی پلگرن) کە شانۆنامەیەکی لێوە ئامادەکراو لە مانگی ١٨٨٨/٦دا خرایە سەر شانۆو نمایش کرا. لە ساڵی ١٨٨٥دا چیرۆکی (زەرورەتی ڤیان)ولە ساڵی ١٨٩٠دا (مەدام مۆریو)ی بلاّو کردەوە. ئەلکسی حەزی چووە شانۆو چەندین شانۆنامەشی نووسی، لەوانە: (ئەو کیژەی کەس نایخوازێ) لە هەیڤی ١٨٧٩/١١دا نمایش کرا. ئەلکسی کە قوتابییەکی پابەستەودڵبەستەی زۆلا بوو، لە ساڵی ١٨٨٢دا بەرهەمێکی جوانی دەربارەی بلاّوکردەوە بە نێونیشانی ( ئەمیل زۆلا،یادەوەری دۆستێك لەگەڵ شیعرە بلاّونەکراوەکانی زۆلا)دا

## ١٩- ئالمكويست،كارل جۆناس لۆڤ (Almquist,carl jonas love)

نووسەرو شاعیرێكی خەڵكی سویدە، لە ساڵانی (١٧٩٣-١٨٦٦)دا ژیاوە. لە دایكەوە سەر بە بنەماڵەیەكی ناسراوی خانەدانی سویدیە. خوێندنی بەرزی لە زانستگەی ئۆپسالا تەواو كردووە. پاشان لە دامودەزگا ئیدارییەكانی پایتەختدا دامەزراوەو كاری هەمجۆری كردووە. بەلاَم گیانی سەركێشی وی كە لایەنگری بیروباوەڕی جان جاك رۆسۆ بوو دەربارەی ژیانی ئازادانە وسادە لە ناوجەرگەی سروشتدا، كردیە كارێك كە لە ساڵی ١٨٢٣دا روو لە كۆمەڵگەی تەقلیدیوفەرمی پایتەخت، كە خۆی تیایدا بە زندانی دەزانی، وەربگێڕیێو لە ژینگەی ئازادی گوندەكاندا ئاكنجی ببیێ.لە گوندا كیژە گوندییەكی خواستوكەوتە كاری كشتوكاڵی. دوای ساڵێك لە ژیانی سەرەتایی و ئاسایی بێتاقەت بوو ورووپكردە ستۆكهۆڵم.لە پایتەختدا بە هۆی برادەرەكانییەوە لە كاری مامۆستایەتی دامەزرا.بەلاَم لە سۆنگەی بیروباوەڕی ئازادیخوازانەو بلاَوكردنەوەی چیرۆكی (ئەمە گونجاوە) لە ساڵی ١٨٤٠دا، كە چیرۆكێكی جەنجاڵ خوڵقێن بوو، دەسبەرداری كاری فێركاری ومامۆستایەتی بوو.ئالمكویست لەم چیرۆكەدا،كە یەكێكە لە چیرۆكە هەرە سەركەوتووەكانی هێرشی كردووەتە سەر زەوجینی قەراردادی ومەزەبیو بەرگرییەكی زۆری لە ژیانی ئازاد كە لە سەردەمو رۆژگاری ئەودا هێشتا جێی باس نەبووە، كردووە. لەوە بە دواوە ئالمكویست بیری لەوە كردەوە كە لە رێگەی نووسینەوە ژیانی خۆی بە ڕێوەبەریێ. ئیدی كاتی خۆی بۆ رۆژنامەوانی تەرخانكردو بوو بە یەكێك لە بەشداران وهاوكارانی بەرجەستەی رۆژنامەی ئازادیخواز ( ئافتون بلادیت-رۆژنامەی سەردەم). بەلاَم وەزعو حاڵی دارایی هەر شلۆق بوو،بە رادەیەك كە لە تاو سكالاَی خاوەن قەرزان سەری خۆی هەڵگرتو رەڤیو چوو بۆ ئەمریكا.ژیانێكی هەژارانەی گرتەبەرو لەوێ ژنی هێنا. لە ساڵی ١٨٦٥دابۆ ئەوروپا گەڕایەوەو لە ئەڵمانیادا، بیێ ئەوەی جارەكی دی ولاَتی خۆی بدینێتەوە، بە بێناوی سەری نایەوە. بەرهەمە زۆرو زەبەندەكانی ئالمكویست بایەخی جیاوازیان هەیەو خۆی لە خۆیدا ئەوە نیشان دەدەن كە لە زور بواری جیاوازی نووسیندا قەڵەمی جەڕباندووە. لە لایەكەوە هەواداری جان جاك رۆسۆیەو خۆی بە چاكسازی كۆمەلاَیەتی دەزانیێ، لە لایەكی ترەوە پەیرەوی بیرە عیرفانییەكانی سویدنبورگ دەكات، لە یەك كاتدا هەم نووسەرێكی پڕجۆشوخەیاڵپەروەرو رۆمانتیكە وهەم چیرۆكی ریالیستی هەیە. ئالمكویست هەموو بەرهەمەكانی خۆی لە كۆبەرهەمێكی گەورەدا لە ژێر سەرناڤی كتێبی نەستەرەن، لە سیازدە بەرگدا فەراهەم كردو لە نێوان ساڵانی (١٨٣٢-١٨٣٥و ساڵانی( ١٨٣٨-١٨٤٠)دا بلاَوكردەوە. پرۆژەی ئەو بەرهەمە لەو شەوانەدا دارێژراوە كە لە یانەو كۆشكی شكاری پایە بەرز هۆگۆ-Hugo دا كە پشتیوانی شیعرو ئەدەب بوو، دەژیاو لە كۆڕی نووسەرانو شاعیراندا بەشداری دەكردووەكو هەموو ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە چیرۆك

یان وتارەکانی خۆی دەخوێندەوە. یەکێك لە چیرۆکە هەرە بە نێوبانگەکانی کتێبی نەستەرەن، چیرۆکێکی مێژوویی درێژە بە نێوی (تاجی مەلیکە) لەم چیرۆکەدا، تاجی مەلیکە لە لایەن سەماکارێکی دڵڕفێنەوە دەدزرێ،کە خەسڵەتەکانی لە (ئەسمیراڵد)ی قارەمانی ڕۆمانەکەی ڤیکتۆر هۆگۆو(سرافیتا)ی قارەمانی ڕۆمانەکەی بالزاك دەچێت.کۆ بەرهەمی کتێبی نەستەرەن گەلێك شانۆنامەو نووسینی ڕەخنەیی و کۆمەڵایەتی و چیرۆکی شێوەنامەیی لە خۆ گرتووە وەك:رامیدوومارینسکۆ،ئارمینتامەی، قاسەوقەسر کە لەوێدا نکوڵی لە بایەخی سوێندو پەیمان دەکرێ،ئاش و سکالنورا،هەر وەها بەیت و قەسیدەی جوان و غەزەل و لیریکای وەکو (خەونان)ی لە خۆگرتووە کە سەرڕێژە لە جۆش و خرۆشی عارفانەو پڕ ئاهەنگ وریتمی مۆسیقایەکی گیان بزوێنە. هەڵبەتە ئەم بەرهەمە ڕەنگامەیە ڕەنگدانەوەی بۆچوون وباوەڕە سیاسی وفەلسەفیەکانی نووسەرە.

ئالمکویست، کەسایەتییەکی هەڤدژی هەیە. نووسەرێکە ڕۆمانتیك، ریالیست، هزرڤانێکە عارف و سۆفی، ریفۆرمکارێکی کۆمەڵایەتیە، یاخییەکی پڕجۆش وشاعیرێکە دەم وزار خۆش وبەهرەمەندە.

# 20 - ئانا كريون

ئانا كريـون، شـاعيری ليريكـی يونـانی، لـه دەوروبـەری سـاڵانی(٥٧٠-٤٨٥پ.ز) ژيـاوه. ئانـا كريـون لـه شـاری تيـوس-Teos،لـه كـەناری رۆژهـەڵاتی دەريـای ئيجـه هاتووەتـه دنيايـه. كـاتێ ئێرانييـەكان شـاری تيـوس و هـەموو شـارەكانی يونانيـان گـرت، ئانا كريـونی لا و كه بـه شـاعيری نێوبانگ وشۆرەتی دەركردبوو دەگەڵ كۆمەڵێكی ديكەدا سەری خۆی هەڵگرت وكۆچی كرد، بەڵام نەيتوانی له شاره تازەكەدا، كه شارێكی ئاسايی و بێ كەلتورو شارستانيەت بوو،ودەگـەڵ تـەبعی ناسـكی ئـەودا تێكيـان نـەدەكردەوه، هـەڵبكات و بمێنێتـەوه، بۆيـه دەعـوەت و بانگهێشـتنی پولۆكراتسی _ Polycrates كه حوكمرانی سامۆس-Samos ی دەكرد، قەبوڵكرد وماوەيـەكی لـه دەربـاری ئـەودا رابـوارد. ئانـا كريـون لـەم شـارەدا كـه ژيـان لـه نێـو ئاهـەنگ و فيسـتيڤالانی شـكۆداری بـێ وێنـەدا دەبوری، ژينگـەی دڵخـوازی خـۆی دۆزييـەوەو كەوتـه هۆنينـەوەی هۆزانـان دەربـارەی دەعـوەت و دەعوەتكـاری و ئاهـەنگ و لـەزەت و ڤيانـەكانی فـەرمانڕەوای سـامۆس و ئـەم هونەرەی ئاوێتەی ناسكييەكی شەهوەت ئەنگێز كرد. فەرمانڕەوای سامۆس جوامێرانه رەفتاری دەگـەڵ ئانـا كريـون دا دەكـرد و بـه دۆسـتی نزيكـی خـۆی نـاوی دەبـرد و پـاش ئـەوەی بـه دەسـتی سـەربازانی هەخامەنشـی كوژرا،شـاعير بـه ناچـاری دەعـوەتی هيپارخۆسـی-Hipparchus،كـه پشت و پەنای شاعيران بوو، قەبوڵكرد وچوو بۆ دەرباری ئەتينا. ئانا كريون لـه ئـەتينادا شـۆرەت و مەحەبـەتێكی فـرەی پەيـدا كـرد، بـه رادەيـەك كـه ماڵباتـه دەوڵەمەنـد وناودارەكانی ئـەتينا لـه دەعـوەتكردنی ئـەم ميوانـه خۆشەويسـتەدا پێشـبڕكێی يـەكيان دەكـرد و بـەمجۆره ئاشـنايەتی و ناسياوی دەگـەڵ نـاودارترين ماڵبـاتێن ئەتيناييـدا پەيـدا كـرد.پـاش ئـەوەی (هيپـارخۆس)ش بـه دەستی دژمنان كوژرا، ئەتينای به جێهێشت، ماوەيـەكی لـه تسـالی بەسـەر بـرد و بـوو بـه شـاعيری دەربـاری تـازه.زانيارييـەكی ئـەوتۆ لەمـەڕ دوا سـاڵەكانی تەمـەنی لـه دەسـتدا نييەوپێدەچێت بـۆ زاگەی خۆی گەڕابێتەوەو لەوێ مردبێ.

ئانـا كريـون، پێـنج كتێبـی شـيعری لـه پـاش بـه جێمـاوه كـه بـريتين لـه سـروودێن زەمـاوەن و داوەتـان، سـرودێن ئـاينی،و ئـاوازێن ڤيـانی كـه ئەمڕۆكـه جگـه لـه ئـاوازێن ڤيـانی و چـەند قەسيدەيەكی تری هيچيان نەماون، شاعير لەم شيعرانەدا به شێوەيەكی ناسك و روون و ڕەوان، له ميـانی زمـانێكی ئاهـەنگين و وەزنـدارا كەوتووەتـه باسـی ڤيـان و سەرمەسـتی وئارەزووه نەفسانی وشـەهوانييەكان ولەزەته رەوتەنی وبويـەره دڵگـيرو وەسـفی ماشـوقەكانی خـۆو داخ و كەسەر بۆ ناپايەداری ژيان دەخوات. شۆرەت و خۆشەويستی ئاناكريون چەندين سەدە له دوای مردنيشـی هـەر بـەردەوام بـوو. هـۆراس زۆربـەی شـيعرەكانی لەبـەر بـووەو لاسـايی كردوونەتـەوه.خـەڵكانێكی زۆر لاسايی شێوازو ستايلی تايبـەتی ئاناكريون-يان كردووەتـەوەو شـاعيرانی سـەرەتاكانی قۆنـاغی مەسـيحيەت هەنـدێ چامەيان بـه چاولێكەری ئـەو گوتـووه كـه جياكردنەوەيان له شيعرەكانی ئاناكريون ئەستەم بووه...

## ٢١- ئالن-فورنیه (Alain-fournier)

ئالن فورنیه ناوی خوازراوه، ناوی راستەقینەی (هنری–ئالن فورنیه– Henri-Alain fournier)

شاعیرو چیرۆکنووسێکی فەرەنسیه،لە سالآنی (١٨٨٦–١٩١٤)دا ژیاوه.ئالن فورنیه لە بنەماڵەیەکی دێهاتی بوو،لە سەرانسەری ژیانیدا لە کاریگەریی بیرەوەریانی منداڵی و زاگەی خۆی نەخەلەسی.بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن چوو بۆ پاریس تا خۆی بۆ بەشداری لە تاقیکردنەوەی داخڵ بوونی خوێندنی بالآ ئامادە بکات،لە کلاسە تەمهیدییەکاندا بوو کە ئاشنایەتی دەگەڵ جاك ریڤیردا– Jacquesriviereپەیدا کردو دۆستایەتیەکی راستگۆیانەیان لە نێوانا بەرقەرار بوو کە سەرباری جیاوازی زەوق و سەلیقەیان لێکدی، تا کۆتایی تەمەن بەردەوام بوو. دەشێت لە نامە دووروردرێژو بەردەوامەکانی نێوان ئەم جووتە دۆستەدا پەی بە بیرو بۆچوون وکەڵکەڵەو ئارەزووەکانیان ببرێ. ئالن –فورنیه پاش ئەوەی لە تاقیکردنەوەی خوێندنی بالآ دەرنەچوو ئیدی وازی لە خوێندن هێناو چووە خزمەتی سوپایی. پاشان کەوتە رۆژنامە نووسی..خوێندنی فەلسەفە لە کلاسە تەمهیدییەکانی خوێندنی بالآ لە لایەکەوە رۆحی سادەو گوندیانەی ئەوی بەرەو دنیای بێ کۆتایی کێشاولە لایەکی ترەوە بەرەو رێبازو قوتابخانەی سەمبولیزمی برد.لە ژێر کاریگەری (جول لاڤۆرگ – Jules Laforgue)دا کۆمەڵێك قەسیدەو چامەی نووسی کە پاش مەرگی، لە ساڵی ١٩٢٤دا لە دیوانێکدا بە نێونیشانی (موجیزات–mercles ) بلآو بوووە. جاك ریڤیر لە پێشەکی ئەم دیوانەدا کەسایەتی سەیری هاورێ شاعیرەکەی خۆی وەسف کردووە. شیعرەکانی دیوانی موجیزات بە زۆری حیکایەت و چیرۆکی حەساس و هەستیارن و رەنگدانەوەی دڵبەندی شاعیرن بە سروشت وژیانی سادەی دێهاتیانە، هەروەها هەوڵێکی تایبەتی شاعیرن بۆ ناساندنی دنیای پڕ رازو نهێنی خۆی بە زمان و دەربڕینێکی سادە. بە شێوەیەکی گشتی رەنگدانەوەی دڵ و دەروون و رۆحی ئەون،کە دنیای واقیعی لە رێگەی هەستە دەرونیەکانیەوە قەبوڵ دەکات. بە خۆی دەڵێت: "من حەزدەکەم سیمای واقیعی خۆم نیشان بدەم. دەخوازم لە گەرمەو جەنگەی ژیاندا سەیرترین لایەنی دەروونی خۆم کەشف بکەم...بەلآم جەنگی جیهانی یەکەم مەودای نەداو کۆتایی بە هەموو ئاواتەکانی هێناو ئالن–فورنیه کە لە ئەیلولی ساڵی ١٩١٤دا کوژرا،نەیتوانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی رۆمانی (مولنی مەزن) کە لە ساڵی ١٩١٣دا نووسی بووی بە چاوانی خۆی بدینێ. رۆمانی مولنی مەزن بە شاکاری ئەو دەژمێردرێ و پایەیەکی بەرزی بەدەست هێنا. لە رووی شێوەو فۆرمەوە زۆر رەوان و پوختەیە، لە رووی بونیادەوە چیرۆکێکی تەواوەو سەرڕێژە لە خەونی لاوێتی و ئارەزووی بەختەوەری رەهاو زەرورەتی دنیای رازو نهێنی و جیهانی ناواقیعی.ئەم بەرهەمە کە شەقڵی سەمبولیستی پێوەیە، بە جوانی ناکۆکییەکانی نێوان خەونانی بێ سنورو بێ پایان و سادەیی و راشکاوی دنیای بابەتی دەنوێنێ. قارەمانی رۆمانەکە ،ئۆگستین مۆلن کە سەربوری خەون ئامێزی دەگێڕدرێتەوە، لاوێکی دێهاتیە، شەیداو عەوداڵی شتی

نائاساییەوسـیمای خـودی نووسـەر عـەکس دەکاتـەوە کـە هەمیشـە زینـدانی دنیـای رازئـامێزی خۆیەتی..سێبەرو کاریگەری ئەم رۆمانە بەسـەر ئـەدەبیاتی مـۆدیرنی فەرەنسـاوە دیـارەو بـووە بـە هەوێنو ئامیانی زۆر رۆمانان.

## ٢٢- ئادام، جۆلیت لامبیر
## Adam,juliette lamber

خا جۆلیت، نووسەری فەرەنساوی (١٨٣٦-١٩٣٦) لە بنەماڵەی لامبیر، کە هەموو ئەندامانی شەیدای سیاسەت بوون، لە دایك بووە.لە لاویدا لایەنگری کۆما ریخوازەکان بوو ونووسینێکی فرەی لە بارەی سیاسەت وئازادیخوازی و بیروباوەڕی دژە کڵێسایی بڵاوکردەوە. لە ساڵی ١٨٦٠دا کتێبی (گوندەکەم)ی بڵاوکردەوە کە بریتی بوو لە وێنەیەکی سروشت وئاوێتەی هزری فەلسەفی کردبوو. پاش ئەوە (مانداران)ی لە ساڵی ١٨٦٢دا بڵاوکردەوە، دواتر چیرۆکی (ژنێکی دێهاتی) بڵاوکردەوە. جۆلیت لە ساڵی ١٨٧٧دا دەگەڵ سیناتۆری کۆماریخوازدا، ئادمۆن ئادام دا زەماوەندی کردو ماڵەکەی کرد بە بنکەی سیاسەتوانانی باڵی چەپ و ئەهلی ئەدەب کە بە یەکێك لە بنکەو ئەنجومەنە هەرە بە ناوبانگ ودەسەڵاتەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دەژمێردرا. لە ساڵی ١٨٧٩دا کۆڤاری نۆڤێلی دامەزران و نووسینە توێژینکاری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبییەکانی خۆی تێدا بڵاودەکردەوە. خاجۆلیت ئادام لە ساڵی ١٩١٩دا لە لایەن کلیمانسۆ، سەرەك وەزیرانی وەخت، ناسراو بە (بەوری فەرەنسا) دەعوەت کرا تا لە ئیمزای پەیماننامەی ئاشتی ڤێرسای دا ئامادەبێ وئەمە خۆی لە خۆیدا بە سەرکوتنێکی گەورە بۆ ئەو دەژمێردرا..خا جۆلیت بە هەموو سەرقڵییەکی سیاسییەوە ەرگیز دەستبەرداری چالاکی ئەدەبی نەبوو.. لە ساڵی ١٩٠٤دا کتێبێکی سێ بەرگی بە نێوی (بیرەوەرییەکانم) بڵاو کردەوە کە سەرچوەیەکی پڕبەها بوو دەربارەی بارودۆخی فەرەنسا لە مێژووی کۆماریی سێیەمدا.خا جۆلێت لە ساڵی ١٨٨٣دا کتێبی (ژنی وانەناسی)بڵاوکردەوەو بەمە ریسواییەکی گەورەی چێکرد، بەڵام دوای سی ساڵان لە ١٩١٣ (ژنی خواناسی) بڵاوکردەوە کە رەنگدانەوەی گۆڕانە رۆحی ودەرونییەکانی ئەو بوو سەبارەت بە ئەخلاق و ئاین و...

# ٢٣- ئارتۆ، ئانتۆنین

شاعیرو رۆژنامەنووسی فەرەنسیلە سالآنی ١٨٩٦-١٩٤٨دا ژیاوە. لە شاری مارسیل لە بابێکی فەرەنسیو داکێکی یۆنانی پەیدا بووە. خوێندنی لە کۆلیجی ساکری کور– sacre-coeur تەواوکردووە. هەر لە لاوییەوە حەزی لە شیعر کردووە. ئانتۆنین کە خودانی هزرێکی بە هێز بوو، لە شازدە سالّیدا باری دەروونی تێك چوو. لە مارسی سالّی ١٩١٤ لە خەستەخانە کەوتو لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لە خزمەتی سوپایی بەخشرا. پاش چاکبوونەوەی لە سالّ ١٩٢٠دا چوو بۆ پاریس.سەرەتا لە گۆڤاری (سبەی)دا دەست بەکار بوو، لە سالّی ١٩٢٣دا بژاردەیەکی لە شیعرەکانی بلأوکردەوەو سالّی دەاتر یەکەمین دیوانی بە نێونیشانی (نەردی ئاسمان) بلأو کردەوە.پاش ئەوەی ئاشنایەتی دەگەلّ ئاندریّ بریتۆن دا پەیداکرد، پەیوەندی بە بزووتنەوەی سورریالیزمەوە کردو لە گۆڤارە بە ناوبانگەکەی (ریڤۆلیوشن سورریالیست)دا کەوتە هاوکاری بریتون. لە سالّی ١٩٢٥دا دیوانێکی بە ناوی ( چەقی بازنەکان) بلأوکردەوە کە بریتی بوو لە پێنج پارچە شیعرو پەخشان، کە لە قولأیی ئازارو دەردە دەروونییەکانیەوە هەلّقولأ بوو. ڤیتراك – دەربارەی ئەم دیوانە دەلّێت: "هەرگیز هیچ جۆرە گوزارشتێکی هزری تا ئەم رادەیە بە لوتکەی خۆی نەگەییوەو هەرگیز بەدەنو جەستەی بەشەر بەم رادەیە نەچووەتە بنجو بناوانی هەرە قولّی زەینەوە." ئانتۆنین بە خویشی دەلّێت: "من نیگەرانی ئەم بابەتەم کە نەبادا لە ژیانا رۆح نەبیّو لە رۆحا ژیان."شیعرە جیاوازەکانی ئەم دیوانە کەسایەتی ورۆحی ئارتۆ بە تۆنو ئاوازی جیاواز نیشان دەدات. دوو بەرهەمی دیکەی بەناونیشانی( عەسەب پێو–١٩٢٧)و (نامە بۆ جاك ریڤەر– ١٩٢٧)کە ئارتۆر پەریشانی دەروونی خۆی تیایاندا نیشان داوە، هێندەی دی ناوبانگیان لە نێو خەلّکیدا پیّ بەخشی..ئارتۆر لە سالّی ١٩٢٨دا پەیوەندی دەگەلّ سورریالیستەکاندا بڕی. ئەو شەی ە شێوەی نووسەرانی ریالیستدا پێیستی بە مەشقو ئارامی رۆح بوو، ئەوەی دەبوە مایەی یاخی بوونی ئادەمیزاد لە دابو نەریتانی باو، لەلای ئاتۆر شتێکی زۆر سروشتیوئاسایی بوو. حالّی بەدەنیو دەروونی ئەو کە پەیوەندی بە نائاگاییەوە هەبوو و هەندیّ جار دەیگەیاندە الّی شێتی زیاتر پەیوەندی بە هزری خۆیەوە هەبوو تا بە مەشقوپرۆڤەی تایبەتیی دەرونیورۆحیو هزری سورریالیزم.

ئارتۆر لە راستیدا حاّەتی رۆحیی نەخۆشی خۆی تۆمار دەکردو هەموو هەولّو خەمێکی لە پێناوی دەرککردنی دروستی ئەم نەخۆشییەدا بوو.ئارتۆر لە سالّی ١٩٢٢دا لە پێناوی گوزەرانو ژیاندا پەیوەندی کرد بە گروپی ئەکتەرانی شانۆوەو لەم بوارەدا توانایەکی فرەی نواند و تا سالّی ١٩٣٥لەسەر ئەم پیشەیە بەردەوام بوو ودەگەلّ دەرهێنەرانی میناکی لویس جۆڤیتو پیتیوف دا کاری کردو هونەری شانۆ رێگەی بۆ خۆشکرد کە خۆی لە جیهانی سینەماشدا تاقی

بکاتەوە. لە شانۆنامەی ناپلیۆن، نووسینی ئابل گانس،دەوری (مارا)ی بینی کە بەناوبانگترین کەسایەتی شانۆنامەکە بوو. پاش ئەوە بە هاوکاری ڤیتراك لە ساڵی ١٩٢٦دا شانۆی ئالفریدجاری دامەزراند کە لەوێدا لە نواندنی چەندین شانۆنامەدا بەشداری کرد..ئارتۆر دەیویست لە ڕێگەی بەکارهێنانی جادووەوە سیماو وێنەیەکی نمایشی هونەری ڕۆژهەڵاتی دوور بە شانۆی فەرەنسی ببەخشێتوئەزموونانی ترسناك لە زەینی خڵکیدا بەرجەستە بکات، شانۆ وەکو کارەساتو نسیبەتێکی گەورە نیشان بداتو وێنەیەکی زاهیریو بەدەنی بەو هەستانە بدات کە پێویستە شانۆ بە خەڵکی بدات..جا بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە خۆی لە ساڵی ١٩٣٥دا تراژیدیای (خانەوادەی سنسی)کە لە شانۆنامەیەکی شلیو ستندالەوە وەرگیرابوو، خستە سەر شانۆو نمیشی کرد. ئەم شانۆنامەیە کە تەژی ڕۆحی ئەهریمەنی بوو، زۆر خراپ شکست هێناو بووە مایەی ئەمە کە ئارتۆر بە یەکجارەکی دەست لە شانۆ هەڵگرێ. پاشان لە ساڵی ١٩٣٦دا دوای ئەوەی لە کەلتوری ڕۆژاوا نائومێد بوو چوو بۆ مەکسیك، ماوەیەکی لە نێو تیرە ناوچەییەکانی ئەوێندەر رابواردو بە بۆنەی حاڵی نالەباری دەرونییەوە چوو بۆ ئینگلتەرا.لە گەڕانەوەدا لە نێو کەشتیدا دووچاری حەملەیەکی سەختی شێتی بوو، برایە شێتخانەو قۆناغێکی مالیجەی ناخۆشو پڕ ئازاری لەوێ قەتاند. ئارتۆر کە سەانسەری قۆناغی داگیرکردنی فەرەنسای لە لایەن ئەڵمانەوە لە شێتخانە بەسەر بردبوو، پاش چاك بوونەوەو گەڕانەوە بۆ پاریس لە کوتوپڕێکا خۆی وەکو پیاوێکی ناودار بینییەوە. لە راستیا پاش ئەو قەیرانە ڕۆحیو دەروونییەی ساڵی ١٩٣٧، بەرهەمەکانی ئارتۆر لە لایەن دۆستەکانییەوە بلأوکرانەوەونووسینە شانۆییەکانی بە ناونیشانی (شانۆو...)بلأوکرانەوە کە بەرهەمێکی سەرکەوتوو بوو.لە ساڵی ١٩٤٦دا (نامەکانی رۆدن)ی بلأو بووەوەو هێندەی دی ناوو شۆرەتی بە ئارتۆر بەخشی وکاتێ خۆی لە باوەشی مەحەبەتو خۆشەویستی دۆستەکانیا بینی، جۆرە سوکناییوئارامییەکی بۆ هاتو کەوتە بلأوکردنەوەی زنجیرە بەرهەمێکی نیمچە ورێنەئامێز کە گرینگترینیان (ڤان گۆك یان کوشتەی کۆمەڵگە) بوو لە ساڵی ١٩٤٧دا بلأو بووەوە. کۆبەرهەمی ئارتۆر لە حەوت بەرگدا لە ساڵانی ١٩٥٦-١٩٦٧دا بلأو بووەتەوەو جۆرە کێشەیەکی لە نێوان دۆستەکانی وبنەماڵەکەیدا ناوەتەوە.

ئارتۆ دژی فەساحەتی زمان بوو، پێی وابوو کە زمانو دەربڕین هەمیشە خیانەت بە هزرو بیر دەکات..

# ٢٤- ئاپولینیر، گیوم
# Apollinair,guillaume

ناوی راستەقینەی ئەم شاعیرە فەرەنسییە (ویلهلم دوکوستروویتکی)یە. لە سالآنی (١٨٨٠-١٩١٨)دا ژیاوە. ئاپۆلینیر لە شاری رۆما لە دایك ووە. داکی لە ئەشرافزاەکانی پۆلاندەو بابی ئیتالیایی فەرەنسی زمان بوو. ئاپولینیر لە لای دایکی گەورە بووەو لە قوتابخانە ئاینییەکانی نیس و مۆناکۆوپاریسدا خوێندنێکی باشی کردووەو شارەزاییەکی فرەی لە زمان و ئەدەبیاتی یونانی و لاتینی پەیداکردووە..هەوەڵجار بە عینوانی سەرپەرشت دەگەڵ خانەوادەیەکدا بۆ ئاڵمانیا رۆیی. پاش ئەوە بە پێیان بۆ زۆر شوێنی جیاواز رۆیی.یەکێك لەو شوێنانە هۆڵآندە بوو. سێ دانە ساڵی بە ئاوارەیی رابوارد. ئەم ئاوارییە کارێکی فرەی کردە سەر دڵ و دەروونی شاعیر وکەرەستەیەکی زهنی فرەی لا کەڵەکە بوو کە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بۆ شیعرو چیرۆکەکانی فەراهەم کرد..کە بۆ پاریس گەڕایەوە لە باتقێکی بچووکدا دامەزرا، بەڵآم بانقەکە نابووت بوو وئەو کارەی لە دەست دا.

ئاپولینیر لە ساڵی ١٩٠٢دا دەستی بەکاری ئەدەبی کرد.لە گۆڤارانی جۆراوجۆردا کەوتە کارو چیرۆك و شیعرەکانی خۆی بڵآوکردەوە. لە ساڵی ١٩٠٣دا بە هاوکاری ئاندرێ سالمون گۆڤاری (لوفستن دزۆپ)ی دامەزراندو ئاشنایەتی دەگەڵ پێشەنگانی هونەری میناکی ماکس ژاکۆپ،بیکاسۆو براك دا پەیدا کرد.لە ساڵی ١٩٠٩دا چیرۆکی(جادووگەری رزیو)ی بە شیعرو پەخشان بڵاو کردەوە. بابەتی چیرۆکەکە لە ئەفسانانی کۆن و جادووییەوە وەرگیراوەوچارەنووسی خەمناکی جاویدانی بەشەرێکە کە بووە بە قوربانی چارەنووس و زیندانی تەنیایی خۆی.لە راستیدا ئاپولینیر خۆی لە قارەمانی چیرۆکەکەدا دەبینێتەوە.مرۆڤێکە کە جیهانبینییەکی بەهێزتری لە خەڵکانی دی هەیەو ئەوەی ئەو دەیبینێ و دەرکی دەکات خەڵکانی دی نە دەیبینن و نە دەرکی دەکەن. کەواتە شاعیرو پەیامبەر بە تەنیاو جیا لە خەڵی دی دەمێنێ ..لە ساڵی ١٩١٠دا کۆمەڵە چیرۆکی (مورتەدو...)بڵآوکردەوە. جێ دەستی نیرڤال، ڤیلیە دولیل- ئادام و ئەدگار ئالن پۆ بەم چرۆکانەوە دیارە. چیرۆکەکا بریتین لە وێنەی زەینی، کابوس،کاری نائاسایی، کارێن ئەهریمەنی،وکوفرو خوانەناسی...ئەم بەرهەمە بە شێوازێکی فرە پوختەو بێ عەیب هاتووەتە نووسین وهەڵبەتە بە شاکاری ئاپولینیر دێتە ژماردن. ئاپولینیر لە ساڵی ١٩١١دا بە تۆمەتی بەشداری ە دزینی پەیکەرێك لە موزەخانەی لۆڤەر زندانی کراو هەندێ لە شیعرەکانی دیوانی (ئەلکول- Alcools)لە زینداندا داناوە.ل ساڵی ١٩١٣دا بە بۆنەی ئەم دیوانەوە ناوبانگێکی فرەی دەرکرد. بە بۆچوونی ئاپولینیر ئەو ئاوازو نەغمە رەوانانەی کە خۆ بەخۆو خۆرسك لە زەینی بنیادەمەوە دادەچۆڕێ وەکو نەغمەو ئاوازی مەلان سروشتییەوهەندێ جار دەرژێنە قاڵبی شەپۆلەکانی ژیانەوەو بە گوێرەی پێچ ودەوران و جولەکان، دەگۆڕێن بۆ کێش و ئاهەنگ و ریتمان. بەناوبانگترین پارچە شیعری دیوانی (الکول) قەسیدەی (پردی میرابۆ)یە کە جوانییەکی ئەفسوناوی هەیە، پەنهانترین و ەمگینترین هەستی شاعیر بە ریتمێکی

دڵگیر دەنوێنیٚو نیشان دەدات، لە حاڵێکای نیشان دەدات کە لە کەناری روباری (سن)دا هەڵکوڕماوەو ڤیانی رابردوو وەیاد دێنێتەوە، ڤیانێك کە میناکی روبارەکە لە رۆیین دایە. سەرچاوەی ئیلهامو سەرۆی ئەم قەسیدەیە (پردی میرابۆ) ئەشقی ئاپولینیرە بۆ ماری لورانسن. ئاپولینیر لە شیرەکایا دەسبەرداری خاڵبەندی ئاسایی بووەیو شیعری کردووە بە پاشکۆی کۆمەڵێك وێنەی زهنی وبە دەستی وشەی سپاردووە.هەڵبەت هیچ بەرهەمێك لە سەردەمی ئاپولینیردا کاریگەرییەکی چوون کاریگەری دیوانی ( الکول) ی ەسەر سەرلەبەری شیعری فەرەنسی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا نەبووە.هەموو ئەوانەی کە لە وشکی قوتابخانەی پارناسو ئاڵۆزی قوتابخانەی سەمولیزم بێتاقەت بووبوون، لە دیوانی (الکول)دا کۆمەڵێك شتی خەیاڵ ئەنگێزو دڵگیرو توندو نەرمی ئاوازی عامیانەو هونەرکاریو فەنبازی پڕ جەزبەی شاعیرانەیان بینییەوە کە بە زۆری خەمئامێز بوون. ئاپولینیر بە بەکارهێنانی دەربڕینی تازەو ناباوو وێنەیێن زهنی زۆر تازە لە پاڵ رەگەزدۆزیو خوازەو ئیستعارەی شێوازی تەقلیدیو باودا ویستوویەتی ئەوە بسەلمێنیٚ کە چۆن دەتوانرێت ژیانی رابردوو موتوربەی ژیانی نویٚ بکریٚ.ئاپولینیر بە شێوی داوخواز لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بەشداری کرد، هەوەڵجار چووە بەشی تۆپخانە، پاشان لەەر داوای خۆی لە بەشی پیادەدا کەوتە خزمەت ولەسلی ١٩١٦دا سەری بە خەستی بریندار بوو.. بۆ پاریس براو نشتەرگەری بۆ کرا. جارێی دی گەایەوە سەر ژیانی جرانیو سەرلەنویٚ کەوتەوە هاوکاری دەگەڵ گۆڤارەکاندا،چونکە بەهۆی نەشتەرگەرییەکەیو زامە ساریٚژ نەبووەکانییەوە زۆر لاوازو کەسیرە بووبوو، پاش ئەوەی دووچاری ئەنفلۆنزا بوو لەپڕ لە پیٚ کەوتو لە پازی ١٩١٨دا کۆچی دوایی کرد. ئاپولینیر، لە سەردەمی جەنگدا کۆمەڵێك شیعری گوتبوو کە لە دیوانێکیدا بە ناونیشانی (کالیگرام) لە ساڵی ١٩١٨،دوای مەرگی بڵاو بووەوە.ئەم دیوانە کۆمەڵێك یعری فرە جوانی بەر لە جەنگو کاتی جەنگی لە خۆگرتووەو بە شێوە خەتێکی تیبەتی رەسم ئاسا نووسراوە. ئاپولینیر لە نێو نوێگەرییە سەیرەکانیا، بیدعەتی جۆری نووسینی بەیتە شیعرەکانیشی هێنابووە ئاراوە، لە بری ئەوەی بەیتەکان بە ریزو بە رێكوپێکی لە ژێر یەکدیدا ریز بکاتو بنووسێت، بەیتو وشەکانی بە جۆریٚ ریز دەکرد کە وێنەی شتان بوێنیٚ ونیشان بدات، بۆ نموونە لە شیعری ( باران دەباریٚ)دا پیتەکان بە جۆریٚ لەسەر لاپەڕەکەدا ریز کراوە لە تۆ وایە دڵۆە بارانەکان لە سەریٚ را بەرەو خوار دەڕژیٚ. یان وێنەی تەیرێك دروست دەکات. هۆزانیٚ ئەم دیوانەش بەزۆری سەر ریٚژن لە جوانیو دڵگیریو دەربڕینی شاعیرانە. کتێبی (شاعیری کوژراو) لە ساڵی ١٩١٦دا بە چاپ گەیەنراو لە ساڵی ١٩٢٧دا جارێکی دی لە لایەن گروپی نووسەرانی سورریالیستەوە چاپ کرایەوە. ئەم بەرهەمە چیرۆکڤانیو پڕخەیاڵە هەجوئامێزە لە سەردەمی ئەو ئاستەنەگوقەیرانە ئەدەبییەی کە سەمبولیزمی لە سورریالیزم جیا دەکردەوە، بە بەرهەمێکی گرینگ هاتە ژماردن.(ژنی دانیشتوو-١٩٢٠) یەکێکە لەو بەرهەمانەی ك پاش مەرگی ئاولینیر بڵاوبووەتەوە. ئەم بەرهەمە لە کاتی جەنگدا نووسراوەو ئەوە نیشان دەدات کە چۆن سەربازێك لە ساتە کورتەکانی مادونیدا تەنیا لەبیری ئەوەدایە کە کاتەکەی بە فیڕۆ نەداتو بیٚ دڵی خۆی نەکاتو

بكەوێتە وەسف و باسی ساتە شیرینەکانی ژیان. (کتێبی ژنی دانیشتوو) شاکارێکی پەراگەندەو ئاڵۆزە، ئەگەرچی نووسینی ئەم بەرهەمە لە کاتی جەنگدا بۆ ئاپولینیر جۆرێك لە سەرگەرمی و فەنبازیو کات بەسەر بردن بووە، بەڵام شێوازێکی وردو سفت و ناسکی هەیە، بە تایبەتی ئەو وەسفە زندووە رەوانەی کە لەمەڕ گەرەکی مونپارناس-ی بەر لە جەنگی کردووە، بەرهەمەکەی کردووە بە کارێکی یەکجار دڵگیرو مێژوویی. ئاپولینیر لە مەیدانی شانۆنامەنووسیشدا هەوڵێکی داوە. ە ساڵی ١١٦دا شانۆنامەی (مەمکەکانی تیرزیاس)ی بڵاو کرەوە، کە نووسەر بە خۆی ناوی درامای سورریالیست-ی لێنا ووبۆ یەکەمجار ئەم وشەیەی بەکار برد تا بەمە دەرگایەك بەرەو دنیای نا ئەقڵانی بکاتەوەودنیایەکی واقیعی باڵاتر نیشان بدات.. ئۆپرایەکی یەجگار نایابیش لەم شانۆنامەیەوە هەڵێنجرا..ئاپولینیر نەك هەر لە پێناوی شیعردا، بەڵکو لە رای داهێنانو مۆدێرنیتەی هونەری نیگارکێشیشدا بەردەوام خەباتی کردووەو بە یەکێك لە پسپۆڕانو خودان نەزەری شێوازو رێبازی کوبیزم دەژمێردرێت و لە ساڵی ١٩١٣دا کتێبێکی لەم بارەیەوە بە ناونیشانی نیگارکێشانی کوبیست بڵاوکردەوە کە ئامانجی ئەم شێوازەی تیا روون کردووەتەوەو رێسا تەقلیدیو قەراردادیو هونەرییەکانی ئەو بوارانەی هەڵوەشاندەوە..لە شیعریشدا لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە لایەنە جیاوازەکانی شتان بخاتە بەر چاوو بەرجەستە بکات. شیعر ل روانگەو گۆشەنیگای ئاپولینیرەوە کەشفکرنی رووە نادیارەکانی کاروبارە واقیعییەکانەو شاعیر کەسێکە کە نیگای تیژی بگاتە ئەو دنیا نادیارەی کە کەوتووەتە ئەو دیوی دنیای هەست پێکراوەوە.

ئاپولینیر گەورەترین شاعیری فەرەنسای نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمەو پێشەنگ و سەرقافڵەی شاعیرانی نەسلی خۆیەتیو کاریگەریی بەسەر هونەری تازەی فەرەنسای دوا نیوسەدەی سەدەی بیستەمەوە یەجگار قوڵو حاشاهەڵنەگرە..

## ٢٥- ئاسترۆفسکی، ئالکساندر نیکۆلایوڤیچ
Ostrovskiy aleksandrnikolayevich

شانۆنامه نووسی روسی ئاسترۆفسکی (١٨٢٣- ١٨٨٦) له مۆسکۆ هاتووەته دنیا. خوێندنی لقی مافی تەواو کردووه، ماوەیه له دادگاکاندا، به تایبەتی دادگای بازرگانی کەوتەکارو ئەمه کردیه کارێك له نزیکەوه شارەزای ژینگەی بازرگانان و تایبەتمەندی ئاکاریو ئەخلاقی چینی بازرگان ببیٚ و کرەستەیەکی فره بۆ بەرهەمەکانی ئایندەی عەمار بکات. ئاسترۆفسکی له ساڵی ١٨٤٧دا بەشێکی له کۆمیدیەکی خۆی به ناونیشانی نابووتی بڵاوکردەوه که بووه مایەی سەرنجی خەڵکی وکردیه کارێك به تاسەیەکی زۆرەوه چاوەروانی شانۆنامه واقیەکانی بکەن. کۆمیدیای نابووتی دوای سیٚ ساڵ تەواو بوو وبەناونیشانی تازەی ( هەموو شتێك له بەینی خزمانا تەواوه) بڵاو بووەوه. هەرچەنده له بەرهەمەکانی سەرەتای ئاسترۆفسکی بوو، بەڵام به باشترین بەرهەمی هاته ژماردن. ئەم کۆمیدیایه وەسفێکی ئاشکراو زندووی ژیانی بازرگانانه.چونکه زوڵمو زۆرو ستەمکاری بیٚ سنووری ئەم چینه وتەزویرکارییو ساختەکاری ئەم چینەو چاوپۆشی حکومەتله مامەڵەی ناجوامێرانەیان دەرهەق به خەڵکی تەوەرەی ئەم شانۆنامەیه بوو، نمایشکردنەکەیان رگرتو نووسەرەکەی بۆ ماوەیەك خرایه ژێر چاودێریی دەزگای ئەمنەوه. یەکەمین بەرهەمی ئاسترۆفسکی که دامو دەزگای حکومەتی مۆڵەتی نمایشکردنی دا شانۆناەی (نامزەدی هەژار) بوو که هەوەڵجار له گۆڤاری مۆسکۆڤیتیانین بڵاو بووەوەو پاشان له ساڵی ١٨٥٣دا لەسەر شانۆ نمایش کرا. هەمان گۆڤار دوو بەرهەمی هەرەباشی دیکەی ئاسترۆفسکی بڵاوکردەوه بەناونیشنی (له عەرەبانەی کەسدا سوار مەبه یا هەرکەسەو له جێی خۆی-١٨٥٣)و ٠هەژاری شەرم نییه-١٨٥٤) که شنۆنامەیەکی سیٚ پەردەیی بوو. نووسەر لەم شانۆنامەیەدا پایەخوازییو خۆهەڵکێشانی بازرگانانێك نیشان دەدات که دەخوازن له چینەکەی خۆیان بێنه دەرەوه. ئاسترۆفسکی تا کۆتایی تەمەن ساڵانه کۆمیدیایەکی بڵاو کردووەتەوەو پاش ساڵانێك له کارو کۆشش شۆرەتو نێوبانگی پەداکردو به بەرێوەبەری شانۆنامەکانی شانۆی پاشایەتی مۆسکۆ دامەزرا ، که پۆستێکی شایسته بوو، بەڵام له باری وەزعو حاڵی داراییەوه قەت باش نەبووه. ئاسترۆسکی له ساڵی ١٨٥٧دا کۆمیدیای (پۆستێکی پڕ سوود)ی بڵاو کردەوه که له ساڵی ١٨٦٣دا له پێنج پەردەدا له سەر شانۆ نمایش کرا. ئەم شانۆنامەیه وەکو هەموو بەهەمەکانی تری ئەو سەروساخت دەگەڵ دیارده تازەکانی کۆمەڵدا پەیدا دەکاو ئەو گێژاوه قوڵەی که خوێندنی ئامادەیی له نێوان وەچەی لاوو نەسلی رابردوودا هێناویەته ئاراوه، نیشان دەدات کێشماکێشو ململانێی ئەم دوو وەچەیه دەخاته بەرچاو. ئەم بەرهەمه پڕ جۆشه تا ئەمرۆکەش بایەخی خۆی له دەست نەداوه. دوا بەدوای ئەم شانۆنامەیه کۆمیدیای (زڕ کچ)و(تۆفان) له ساڵی ١٨٦٠دا نمایش کرا. شانۆنامەی تۆفان شاکاری ئاسترۆفسکی یه ونێوبانگی گەییه دەرێی وڵاتی روسیا. نووسەر هم بەرهەمەدا شیکردنەوەیەکی ورد دەربارەی دابو نەریتی کۆمەڵگه ئەنجام دەداتو دەیگەیەنێته ئاستی تراجیدیا. کیژێکی

سەر بە چینی ناوەنجی کە لە شارێکی بچکۆلەی دەڤەری ڤۆلگا دەژی، لە سۆنگی بەرزەفڕیو شکۆخوازی دایکییەوە، مل بۆ زەوجینێکی ناچاریو نەبەدڵ دەدات، پاشان حەز لە لاوێك دەکات کە لە مۆسکۆوە هاتووە، پاش ململانێیەکی دەروونیو هەوڵێکی فرە بۆ سەرکوتکرنی هەستە تازەکەی خۆی، لە ساتێی نائومێدیدا خۆی دەخاتە رووباری ڤۆلگاوە. ئاسترۆفسکی لە ساڵی ١٨٦٢وە دەستی دایە نووسینی زنجیرەیەك شانۆنامەی مێژوویی کە یەکەمینیان (کازمینین)ی نوەو دوای ئەوە چەند شانۆنامەیەکی تری بلاّو کردەوە وەك: (دیمیتری داگیرکەر– ١٨٦٧)بریتیە لە باسی کۆمەڵگەیەکی پەشێوو پەریشان لە قاڵبی واریقاتی مێژوویدا، کە بە یەکێك لە بەرهەمە باشەکانی ئاسترۆفسکی دەژمێردریٚ. ئاسترۆفسکی شان بەشانی مێژووی رابردوو، بایەخی تایبەتی بە بابەتو مێژووی هاوچەرخیش دەداتو لەم بارەیەوە چەندین بەرهەمی بلاّو کردووەتەوە لەوانە: ( چ کەسێك لە مەینەت رەهایە،و رۆژانی دژوارو سەخت). بابەت لە شانۆنامەکانی ئاسترۆفسکی دا هەمیشە روو لە کرانەوە دەڕواتو جگە لە چینی بازرگانان چینوەکانی تری کۆمەڵگەش لە خۆ دەگرێت وەکو: موڵکداران، وردە موڵکدران، ئەو دەوڵەمەندە فیشاڵبازانەی کە بە قەرزو قۆڵە خۆ دەژێنن، دەلاّلانو یان ئەکتەرانی شانۆی شارەکان کە نووسەر لە نویکەوە ئاشنا ژینگەو ژیانیان بوو.یەکێك ە شانۆنامە بە نێوبانگەکانی ئاسترۆفسکی (بێشە) یە کە لە ساڵی ١٨٧١دا لە پێنج پەردەدا سەرکەوتووانە نمایش کرا.لەم شانۆنامەیەدا نەجابەتی تەبیعەتو نەفسبەرزی دەستەیەك لە ئەکتەران لە هەنبەر تەماعکاریو نەفسنزمی تاقمێکی دیکەدا نیشان دەدریٚ. یەکێك لە بەهەمە هەرە جوانەکانی ئاسترۆفسکی کە لە قاڵبی کومیدیای دابو نەریتو شانۆنامەی مێژوویی دەرچووە، شانۆنامەی پڕ خەیاڵو شیعریی (کیژی بەفرین)ە کە یەکەمجار لە سانترسبۆرگ لە ساڵی ١٨٧٢دا نمایش کرا. ئەم بەرهەمە کە لە ناسکە چیرۆکی فۆلکلۆرییەوە وەرگیراوە، لە رووی خەیاڵ ئەنگێزیو گیانی شاعیرانەوە پایەیەکی تەواو تایبەتیو جیاوازی هەیە، چایکۆفسکی لە ساڵی ١٨٧٣دا ئاوازی بۆ دااو ریمسکی کۆرساکۆف کردی بە ئۆپرایەکی چوارپەردەییو لە ساڵی ١٨٨٢دا لە سانپترسبۆرگ نمایش کرا. شانۆنامەی (گورگو مەڕ–١٨٧٥) باسی زۆرداریو ستەمکاری دەکات. ئاسترۆفسکی نیگارکێشی دەست رەنگینی سەردەمی خۆی بوو. تیژی سەرنجو پاراویو تەڕوتازەیی تەبعو دروستی کاری ئەو لە مەیدانی گۆڕینی واقیعەکانی ژیان بۆ شاکاری وەك : تۆفان، بێشە، کیژی بەفرین، بووەتە مایەی ئەوە کە کەسایەتییەکی ریزپەڕ پەیدا بکاتوجیٚ دەستو پاەی لە مێژووی شانۆو هەروەها لە ئەدەبیاتی دابو نەریتی روسیا بگاتە لوتکە.( شانۆی بچووك)ی مۆسکۆ کە بە هۆی کەسایەتی ئاسترۆفسکییەوە رێبازێکی تایبەتی گرتە بەر بە (ماڵی ئاسترۆفسکی) ناوی دەرکردبو. ئاسترۆفسکی بە گەورەترین شانۆنامەنووسی روسیا لە قۆناغی ریالیزمو بە فاکتەری سەرەکی گۆڕانە گرینگەکانی شانۆی ئەم وڵاتە دانراوە...

## ٢٦- جيمز گرۆڤەر تربەر

جيمز گرۆڤەر تربەری تەنزنوس و كاریكاتۆریستی ئەمریكایی لە ساڵی ١٨٩٤ لە شاری كولومبسی ویلایەتی ئۆهایۆ هاتۆتە دنیاوەو خوێندنی لە زانستگەی ئۆهایۆ تەواو كردووە. پاش زانستگە پیشەی پەیامنێری هەڵبژارد. لەسەرەتادا بۆ ماوەی چوار ساڵان پەیامنێری رۆژنامەی ناوچەیی كۆلۆمبس دیسیچی كردبوو.پاشانبۆ ماوەی یەك ساڵ بووە پەیامنێری شیكاگۆتریبیون. لە ساڵی ١٩٢٦د چوو بۆ نیویۆرك و لەوێ پەیوەندی كرد بەو گروپە لاوەوە كە گۆڤاری نیویۆركەریان دامەزرانبوو ،ئەركی سەرنووسەری ئیجرایی گۆڤارەكەی گرتە ئەستۆ. لەم گۆڤارەداو لە رێگەی ئەم گۆڤارەوە تربەر وەكو تەنز نووس و كاریكاتێریست ناوبانگی دەركردو شۆرەتی جیهانی پەیدا كرد.ژیانی ئەدەبی تربەر یەجگارپڕ بەرهەمەو چیرۆكی كورتی تەنزئامێزو ژمارەیەكی زۆر لە گوتارو كریكاتۆران دەگرێتە خۆ.هەندێ لەو بەرهەمانە بەپێی ریزی بلاۆبوونەوەیان بریتین لە: (ئایا سێكس پێویستە؟– بەهاوكاری ئی. بی. وایت. ،كوندەپەپوی ژێر تاق و شتی دیكەی سەیر – ١٩٣١، ورچی شینباوی ژووری نووستن و شتی دیكەی عەزاب ، ژیانی من و سالأنی سەخت ١٩٣٣، پیاوێكی میانە ساڵێ سەر تەنافی پەتبازی– ١٩٣٥، با مێشكت ئاسودە بێ_ ١٩٣٧، دوایەمین گوڵ_ ١٩٣٩، حەیەوانی نێر – ١٩٤٠، دنیای من و بەخێربێی بۆی – ١٩٤٢، اپیاوان، ژنان و سەگان _ ٩٤٣، گەرنەڤالی توربەر_ ١٩٤٥، حیكایەتەكانی سەردەمی ئێمە– ١٩٥٦، سەعاتی چاڵمەدارو شادییەكان– ١٩٥٧)

جیمز تربەر چەندین ساڵ بەدەست كزی چاوەوە نالأندی و لە دواساڵەكانی تەمەنیشیدا بە تەواوەتی نابینا بوو. هەر بۆیەش لە دوا ساڵەكانی تەمەنیدا بەرهەمێكی ئەوتۆی بلاۆنەكردەوەو پتر لە گۆشەگیریدا دەژیا. تربەر لە سالی ١٩٦١دا كۆچی دوایی كرد.

تەنزی تربەر چزدارو خەمینە، چیرۆکەکانی پتر وەسفی ژیانی میکانیکی و گیانەلاَ ئـامێزی وردە شـاران و خـەڵکانی بۆرەکییـە کـە دەخـوازن ناسـنامەی خۆیـان بـە فەرامۆشـی بسـپێرن، خـەڵکانێکی( نوێخـوان) کـە حەزدەکـەن سـاتێ زووتـر ئاوێتـەی سیسـتەمی گشـتی کۆمەڵگـە بـبن و بتوێنـەوە، کاریکاتۆرەکـانی بـەزۆری سـادەو بـێ رتوشن و کەمتر تاریك و روونیان تێدا دەبینرێ. بەزۆری چەند خـەتێکی سـادەن، کـە بەتـەنز تروسـکەیەك لـە ژیـانی ئـەمرۆ دەنـوێنێ. کاریکاتۆرەکـانی پـتر وێنـە گرتنـی گرفتی کۆمەڵایەتی، ئابوری و خانەوادەیی خەڵکانێکە کە خەریکە دەگۆرێن وخۆیـان لە بیر دەکەن..

## ٢٧- ئەرنست هەمینگوای

١٨٩٩-١٩٦١

له ١٨٩٩/٧/٢١ له شاری ئۆكپاركی ئیلینویز هاتۆته دنیاوه.له تەمەنی ١٨ساڵیدا بـوو بـه پـەیامنێری رۆژنامـەی كـانزاس سـتی سـتار. لـه سـاڵی ١٩٢١دا وازی لـه رۆژنامـەی نێـوبراو هێنـا و بـوو بەپـەیامنێری گەریـدەی رۆژنامـەی تورینتـۆ سـتار ویكلی، له دیسامبەری هەمان ساڵدا بەسواری كەشتی رێگەی ئەوروپای گرته بەر ،له ئەوروپاوه سەرەتا راپۆرتێكی لەمەر جەنگی نێوان یۆنان وتركیا و پاشان راپـۆرێكی لەمەر رەوتی كۆنفرانسی ئاشتی لۆزان، بۆ هەفتـه نامـەی نێـوبراو نـارد، لەوقۆناخـەدا بوو كه دەسنووسی شیعرو چیرۆكه كورتەكانی، جگه له چیرۆكی (پیرەمێردی من) كه بۆ گۆڤاره جیاوازەكانی دەنووسین.بەجانتایەكەوه له ڤیتاردا لێ بـەجێماو هەمـەنگوای جـەوان و لاو ناچـار بـوو سـەرلەنوێ دەسـت بـەكار بكاتـەوەو ئـەو بەرهەمانـه دووبـاره بنووسێتەوه.

لـه سـاڵی ١٩٢٣دا یەكـەمین بەرهـەمی خـۆی بـەناوی (سـێ چیرۆك ودە هـۆزان) بـه تیراژی سێسەد دانه بڵاوكردەوه. له ساڵی ١٩٢٦دا یەكەمین كۆمەڵـه چیرۆكی بـەناوی (له زەمانی ئێمەدا) هاته چاپكردن، هـەر لـه سـاڵی ١٩٢٦دا بەرهـەمێكی تـەنز ئـامێزی بـەناوی (سـێلاوی بەهاری) و پاشـان لـه پـاییزی هـەمان سـاڵدا (هـەتاو هەڵدێتـەوه) ی بڵاو كردەوه.

له ئۆكتۆبەری ١٩٢٧دا كۆمەڵه كورته چیرۆكێكی دیكـەی بـەناوی (پیـاوانی بـێ ژن) بـڵاو بـووەوه، (پیـاو كـوژان) و(لـەپێ نەكـەوتوو) كـه دوو چـیرۆكی نـاو كۆمەڵـەی نێوبراون، به باشترین چیرۆكی كورتی ئـەم سـەردەمه دەژمێـردرێن، لـه سـاڵی ١٩٢٩دا رۆمانی ( ماڵاوایی لەچەك)ی بڵاوبووەوەو ئەم كاره پایەی هەمنگوای له نێـو باشـترین چیرۆكنووسـانی سـەردەمی تـازەدا چەسـپاند.لـه سـاڵی١٩٣٨دا كۆمەڵـه چـیرۆكێكی دیكـەی هـەمنگوای بـەناوی(یەكـەمین چـل ونـۆ) بـڵاو بـووەوه.هـەمنگوای لـه سـاڵی ١٩٤٠دا رۆمانی(زەنگـی مـەرگ بـۆ كـێ لێـدەدرێ) ی تـەواو كـرد كـه رۆمـانێكی درێـژه لەمـەر جـەنگی نـاوخۆی ئەسـپانیا، دوای دەسـاڵ (لـه كـەناری رۆخانـەو لـەناو درەختانـدا)ی بـڵاو دەبێتـەوه، پـاش ماوەیـەكی كـورت و لەسـاڵی ١٩٥٢دا (پـیره مێردودەریا)ی بڵاو كردەوه.

ئەنجام لەساڵی ١٩٥٤دا هەمنگوای خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیات وەردەگریٚ کە بەر لەو تەنیا شەش ئەمریکایی دیکە وەریان گرتبوو. خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی ( لەبەر وەستایی و توانای داهیٚنەرانەی لە شیٚوازو نیشاندانی چیرۆکی تازە) پیٚ بەخشرا.

ئەرنست هەمنگوای ساڵانیٚك لە کوبا ژیا، دوا رۆژەکانی ژیانی لە شاری کیچوم بەسەربردو هەر لەویٚندەر لە ٢/ ٧/ ١٩٦١دا ماڵاوایی لە ژیان کرد.

## ٢٨- تی. ئێس . ئیلیەت

١٩٦-١٨٨٨

تۆماس ئسترنز ئیلیەت لە ٢٦/سەبتەمبەر/ ١٨٨٨دا لەشاری سەنت لوییس لە بنەماڵەیەکی ناوداری بۆستۆنی هاتووەتە دنیاوە.بنەماڵەیەکی ئاینی و پابەند بە داب و نەریت. کە زیاد لە پێویستپابەندی داب و نەریتی خەڵکی نیو ئینگلاند بوو.ئیلیەت تا هەژدە ساڵی لە سەنت لویس ژیا و لە ساڵی ١٩٠٦دا، پاش ئەوەی ساڵێکی لە کۆلیجی میلتۆندا بەسەربرد، داخڵی زانستگەی هارڤەرد بوو. چوار ساڵ لەم زانستگەیەدا مایەوەو توانی لەماوەی ئەو چوار ساڵەدا کارنامەی ماجستێر وەربگرێت. پاش ئەوە چوو بۆ زانستگەی سۆربۆن و ساڵێك لەوێدەر مایەوە، بەلاّم خوێندنی بە نیوەچڵی بەجێهێشت و گەرایەوە بۆ زانستگەی هارڤەرد. ئەمجارەیان بە جددی کەوتە کارکردن لەسەر دکتۆرایەکەی و نامەیەکی دەربارەی (ئیف. ئێچ. برادلی) نووسی و یەکسەر پەسند کرا.ئیلیەت بەخۆی لەمبارەیەوەدەڵی: ((راستییەکەی نامەکەیان بۆیە پەسند کردم چونکە نە قابیلی خوێندنەوە بوو نە کەس سەری لێدەردەکرد)) وێرای ئەمەش هەرگیز کارنامەی دکتۆراکەی وەرنەگرت و نەچوو بەلایەوەو وازی لە زانستگەی هارڤەرد هێنا.ئیلیەت لەساڵی ١٩١٤دا چوو بۆ ئەڵمانیا.بەلاّم بەهۆی هەڵگیرسانی شەرەوە بۆ ئینگلتەرا گەرایەوەو لەشاری ئۆکسفۆردا فەلسەفەی خوێند. لە هەمان ساڵدا بەیەکجارەکی لە ئینگلتەرادا ئاکنجی بوو.و باقی تەمەنی خۆی لەوێندەر بەرێکرد.ئیلیەت لە ساڵی ١٩١٧وە تا ساڵی ١٩١٩ یاریدەدەری سەرنووسەری گۆڤاری ئیگۆئیست بوو. یەکەمین کتێبی شیعری خۆی بەناوی ( پروفەك و تێبینیانی دیکە) ی لەم سەردەمەدا بلاّوکردەوە. هەروەها زنجیرە گوتارێکی زۆریشی بلاّوکردەوە کە یەکێك لەوانە: عەزرا پاوەندو هۆزان وکێش.)بوو بەلاّم لە گەڵ هەموو ئەمەشدا تا لەساڵی ١٩٢٢دا قەسیدەی( وێرانە خاك) نەهاتە بلاّوبوونەوە، شۆرەتێکی ئەوتۆی نەبوو.لەم ساڵە بەدوواوە ئیلیەت گەییە ترۆپکی ئەدەبیات ئەمەش ناوی هەندێ بەرهەمی بەناوبانگی دیکەی ئیلیەتە بەپێی ریزیبلاّ بوونەوەیان:دوو دەفتەری شیعر: ((چوار شەممەی خۆڵە کەوە-١٩٣٠) و (چوار چوارینە-١٩٣٤)وشانۆنامانی: (( کوشتن لەکاتەدرائیەدا-١٩٣٥))و (( کۆبوونەوەی خانەوادەیی-١٩٣٩))و (( ئاهەنگی کۆکتێل-١٩٥٠)) هەروەها زنجیرە گوتاری: ((لێرەواری مقەدەس-١٩٢٠))، (( ئەندرێ مارڤیل-١٩٢٢))،(( هەندێ بیرکردنەوە لەمەر لامبت-١٩٣١))، (( بەکارهێنانی شیعرو بەکارهێنانی رەخنە-١٩٣٣))و

((گوتـارانی کـۆن ونـویٚ-١٩٣٦)). یـەکێك لـەکارە جدیـەکانی ئیلیـەت دامەزرانـدنی گۆڤاری کرایتریـۆن بـوو لەسـاڵی ١٩٢١دا، ئـەو گۆڤـارەی کـە بـۆ یەکـەمجار قەسـیدەی وێرانە خاکی تێدا بڵاوبووەوەو بۆ سـالأنێکی زۆر وەکو گۆڤـارێکی سـەنگینی دنیـای ئـەدەبیات و فەلسـەفە حەسـاو دەکـرا.لەسـاڵی ١٩٢٥دا سەرنووسـەریی بڵاوەخانـەی ( فیبـەر ئانـد فیبـەر)ی گرتـە ئەسـتۆو چـەند سـاڵێك بـۆ ئـەم بڵاوەخانەیـە کـاری کـرد. ئیلیەت لە ساڵی ١٩٢٧دا بە فەرمی بوو بە هاووڵاتی ئینگلتەرا.لە ساڵی ١٩٣٣دا بـەم شێوەیە وەسفی خۆی کردووە: ((ئەنگلۆ-کاتۆلیکەم، لە ئەدەبیاتدا پەیرەوو موریـدی قوتابخانەی کلاسیکم و لە سیاسەتدا خۆم بە سەڵتەنەتخواز دەزانم))

لە ساڵی ١٩٤٨دا خەڵاتی نۆبڵی لەسەر قەسیدەی وێرانە خاك وەرگرت وجۆرجی حەتەمی پاشای سوێد ستایشی کرد.لە ساٰی ١٩٦٥دا ماڵاوایی یەکجارەکی کرد.

## ٢٩- میلان کۆندێرا

کۆندێرا یەکێکە لەو رۆماننووسانەی کە حەزناکات باسی خۆی بکات.هەموو ئەو رۆژنامەنووسانەی کە دەربارەی ژیانی پرسیاری لێدەکەن، هەمان وەڵامی دووبارەیان دەدرێتەوە،لە ساڵی ١٩٢٩دا لەشاری برنوی چکۆسلۆفاکیدا هاتووەتە دنیاوە. کە رژێمی کۆمۆنیستی لە ساڵی ١٩٤٨دا دسەلاتی گرتە دەست، ئەو قوتابی زانکۆ بووە. پێش ئەوەی کە ژیانی خۆی وەقفی ئەدەبیات و فیلم بکات، بە کرێکاری و جازژەنی ژیانی خۆی بەرێبردووە،پاشان لە قوتابخانەی فیلم ی پراگ دەرس دەڵێتەوە،زۆربەی قوتابیانی ئەم قوتابخانەیە بریتی بوون لە فیلمسازانی لاو( شەپۆلی نویێ) . یەکەمین رۆمانی (شۆخی) بەرهەمێکی یەجگار سەرکەوتوو بوو،لە ساڵی ١٩٦٨دا خەلاتی یەکێتی نووسەرانی چیکی لەسەر وەرگرت.

هەر لەساڵی ١٩٦٨دا یەکێتی سۆڤیەت، چیکۆسلۆفاکیای بەهێزی سوپایی داگیر کرد. کۆندێرا لەم ساڵەدا کاری دەرس وتنەوەکەی لە دەستدا ونەیتوانی کارێکی تازە بدۆزێتەوە. هەموو کتێبەکانی لە کتێبخانەکاندا یاساغ و کۆکرانەوە. ئەگەرچی ئە قۆناغە بەلای کەمەوە لە روانگەی خودی کۆندێراوە، بە یەکێك لە رەشترین رۆژگارو قۆناغەکانی مێژووی چیکۆسلۆفاکیا دەژمێردرێ و پەیوەندی کۆندێرا بەژیانی گشتی و خەڵکییەوە دەپچرێ، لێ بەرێکەوت بەقۆناغێکی بەرهەمدار بۆ کۆندێرا حەساو دەکرێ. دوو رۆمانی تازە دەنووسێت: (ژیان لەجێیەکی دییە)و ( ئاهەنگی بەرێکردن) لەو کاتە وە کە رۆمانەکانی لە چیکۆسلۆفاکیادا قەدەغە کران، ئیدی بەرەبەرە وەرگێردرانە سەر زمانی فەرەنسی. لە ساڵی ١٩٧٥دا بریاریدا کە بەیەکجارەکی ئاکنجی فەرەنسا بێ. زانستگەی( رن )پۆستی مامۆستای ئەدەبیاتیان بۆ پێشنیاز کرد و ئەویش قبوڵی کرد. کە بەرهەمی ( کتێبی خەندەو فەرامۆشی ) بلاْو کردەوە دەوڵەتی چیکۆسلۆفاکیا مافی هاوولاٚتییەتی لێسەندەوە، و ساڵی پاش ئەم رووداوە کۆندێرا بوو بە هاوولاٚتی فەرەنسا.د وا بەرهەمی کۆندێرا (شێوازی لە تەحەمولنەهاتووی بوون) زۆر بە گەرمی لە لایەن خەڵکییەوە پێشوازی لێکراو و لەگەڵ بلاْوبوونەوەیدا چووە ریزی ( پر فرۆشترین) بەرهەمی ئەدەبی جیهانەوە. کۆندێرا لەو سەرو بەندەدا بوو بەدیارترین نووسەرانی فەرەنسی. هەڵبەتە ئەم شۆرەت و ناوبانگە گەلەك سەریەشەو کێشەی بۆ دروستکردووەو لەم رووەوە نارەحەتە. پێدەچێ ئەم رستەیەی ( مەلکولم لوری) زمانحاڵی کۆندێرا بێ کە دەڵێت: ( سەرکەوتن بەلاْیەکی مەترسیدارە، تەنانەت خراتر لەو ئاگرەشە کە بەر دەبێتە

ماڵت. شۆرەت حاڵی بوون دەخواتو لە بناغەوە وێرانی دەکات) . جارێکیان پرسیارم لێکرد کە رای چییە سەبارەت بەو رەخنانەی کە لە بەرهەمەکانی دەگیرێن لە وەڵاما گوتی: (( تائیستا لە رادە بەدەر دەربارەی خۆم قسەم کردووە!))

پێدەچێت ئەم دوورەپەرێزییەی کۆندێرا لە باسکردنی خۆی، تا رادەیەك و بەشێوەیەکی ناشعوری، کاردانەوەیەك بێ بەرانبەر بەم بۆچوونەی کە زۆربەی رەخنەگران لە بری تۆژینەوەی بەرهەمی نووسەر،زیاتر بایەخ بەژیانی تایبەتی و کەسایەتی و بۆچوونە سیاسییەکانی نووسەر دەدەن.کۆندێرا بەخۆی لەم بارەیەوە بەپەیامنێری رۆژنامەی (نوڤل ئەبزرڤاتۆر) ی گووتووە(( رۆماننووسان بێزارن لەوەی کە باسی خۆیان بکەن.زۆربێژی و باسکردنی خۆ پتر بەهرەیەکی شاعیرانەیە، هەڵبەتە شاعیرانی غەزەلخوان)).

جا کە هونەرمەندێك حەز نەکات باسی خۆی بکات ، مانای وایە کە دەخوازێ تەنیا هونەرو داهێنانەکەی مایەی سەرنج بێ. دەیەوێ خودی رۆمانەکە سەنگی مەحەك بێ..

## ٣٠- رۆبەرت فرۆست

١٩٦٣-١٨٧٤

ئـەو شـاعیرە ناوچـەییەی کـە شـۆرەتی جیهـانی پەیـداکرد لـە ١٨٧٤/٣/٢٦دا لـە سانفرانسیسکۆ لـە دایك بووە. بابی رۆژنامـە نووس و سیاسـەتوانێکی لیبرال بوو، چـونکە کاروبـاری سیاسـی نیوئینگلانـد بەدەسـتی کۆماریخوازەکانـەوە بوو،بۆیـە ئەوێنـدەری بەجێهێشـت بـوو ورووی کردبـووە سانفرانسیسـکۆ.بـابی رۆبـەرت کـە سەبارەت بە خەڵکی باشور هاوسۆزو پەیوەندییـەکی تایبـەتی هـەبوو ،و هەندێکیش لـە جەنگـە ناوخۆییـەکانی ئـەمریکادا بەشـداری کردبـوو ، بۆیـە بـەیادی فەرمانـدەی گـەورەی ئەمریکاییـەوە(رۆبـرت لی) نـاوی کورەکـەی نـا. گـاڤێ بـابی فرۆسـت مـرد، رۆبەرتی لاو، لە گەڵ دایکید بۆ نیوئینگلاند گەرایەوە تا لای باپیری لە شاری لۆرانس ماسا چوستدا بژی. لەم شارەدا یەکەم شیعری خۆی نووسی و ئەگەرچی کەم کەس هانیان دەدا ،ژیانی پڕ بەرهەمی شیعری خۆی دەست پێکرد. لەساڵی ١٨٩٢دا چووە کـۆلیجی دارمـووت بـەڵام دوای دوو مـانگ چـونکە کـەش و هـەوای ئەوێنـدەری بـە دڵنەبوو، وازی هێنا ،لە تەمەنی ٢٢ساڵیدا چووە زانستگەی هارڤەرد و دوو ساڵێکی بە خوێندنی زمانانی لاتینی و یۆنانی بردە سەر.پاش ئەوە رووی کردە مەزرایەك لە( دری) ی(نیـو هامشـایر) .لـەم ماوەیـەدا جگـە لـە کـاری کشـتو کاڵی،کـاری دەرسگوتنەوەشـی دەکـردو هەنـدێ جـاریش بابـەتی بـۆ رۆژنامەیـەکی ناوچـەیی دەنووسی. هەڵبەتـە لـە شـیعریش غافڵ نـەبوو وبـەردەوام شـیعری دەنووسـی.لەگـەڵ ئەمەشدا تا ساڵی ١٩١٢، کاتێ کە چوو بۆ ئەوروپا، شیعرەکانی رەواج و رەونـەقێکی وایـان نـەبوو. لـە ئـەوروپادا یەکـەم کۆمەڵـە شـیعری خـۆی بلاوکـردەوە: (حـەزی منالێـك)و(بـاکوری بۆسـتۆن). لـە بـەهاری ١٩١٥دا بـۆ ئـەمریکا گەرایـەوە. ئـەمجارە بەپێچەوانەی جارانـەوە هـەموو کەسێك بـە شاعیرێکی گـەورەیان دەزانـی و دەیتـوانی ژیانی خۆی لە رێگەی شیعرو دەرسگوتنەوەوە بەرێوەبەرێ.

فرۆسـت چـوارجار خـەڵاتی (پـۆلتزەر)ی وەرگـرت.سـاڵی ١٩٢٤ لەسـەر کۆمەڵەشیعری (نیوهامشایر)، ساڵی ١٩٣١ لەسـەر ( کۆی شیعرەکان)، ساڵی ١٩٣٧ لەسەر( ئاسۆی دوورتر) و دواجار لەساڵی ١٩٤٣دا لەسەر (درەختـی خۆشەویستی). دوا کۆمەڵە شیعری فرۆست لـەژێر سەرناڤی( لەسـەر زەمینـی رووتـەن)دایـەو لەساڵی ١٩٦٢دا بلاوبووەوە.

دیارترین خەسڵەتی فرۆست تاکپەروەری بوو. هەموو جۆرە ( وابەستەکییەکی دەستە جەمی) رەتدەکردەوە. باوەری وابوو کە لەژیانی شیعریشا وەکو ژیانەکانی دیکە(( دارودەستە، تاقم تاقمێنەو رەوتی جیاواز هەیە. لەوەیە چ رێگەیەکی دیکە نەبێ و هەر کەسەو دەبێ سەر بە تاقم و گروپێك بێ، لێ ئەز گورگی تەنیام)) .
روبەرت فرۆست لە ١٩٦٣/١/٢٩دا کۆچی دوایی کرد...

## ٣١- عەزرا پاوەند

١٨٨٥-١٩٧٢

لــە ١٨٨٥/١٠/٣٠دا لــە شــارێکی ســنوریی ویلایــەتی ئایــداهۆ هاتووەتــە دنیاوە.خوێندنی لە زانستگەی پەنسیلڤانیا، کۆلیجی هامیلتۆن تەواو کردووە.یەکەم کتێبی شیعری لە ساڵی١٩٠٨دا لە ڤینیس بڵاوکردەوەو لەم ساڵە بەدوواوە پتر لە نەوەت کتێبی بڵاوکردووەتەوە. ئەم بەرهەمانە دیوانانی شیعر، رەخنەی ئەدەب، وەرگێرانیان لە خۆ گرتووە.بەتایبەتی وەرگێرانی شیعر. لەساڵانی سەرەتاکانی ١٩٢٠دا پاوەندی نۆلاو سەرەتا لە لەندەن و پاشان لە پاریس دەژیا.پاشان رۆیی بۆ شاری راپالوی ئیتاڵیاو لە زەمانی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەمدا لەم شارەدا دەژیا. لەم قۆناغەدا پاوەندی نۆلاو بۆ چەند ساڵێك سەرنووسەی بەشی دەرەوەی گۆڤاری ( پۆیتری)بوو.

ساڵانێك سیستەمی دراوی و فاکتەرەکاریگەرەکانی سەر ئەو سیستەمە، زەین وهۆش وگۆشی پاەندی تەواو مژولکردبوو، ئەو سیستەمەی کە بەنۆرینی وی بربرەی پشتی سیستەمی کۆمەڵایەتی هەر کۆمەڵگەیەکە. بە درێژایی جەنگی دووەمی جیهانی، پاوەند لە ئیتاڵیادا دەژیاو لە رادیۆی ئیتاڵیاوە گەلێك گوتاری لەعەلەیی دەوڵەتی ئەمریکا، بەدەنگی خۆی بڵاوکردەوە.گوتارەکانی بەشێوەیەکی گشتی دژی بەشداربوونی ئەمریکا لە جەنگ بوو.. یەکێك لە پەڵە رەشەکانی مێژووی ئەمریکا،تەرزی رەفتاری ئەمریکا بوو لە گەڵ پاوەندا کە لە بەهاری ساڵی ١٩٤٥دا دەستگیریان کردو خستیانە زندانەوە.

زندانەکەی لە شاری پیزای ئیتاڵیا بوو ،زندانی( مەڵبەندی پەروەردەو فێرکردنی زەبت و رەبت) کە دەوڵەتی ئەمریکا بەرێوەی دەبرد، زندانەکەی قەفەزێکی ئاسن بوو ،ناوەکەیان بە قسڵ و چەوفەرش کردبوو،لە ژوورەکەیدا تەنیا یەك-دوو پەتۆ هەبوو کە بۆ خەوتن بەکاری دێنا و قوتویەکی تەنەکەشیان بۆ دانابوو کە لەجیاتی ئاودەست بەکاری دێنا، گڵۆپێکیش بە بنمیچکەیەوە هەڵواسرابوو، شەوو رۆژ بەسەر سەرییەوە دەسووتا.پاوەند تەنیا سێ هەفتە لەم قەفەسەدا بەرگەی گرت و نەخۆشی( بێخەوی)و(ترس لە شوێنی تەنگ) هەراسانیانکرد.پاش ئەوە شوێنەکەیان گۆری و بۆ ماوەی شەش مانگ لە ژوورێکی ئینفرادی دیکەدا زندانیان کرد لەم ماوەیەدا چەندین جار تووشی نەخۆشی وترسی لەرادەبەدەر بوو.پاش تەواو بوونی (پەروەردەو فێربوونی زەبت ورەبت) بۆ واشنگتۆن- یان ناردو بەتاوانی خیانەت

دادگاییان کردو لە ئەنجامدا بیٚ تاوان دەرچوو.پاشان بۆ ماوەی چواردە مانگ لە خەستەخانەی سەنت ئیلیزابت کەوت،پاوند لەساڵی ١٩٥٨ بەدوواوە دووبارە بۆ ئیتاڵیا گەرایەوەو لەگەڵ کیژەکەیدا ژیا.گرنگترین کاری شیعری پاوەند زنجیرە شیعری (سروودەکان)ە کە زنجیرەی یەکەمی لە ساڵی ١٩١٧داو دووا زنجیرەی (ئاسمانی سێیەم) ل ساڵی ١٩٥٩دا بلاەبووەوە، شیعرە کورتەکانیشی لە کۆمەڵەی (کەسایتییەکان)دا کۆکراونەتەوە.یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢٦دا بلاو بووەوە پاشان بە هەندیٚ شیعری تازەوە لەساڵی ١٩٥٠دا دووبارە چاپکرایەوە. پاوەند لەساڵی ٩٦٢دا دەفتەری شیعری (شیعریٚن ئاشقانەی میسری کۆن)ی وەرگیٚرایە سەر زمانی ئینگلیزی. پاوەند لەساڵی ١٩٦٣دابە هاوکاری(مارسلاسپان)گوڵبژیٚریٚکی شیعری بەناوی (لەکۆنفۆشیۆسەوە تاکامینگز)لاو کردەوە...

## ٣٢- خورخه لویس بۆرخیس

١٨٩٩-١٩٨٦

بۆرخیس له ١٨٩٩/٨/٢٤دا له ئەرجەنتین له دایکبووه.سەردەمی منداڵییەتی له سویسراو ئەسپانیادا بەسەربردووه.له جەنگی یەکەمی جیهانیدا که قوتابی زانکۆ بوو، له سویسرا بووه.پاش جەنگ بۆ ئەرجەنتینی زێدی خۆی گەرایەوه و سەنگینترین گۆڤاری ئەدەبیی ئەو زەمانەی بە ناوی (سور) دامەزراندو دەستی بە نووسین کرد.

بەرهەمێکی یەجگار زۆری نووسیوە کە ئەمە ناوی هەندێکیانە: ئەفسانان-١٩٦٢، هەزار توێیان-١٩٦٢، پڵینگانی خەون-١٩٦٤، شەڕی شەخسی-١٩٦٧،ئەلیف و چیرۆکێن ون-١٩٣٣-١٩٦٩، ١٩٧٠ .. راپۆری دکتۆر برۆدی-١٩٧١، هۆزانێن هەڵبژاردەی سالآنی ١٩٢٣-١٩٦٧، ١٩٧٢... بەتێپەربوونی سالآنی دوورو درێژ چاوەکانی کز بوون و تا لەساڵی ١٩٥٥دا کوێر بوو و چیترنەیتوانی لەسەر کاری مامۆستایەتی لە زانستگەی بۆینس ئایرس بەردەوام بێ. لەم زانستگەیەدا مامۆستای زمانی ئینگلیزی و ئەدەبیاتی ئەمریکا بوو.لەمە بەدوواوە ناچاربوو پەنا وەبەر سکرتێرەکەی ببات و هەر نووسینێکی بویێ بۆ ئەوی رەتبکاتەوە تا بۆی بنووسێت.دکتۆر بۆرخیس سالآنی ١٩٦٧-١٩٦٨ ی لە زانستگەی هارڤەرد بەسەر بردو مامۆستای کورسی شیعری چارلز ئیلیۆت نورتون بوو. لەساڵی ١٩٥٥وە تا ساڵی١٩٧٣ سەرۆکی کتێبخانەی میللی ئەرجەنتین بوو.لە ساڵی ١٩٦٢دا بەشەریکی لەگەڵ سامۆئیل پیکیت دا (خەلآتی نێونەتەوەیی بلأوەخانەی پریکس) یان وەرگرت. بۆرخیس جگە لەم خەلآتە ئەم خەلآتە ئەدەبیانەشی وەرگرتووەو ئەندامی فەخری ئەو ئەنجومەنانەش بووە کە ناویان دەبەین: خەلآتی ئەدەبی کیشوەری ئەمریکا-١٩٧٠، خەلآتی کتێبی ئۆرشەلیم، ئەندامی فەخری ئەکادیمیای ئەدەبیات و هونەری ئەمریکا،وئەندامی ئەنیستیتۆی میللی ئەدەبیات وهونەر، و دواجار هەردوو زانستگەی ئۆکسفۆرد و کۆلۆمبیا دکتۆرای فەخری ئەدەبیاتیان دایێ.

بۆرخیس وهاوسەرەکەی خاتو ئیلزا ئستیت دوئالباراسین، کە لە ساڵی ١٩٦٧دا زەماوەندیان کردووە، لە شاری بۆینس ئایرسدا دەژیان. لە ساڵی ١٩٨٦دا لە ئەوروپا کۆچی دوایی کرد..

## ٣٣-جۆرج سیمینون

١٩٠٣-١٩٨٥

ئاندریـه جیـد کـه لـه ئـاخرو ئـۆخری تەمەنیـدا خـەریکی لێکۆڵینەوەیـەك بـوو دەربـارەی بەرهەمـەکانی سـیمینون گووتوویـەتی: ((رەنگـە گـەورەترین رۆماننووسـی فەرەنسا بێ))

سیمینون یەکـەم رۆمـانی (پـردی هـەیڤۆك شـێوە))ی لـە تەمـەنی هەڤـدە سـاڵی دا نووسـی. ئـەم رۆمانـەی لـە زەرفـی دە رۆژدا تـەواو کـرد و بەمـەش بـەردی بناغـەی رۆماننووسی بۆ خۆی دانا،نووسینێك کە خێرایی بوو بەشـەقڵی تایبـەتی، سیمینۆن بە شازدە ناوی خوازراوەوە دەستی بەنووسینی رۆمانی هەمـەجۆری بازاری و مۆدی رۆژ کرد.ناوی خوازراوی وەك: کریستینبرولز، گومگوت... سیمینون دەیویست بە نووسینی ئەم جۆرە رۆمانانە شارەزایی و ئەزموون لە کاری نووسیندا بەدەست بێنێ و خۆی بۆ کاری جددی ئامادە بکات، یەکێك لەو رۆمانانەی بە ٢٥ سـەعات نووسـی-هەڵبەتە سەردەمی ئەم جۆرە رۆمانانەی کورت بوو.چونکە دوای ماوەیـەکی زۆر کـەم دەستی بە نووسینی رۆمانێك کرد، کـە سنوری جیاکـەرەوەی نێوان رۆمـانێن بازاری وجدی بوو.کۆمەڵە بەرهەمێکی نووسی کە قارەمانانی سـەرەکییان پۆلیسی نهێنییـە. واتـە رۆمانـانی پۆلیسـی ، سـەردەمی رۆمانـانی پۆلیسیشـی زۆر درێـژ نـەبوو. ئیـدی سـیمینون رووی کـردە رۆمـانی سـایکۆلۆژی ،ئـەم رۆمانانـەی بـەزۆری لـە دووسـەد لاپەرەیـەك کـەمتر بـوون وخوێنـەرانێکی یـەجگار زۆریـان هـەبوو.سـیمینون پـتر لـە ٧٥رۆمانی لەم جۆرەی نووسیوە.

سـیمینون ئەگەرچـی جارجـار رۆمـانی پۆلیسـی دەنووسـی، بـەڵام ژیـانی خـۆی وەقفـی رۆمـانی جـدی کردبـوو. ئـەو رۆمانانـەی کـە سـیمینون بـە زمـانی فەرەنسـی دەینووسین،نەك هەر بەجۆرێکی بەربڵاو وەرگێردراونەتە سـەر زمـانی دیکە،بـەڵکو بـێ پرسی خۆی بۆ شانۆو سینەماو تەلەفزیۆنیش ئامادە کـراون.گەلـەك لـە بەرهەمـەکانی سیمینون کراون بە ئینگلیزی ،ئەمە ناوی هەندێکیانە: دڵی مرۆڤێك، پەڵەیـەکی سـەر بەفر، دادگایی بی بی دونگ، برایانی ریکۆ، و بلیتی مادونی..

سـیمنون پـتر لـە سـەدو پـەنجا رۆمـانی بـەناوی خـۆی و سێسـەد وپـەنجا رۆمـانی بەناوی خوازراوەوە بڵاو کردووەتەوە.

سیمینون له ساڵی ۱۹۰۳دا له بەلچیکا هاتووەتە دنیاوە،نیوەی تەمەنی لە فەرەنسا بەسەربردووەو له ساڵی ۱۹٤٥وەچووە بۆ ئەمریکاو له ساڵی ۱۹۸٥دا مردووە..

## ٣٤- ويليام فاكنەر

١٨٩٧-١٩٦٤

له ساڵی ١٨٩٧دا له نیوئالبانیی ویلایەتی می سی سی پی هاتووەته دنیاوە،کە فاکنەر له دایك بوو بابی بەڕێوەبەری تۆڕێکی ئاسن بوو کە باپیرەی باوکی سەرهەنگ ویلیام فاکنەر، دایمەزراند بوو- سەرهەنگ ویلیام فاکنەر شاعیرش بوو و کتێبێکی شیعری پڕ فرۆشی بە ناوی (( گوڵی سپی مەمفیس)) بڵاو کردبووەوە_ویلیام فاکنەر هێشتا منداڵ بوو کە خانەوادەکەی باریان کرد بۆشاری ئۆکسفۆرد، ئەم شارە ٣٥میل له زێدی ویلیام فاکنەرەوە دوور بوو. فاکنەری جەوان لەم شارەدا چووە بەر خوێندن، ئەگەرچی تامەزرۆی خوێندن بوو و کتێبی زۆری دەخوێندەوە، بەلاّم چونکە نەیتوانی نمرەی تەواو بێنیّ نەیتوانی دبلۆمی ئامادەیی وەربگرێت و ناچار خوێندنی تەرککرد.له ساڵی ٩١٨دا پەیوەندی بە هێزی ئاسمانی پاشایەتی کاناداوە کرد.پاش ئەوەی لە هێزی ئاسمانی کانادا هاتە دەریّ،و چونکە لە جەنگی یەکەمی جیهانی بەشداری کردبوو،و دەیتوانی سوود له ئیمتیازاتی تایبەتی ئەو بەشدارییە وەربگریّ، بۆیە بەبیّ کارنامەی دبلۆمی ئامادەیی لە زانستگە وەرگیرا.هەمووی ساڵێك لە زانستگە نەمایەوە وازی لێهێناو پاشان بوو بە بەڕێوەبەری دایەرەی پۆستەی زانستگەی می سی سی پی. زۆری نەبرد کە ئەم کارەشی لە دەست دا ،چونکە لە کاتی دەوامدا کتێبی دەخوێندەوە.لە ساڵی ١٩٢٦دابەهاندان و کۆمەکی شروود ئەندرسن، رۆمانی (مزی سەربازِ)ی نووسی. (پەناگە) یەکەمین رۆمانی بوو کە هەم شۆرەتی پیّ بەخشی و هەم فرۆشی باش بوو.ئەم رۆمانەی کە رۆمانی سەرکێشی بوو، بۆ وەدەست هێنانی پارە نووسی.بەرهەمەکانی پێشووتری لەرووی فرۆشەوە رەواجێکی ئەوتۆیان نەبوو کە بتوانیّ بە دەرامەتەکەی ژیانی خۆی بەڕێوەبەریّ. ئەم بەرهەمانەی بەپێی ریزی بڵاوبوونەوەیان بریتی بوون لە:پێشکەکان-١٩٢٧، سارتوریس-١٩٢٩، هەراو هەنگامەو تورەیی-١٩٢٩،وەکو چۆن کە دەمرم-١٩٣٠

فاکنەر لە ساڵی ١٩٣٠بەدواوە بەردەوام رۆمانیەلێکی نووسیوە کە رووداوی زۆربەیان لە لەسەر زەمینی ئایدیالی نوسەرەوە،یوکناپاتاوفادا روودەدەن. ئەم بەرهەمانە بە گوێرەی ریزی بڵاوبوونەوەیان بریتین لە:روناکی لە ئابدا-١٩٣٢،بورجی چاودێری- ١٩٣٥، ئەبسالم ئەبسالم-١٩٣٦، لەگرتن نەهاتووە-١٩٣٨ ، دارخورمایانی کێوی-١٩٣٩، گوند-١٩٤٠،و موسا وەرەخواریّ-١٩٤٠..

لە دوای جەنگی دووەمەوە کارە سەرەکییەکانی فاکنەر ئەمانەن: ملۆزمێك لە غوباردا-١٩٤٨،حیکایەتێك-١٩٥٤، شار-١٩٥٧، تالآنکەران-١٩٦٤.

ویلیام فاکنەر زۆر خەلآتی ئەدەبی وەرگرتووە لەوانە: خەلآتی میللی ئەمریکا-دووجار ئەم خەلاتەی وەرگرتووە، لە ساڵی ١٩٥١دا لەسەر کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت و لە ساڵی ١٩٥٥دا لە سەر حیکیەتێك و لە ساڵی ١٩٤٩دا خەلآتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت...

## ٣٥- جان دۆس پاسۆس
١٨٩٦-١٩٧٠

پاسۆس لە ١٨٩٦/١/١٤دا لەدایك بووە.سەردەمی منداڵییەتی لە شاری شیکاگۆ بەسەر بردووە.خوێندنی لە کۆلیجی چوت ولە زانستگەی هارڤەرد تەواو کردووە.لە ساڵی ١٩١٦دا بە مەبەستی تەواو کردنی خوێندن لە واری تەلارکاریدا چوو بۆ ئەسپانیا، بەڵام یەکەمین جەنگی جیهانی هەڵگیرساو ناچاربوو خوێندنەکەی بە نیوە چڵی بەجێبێڵێ وپەیوەندی بە( نەخۆشخانەی مەیدانی فەرەنسییەکانەوە)بکات.ئەزموونی جەنگ بوو بە هەوێنی یەکەمین رۆمانی ( سەرەتای ژیانی پیاوێك-١٩١٧) ئەم رۆمانە لە ساڵی ١٩٢٠دا بلاو بووەوە.پاش ئەوە د وو رۆمانی دیکەی بەناوی ( سێ سەرباز-١٩٢١،و مەنهەتن ترەنسفیر-١٩٢٥) نووسی. لە رۆمانی( مەنهەتن ترەنسفیر)دا تەکنیکێکی تازەی دارشت کە لە رۆمانی دواتریدا(U.S.A) گەیاندییە لوتکە.پاش رۆمانی(U.S.A) سێ شانۆنامەی نووسی کە لە هەرسێکیاندا سوودی لە تەکنیکی سینەمایی وەرگرت وهەر بەم تەکنیکەش بەناو بانگن.ئەم سێ شانۆنامەیە بەپێی ریزی بلاوبوونە وەیان بریتین لە:( هەیڤ زەنگێکە-١٩٢٦، هێڵی ئاسمانی-١٩٢٨، بەرزاییەکانی بەخت-١٩٣٣) لە سیانییە بەناوبانگەکەی خۆیدا( U.S.A)دا تەکنیکێکی دارشت وبەکارهێناکە ( بەچاوی کامیرایی و خەبەری رۆژنامەوانی) ناسراوە. تایبەتمەندی ئەم شێوە چیرۆکنووسینە ئەمەیە کە سەدان کاراکتەر لە خۆ دەگرێت، ئەو رووداو و دیمەنانە وەسف دەکات کە لە گۆڕانی بەردەوامدان ودەکەوێتە تۆژینەوەی مێژووی کۆمەڵایەتی بەربلاوی ژینگەی چیرۆکەکە.دوورۆمانی دیکەی سیانەی (U.S.A)بریتین لە: (مەداری چل ودووەم-١٩٣٠،و پارەی زۆر-١٩٣٦)

( دەڤەری کۆلۆمبیا-١٩٥٢) دووەم سیانەی دۆس پاسۆسە.پاسۆس لەم زنجیرەیەدا بە پێچەوانەی U.S.A بەرەڤانی لە سیستەمی سەرمایەداری ئازاد دەکات.پاسۆس پاش( دەڤەری کۆلۆمبیا) ئەم بەرهەمانەی نووسیوە: (مەسەلە ئازادییە-١٩٥٦،رۆژانی مەزن-١٩٥٨، نیوەی قەرن-١٩٦١، شەڕی مستەر ویڵسۆن-١٩٦٣ و پێگەو نارەزایی-١٩٦٤،ودووا بەرهەمی دۆس پاسۆس(باشترین رۆژان-١٩٦٦)ە کە باسی بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵییەتی خۆیەتی.

گەرچی دۆس پاسۆس لە تەمەنی لاویدا زۆر بزێو بوو و هەمیشە لە گەشت و گەراندابووە، لێ لەنیوەی دووەمی تەمەنیدا، ژیانێکی سادەو ئارامی لە (کیپ کۆد)

**بۆخـۆی هەڵبـژاردووە. خـۆی و هاوسـەرەکەی بـۆ ئـەم مەزرایـەی بـابی لـە ڤیرجینیـا باریـانکرد و تـا سـاڵی ١٩٧٠،کـە کۆچـی دوایـی کـرد لـە هـەمان مـەزرادا ژیـانی بەسەربرد....**

## ٣٦- هنری رینێ ئالبیرت گی دومۆپاسان

١٨٥٠ -١٨٩٣

ناوی مۆپاسان هاوتای چیرۆکنووسییه.له ساڵی ١٨٥٠دا له نۆرماندی ی فەرەنسا هاتووەته دنیاوە. تەمەنی شەش ساڵان بوو کە باب داکی لێکدی جیابوونەوەو مۆپاسان لای دایکی مایەوە،لە سیازدە ساڵیدا چووە یەکێك لە قوتابخانە کاتۆلیکییەکان زۆری پێنەچوو دەرکرا.پاشان چووە قوتابخانەیەکی دیکەو لەوێندەر بەبۆنەی شیعر گوتنەوە خەلاتێکی وەرگرت.شەڕی فەرەنساو پروس لە ساڵی ١٨٧٠دا هەڵوەستەیەکی لە ژیانی ئەدەبی مۆپاسانا دروستکرد.پاش شەڕ چوو بۆ پاریس تا لەوێندەر کارێکی دەوڵەتیی بدۆزێتەوەو لە کاتی دەستبەتڵیدا خەریکی شیعر نووسین بێ.لە پاریسدا و لە ژێر چاودێری مامۆستای پەخشانی فەرەنسیدا، گۆستاف فلۆبیردا کەوتە مەشقکرنی نووسین. زۆری نەبرد دۆستایەتییەکی بەتین کەوتە نێوان ئەم دوو پیاوەوە. فلۆبیر کە هەستی کردبوو مۆپاسان بەهرەی شاراوەی هەیە، هانیدا کە روو بکاتە جیهانی پەخشان و ساڵانێکی زۆر لەگەڵی خەریك بوو کە هونەری نووسینی فێربکات.

مۆپاسان زۆر شت لە مامۆستاکەیەوە فێر بوو کە یەکەمین دەرس (هونەری دیتن) بوو. فلۆبیر پێی دەگووت: (( هونەری دیتن بەسەبرو حەوسەڵەی درێژ بەدەست دێ.لە هەر شتێکا پاژێکی نەدۆزراوەو پەنهان هەیە.ئێمە چاوی خۆمان بەوە راهێناوە کە تەنیا ئەو شتانە بدینێ کە خەڵکان لە پێش ئێمەدا دیتوویانە.. تەنانەت لە بچوکترین شتدا شتێکی نەناسراو هەیە.دەبێ ئەو شتە بدۆزرێتەوە.))

بەمجۆرە مۆپاسان لەوە گەیی کە لەهەر تاکێکدا یا شتێکدا نهێنییەك هەیە کە ئەو تاکە یا ئەو شتە لە تاك و شتەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.مۆپاسان لە شوێنێکی دیدا بەزمانی فلۆبیرەوە گووتوویەتی: ((بۆ دەربرینی هەر شتێك کەبتەوێ بیڵێی تەنیا یەك وشە هەیە بۆ وەسفی ئەو شتە،دەبێ ئەو وشەیە ، ئەو وەسفە بدۆزرێتەوە. نابێ بە تەقریبییەت وازبهێنرێ..نابێ پەنا وەبەر تەزویر ، گەر هوشیارنەش بێ ببرێ.. بۆ لابردنی دژوارییان نابێ سوود لەتەڕدەستی زارەکی وەربگیردرێ))

مۆپاسان ساڵ بەساڵ هەوڵیدەدا سوود لە بۆچوونەکانی مامۆستا وەربگرێ. هەموو هەفتەیەك رەشنووسی مەشقەکانی خۆی بۆ دەناردو وبەخۆیشی یەك شەممەی دواتر دەچوو بۆ ماڵی ئەو تا هەم نانی نیوەرۆ لەوێ بخوات و هەم گوێی لە رەخنەکانی ببێ.

مۆپاسان لە ئاخرو ئۆخری دەیەی هەفتایەکانی سەدەی نۆزدەدا پەیوەندی لەگەڵ(یارانی میدان)دا پەیدا کرد، ئەم گروپە خۆیان بە ناتۆرالیست دەزانی و دڵبەندی رۆمانەکانی زۆلا بوون ( میدان ،گوندێکی نزیکی پاریس بوو، کە زۆلا و یارانی لە ماڵی ئەوێندەر کۆدەبوونەوەو یەکیان دەبینی). کاتێ ئەم گروپە لێبڕان بلاًڤۆکێك بەناوی (زەردەپەری میدان) بلاًو بکەنەوە کە لە ناوەرۆکدا سەبارەت بەشەڕی فەرەنساو پروس بێ، مۆپاسانیش لەوێندەر چیرۆکێکی دەربارەی سۆزانییەك خوێندەوە. ئەوانی دی کە هیچیان لەمەڕ دۆستایەتی فلۆبێر و مۆپاسان نەدەزانی، بە تواناو بەهرەی مۆپاسان سەرسام بوون. زۆلا سەلماندی کە چیرۆکەکەی مۆپاسان لە چیرۆکەکەی ئەو باشترە.ئیدی ( یارانی میدان) چیرۆکەکەی مۆپاسانی بە باشترین چیرۆکی ئەو کۆمەڵە دانا.

لەم سەرکەوتنە بەدوواوە مۆپاسان وازی لە کاری دەوڵەتیی هێناو بەرەبەرە لە زولا و یارانی میدان دوور کەوتەوە. تواناو بەهرەی خۆی خستە خزمەتی نووسینەوەو لە ماوەی یازدە ساڵدا دەیان گوتارو نزیکەی سێسەد چیرۆکی کورت و شەش رۆمانی نووسی و لە رووی ژیانی کۆمەلاًیەتیشەوە نیگەران بوو.. هەندێ لە رەخنە گران گوتوویانە کە مۆپاسان چاودێرێکە تەنیا لە بواری وێنەگرتنی رواڵەتی ژیاندا بە توانا بووەو نەیتوانیوە واقیعە پەنهانەکان ببینێ.لێ ریتمی خێرای چیرۆکەکانی بەشێوەیەکی جوان کۆتاییان دێ و وێنەیەکی تانە ئامێزی ئەزموونی ژیانی مرۆڤانی بەدەستەوە دەدا.

چیرۆکی کورت تا ئەمرۆش لە فەرەنسادا پێگەیەکی ئەوتۆی نییە،رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بووبێ کە مۆپاسان لە بواری رۆمانیشدا خۆی تاقیکردبێتەوەو ئەو رۆمانانەی( ژیانێك-١٨٨٣، بلئومی-١٨٨٥، پیروجان-١٨٨٨، دڵی مرۆڤ-١٨٩٠) نوسیبێ، گەرچی رۆمانەکانی بایەخی خۆیان هەیە، بەلاًم تواناو بەهرەی مۆپاسانیان گومڕا کردو مەبەستیان نەپێکا. ئەمرۆ گەرچی پتر لە سەدەیەك ەبسەر مەرگی مۆپاساندا رەتدەبێ، بەلاًم هێشتاش چیرۆکەکانی و بۆچوونەکانی لەمەڕ چیرۆك بایەخی خۆیان پاراستووە .لەگەڵ ئەمەشدا، سادەیی رواڵەتی نووسین و نەبوونی ئالۆزی لە تەکنیکی چیرۆکە کورتەکانیا کاردانەوەیەکی رۆشنبیرانەی لای خوێنەران- بەتایبەتی لە فەرەنسا- دروستکردووە، زیاتر بە سنعەتکارێکی رووتی دەزانن تابە هونەرمەندێکی مەزن.

بـەڵام مۆپاسـان هەمیشـە وەكـو یـەكێك لـە چیرۆكنووسـە دیارەكـانی هـەموو رۆژگارەكان دەمێنێتەوە...

## ٣٧- تۆماس مان

١٩٥٥-١٨٧٥

له ساڵی ١٨٧٥دا له لۆبیل ی ئەڵمانیادا هاتووەتە دنیاوە. ئەم پیاوە زۆر زۆر زو خووی دایە نووسین وهەرکە وازی لە قوتابخانە هێنا ئیدی بەتەواوەتی خۆی بۆ ئەدەبیات تەرخان کرد.لە هەژدە ساڵیدا رووی کردە ولاّتی ئیتاڵیا و لەوێندەر یەکەم رۆمانی پڕ بایەخی بەناوی ( ماڵباتی بودین برووك)ەوە نووسی و لە ساڵی ١٩٠١دا لە ئەڵمانیا بلاّوبووەوە. تۆماس مان لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا و لەگەڵ بلاّوبوونەوەی ئەو رۆمانەدا شۆرەتی پەیدا کرد.(ماڵباتی بودین برووك) ، بڕانەوەی ماڵباتێکی بۆرژوا بە درێژایی سێ نەوە نیشاندەدا. نەخشەو پلۆتی میتافیزیکی ئەم رۆمانە، کە تیایدا( زەین) وەکو دژمنی (ژیان) بەرجەستە دەکرێ. گۆانکارییەکانی کۆمەڵگەی برجوازی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا دەنوێنێ. چاپکرنی ئەم کتێبە بەدەستوری هیتلەر لە ئەڵمانیادا قەدەغە کرا. ( ماڵباتی بودین برووك)کە تەرجەمەی زۆربەی هەرە زۆری زمانانی دنیا کراوە،ناکۆکی نێوان هونەر وژیان دەنوێنێ و باس دەکات.تۆماس مان ، لە سایەی کاریگەری هزروبیری شۆپنهاوەردا باوەری وابوو، کە زەین وخەیاڵ دژمنی سەرسەختی ژیانە و ئەم بابەتە لە بەرهەمەکانی سەرەتایدا بەرونی دیارە. هەندێ لە رەخنە گران کورتە چیرۆکەکانی تۆماس مان بە چاکترین بەرهەمی وی دەزانن.( مەرگ لە ڤینیس، مارێو و جادووگەر، تامپۆنی قیتار) بەشاکار وی لەم بوارەدا دەزانن. تۆماس مان لە چیرۆکە کورتەکانی خۆیدا گەندەڵی ئەخلاقی ئەورووپای نێوان هەردوو جەنگی جیهانی دەنوێنێتەوە. تۆماس مان لە چیرۆکی( مەرگ لە ڤینیس)دا پێگەی هونەرمەندی نوێخواز نیشاندەدات و ئەوە ساغ دەکاتەوە، کە هەوڵی ئاشتی لە نێوان ئەخلاق و ئەستاتیکادا شکست دێنێ. لە چیرۆکی ( مارێو وجادووگەر)دا نارەزایی خۆی لە هەنبەر فاشیزم ئاشکرا دەکات.

تۆماس مان لە ساڵی ١٩٢٧دا( رۆمانی کێوی جادوو)ی بلاّو کردەوە.رووداوەکانی ئەم رۆمانە ساڵانی ١٩٠٧-١٩١٤ی ناو ئاسایشگەیەکی گرتووەتە خۆ و بە شاکاری تۆماس مان دێتە ژمادرن.مان، لەساڵی ١٩٢٩دا خەلاّتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەرگرت. لە ساڵی ٩٣٣دا بۆ وتنەوەی چەند محازەرەیەك سەفەری دەرێی ئەڵمانی کرد و لە راستیدا سەرهەڵدانی فاشیزم ناچاری کردبوو سەری خۆی هەڵگرێ و روو بکاتە هەندەران. سەرەتا چوو بۆ سویسراو پاشان بۆ ئەمریکا.لە کالیفۆرنیا ئاکنجی بوو و ماڵەکەی بوو بەجۆرە

دیوەخانێك. پاش تەواو بوونی جەنگ گەرایەوە بۆسویسراو تا کۆتایی تەمەنی هەر لەوێندەر مایەوە. مان، بەر لەوەی فاشیزم دەسەلاتی ئەڵمانیا بگرێتە دەست، باوەری وابوو کە دەبێ هونەرمەند بایەخ بە مەسەلەو پرسێن مانەوەی بدات و خۆی لە سیاسەت دوور بگرێ.. بەلام کە فاشیزم دەسەلاتی گرتە دەست ئیدی راو بۆچوونی گۆراو چالاکانە کەوتە سیاسەت کردن.و کەوتە بەرەڤانی لە ژیانی ئازادو جدی.. نامەیەکی کراوەی بۆ زانستگەی بۆن ناردو بە فەرمی پەیوەندی خۆی لە گەڵ ئەڵمانیای هیتلەریدا بری. رژێمی نازی موڵك ومالەکەی مسادەرەکردو کتێبەکانی سوتاندو ناسنامەی ئەڵمانی لێ سەندەوە، مان بەدرێژایی دووەمین جەنگی جیهانی وەکو نوێنەری ئەڵمانیا( ئیجابی) ناسراو بە گوتارو پەیامە رادێوییە بێ شومارەکانی دژی ئەڵمانیای نازی وەستایەوە.لە ساڵی ١٩٣٨دا یەکەم گوتاری سیاسی وهەرەشە ئامێز خۆی دژی هیتلەر لە رادێوە بلاوکردەوە.لە ساڵی ١٩٣٩دا رۆمانە چوار بەشییەکەی بەناوی( یوسف وبراکانی) تەواو کرد. بەرگی یەکەم و دووەمی ئەم رۆمانە لە بەرلین، بەرگی سێیەم لە ڤێننا وبەرگی چوارەم لە ستۆکهۆلم بلاو بووەوە .مان لەم رۆمانەدا باسی پەیوەندی نێوان زەمان وئەفسانە دەکات و ئەفسانەگەرایی رەگەزپەرستانەی نازییەکان ریسواو مەحکوم دەکات.مان( دکتۆر فاوستۆس)ی لە ساڵی ١٩٤٧دا چاپکرد.رەخنەگران ئەم

بەرهەمە بە جۆرە شکستێك بۆ مان دەزانن. تۆماس مانی رەوانبێژو گوتاربێژی بە تواناو تەنز نووسی بێوێنە و چیرۆکنووسی لێهاتوو لە پایزی ساڵی ١٩٥٥دا لە شاری زیوریخ کۆچی دوایی کرد..

## ٣٨- ویلیام سۆمرست موام

١٨٧٤-١٩٦٥

هیچ نووسەرێك بەخێرایی موام، لە لوتکەی شۆرەتەوە بەرەو خوار ڕانەخوشیوە! ماوەیەکی زۆر بەسەر مەرگیدا نەبوری بوو،کە هاونشین ویارانی ، ژیانی تایبەتی ئەویان، کە خۆی بە درێژایی ژیانی خۆی سەرکەوتوانە پەنهانی کردبوو،ئاوەرووت کردو خستیانە ئەو گۆرە.هەتیو بازییەکانی موام،رەفتاری دڵرەقانەی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا،شکستی ئەو لە ڕووبەڕووبوونەوەی شایستەی سەرکەوتنی لە ڕادەبەدەری، هەر هەمووی خرایە بەر زەڕەبین وناو وناوبانکی وەکو نووسەرێکی جدی، بەخێراییەکی سەیر رووی کردە ئاوابوون.گەلەك لە نووسینەکانی وەکو نووسینی بێ ئیحتوبار،کەمبایەخ و داخراو خرانە بەر بای رەخنەو ئیراد گرتن و بە خۆ کاوێژکردنەوەو دووبارە کردنەوەی نابەجێ مەحکوم کرا.ئیدی لێشاوی پەردە لەسەر هەڵماڵینی دەستی پێکردو بەوە تاوانبارکرا، کە چیرۆکەکانی لەسەر بناغەی ئەزموونێن شەخسی رۆنەنرابوون، بەڵکو لەسەر بناغەی رووداو وسەربورو فشە واریقاتی دۆستەکانی ئەو رۆنرابوون.بەرهەمی وەکو: (دەمی گوێزان-١٩٤٤، بەری عومر-١٩٣٨) زادەی زەینێکی مامناوەندی بووە .وێرای ئەمەش هەندێ لەو زانیارییانەی ، کە دەربارەی خۆی بەیانی کردبوون، ڕاست بوون.مامی کە قەشەیەکی ویلایەتی کۆنت بوو ،ئەوی گەورە کردبوو .موام بەشی پزیشکی خوێندو بوو بە پزیشك، بەلاّم رووی کردە نووسەری.پاش ماوەیەك حەزی لە شانۆ کردو بە شانۆنامەی (خانم فردریك-١٩٠٧)سەرکەوتنی بەدەست هێنا. پاش ئەم سەرکەوتنە بوو کە دەرگای شۆرەت وخۆشگوزەرانی لێکرایەوە.و توانی بەئارەزووە دێرینەکەی خۆی ،کە سەفەرو سەردانی چین، مالایان و دوڕگەکانی ئۆقیانووسی گەورە بووبگات.ئەو شوێنانە پانتاییەکی زۆریان لە چیرۆکەکانی دا گرتووە.موام لە ویلایەتەکی خۆیا (کەپ فیرات)،بەلای خوێنەرانی ئینگلیزی و ئەمریکاییەوە،کە زۆریان ستایش دەکرد، بە نموونەی زندووی نووسەری سەرکەوتوو دەژمێردرا.

ز ۆربەی رۆمانەکانی کران بەفیلم و چەند رۆمانێکیشی بە پڕفرۆشترین رۆمان هاتنە ژماردن. لەو رۆمانانەی کە کاریگەری گەورەیان هەبوو(ئەسارەتی مرۆۋ١٩١٥) و(دەمی گوێزان)بوون.

بەهەرحاڵ، کورتە چیرۆکەکانی بە ناوبانگترن. سومرست موام دڵبەندی مۆپاسان بوو، ئەم دڵبەندییەش سوودی زۆری پێگەیاند.گەر شتێك لە پاش ویلیام سۆمرست

**مـوامی نووسـەری نـاوداری ئینگلیـزی لـە ژیانـدا و ریسـواو حەیاچوو ی پـاش مـرن، وەمێنـیٚ، رەنگـە چیرۆکە کورتـەکانی بیٚ نـەك رۆمانەکانی،کـە بابـەتی هـەر هـەموویان شکۆخوازییە...**

## ٣٩- ئیسماعیل گاداره

-١٩٣٦

((تۆ ئازادی کە پایەی مرۆڤانی خۆت بپارێزی یان لە دەستی بدەیت))

گـاداره لـه هـەموو بەرهەمەکانیدا،لـه هـەوڵی ئەوەدایـه کـه لـه ژیـان و ژینـی وڵاتەکـەی خـۆی نزیـك ببێتـەوەو تێـی بگـات.هـەر بەرهـەمێکی ئیسـماعیل گـاداره بـه جۆرێ لەگەڵ رابردوو و ئێستای ئەلبانیاو خەڵکی ئەلبانیادا ئاوێتـه بووه کـه لـه هـەر هەموویانـدا لـەپاڵ لایەنـه ئەدەبییەکـەدا، رەگێکـی مێـژوو و سیاسـەت و کۆمەڵناسـی وڕووداو تۆمـارکردن بـەدی دەکرێـت.کـاداره لـه رۆمـانی (ئـەپریلی شکسـتە)دا، ئـەو چـیرۆکەی کــه لــه ســەرەتاکانی ســەدەی بیســتەمدا روودەدات، دەمانباتــەوه بــۆ سەدەکانی ناوەراست، بۆ هەردە بەرزەکانی ئەلبانیا کە لەوێدا چیا نشینان هیشتا لە بازنەی داب ونەریتی لە گۆران نەهاتوودا دەخولێنەوەو هەرکەسێك لەو داب ونەریتە دەربچێت بۆ هەمیشە لە کۆمەڵ وەدەردەنرێت و ترۆ دەکرێت. بەرهەمی کاداره کراون بـه زمانـانی بێگانـەی وەکـو فەرەنسـی وفارسـی، لەوانـه: (تـەپڵی بـاران، شـاری بەردین،زستانی گەورە.. پردی سێکانی،سەرداری سوپا مردە، قەڵا، داوەت..)بەڵام ئیسماعیل کاداره کێیە، ئایە لەو نووسەرانەیە کە بتوانیٚ رۆژیٚ لەرۆژان خەڵاتی نۆبڵ وەربگریٚ؟

زۆر شـتی کـەمی دەربـاره دەزانـین.کـاداره بەردەسـت ناکـەویٚ، هـەرگیز لـەو شــوێنەدا نییــه کــه چــاوەروانین.دەربــارەی ئــەو وەکــو وڵاتەکــەی ، بێــدەنگی هەڵبـژێردراوە.هـەم کـادارەو هـەم وڵاتەکـەی لـه بەرانبـەر دنیـادا تـەنیاو تـەنیان. هـیچ ژیاننامەیــەکی ئــەومان نییە،ئــەم نووســەره کــه دەموچــاوێکی جــوانی لــه پشــت عەینەکێکی د ەسك سەدەفەوە هەیە کە دێتە فەرەنسا ئەوەندە لەویٚ نامێنێتەوە تا دەربـارەی رابرووی،مەبەسـتەکانی،زانیارییەکانی، کەشـف و هونـەرەکانی دەردەدڵ بکات و رازی دڵی خۆی هەڵرێـژیٚ.. ئەوەی دەربارەی کاداره دەیزانین ئەوەیە کە لە ساڵی ١٩٣٦دا لە گیرۆ کاستر لە دایك بووە. بابی پۆستە بەر بووە،خوێندنی باڵای لە زانکـۆی ئـەدەبیاتی تیرانـا و پاشـان لـه ئەنیسـتیتۆی گـۆرکی لـه مۆسـکۆ تـەواو کـردووە.دوای ئـەوەی پەیوەنـدی وڵاتەکـەی لەگـەڵ سـۆڤیەتدا پچـڕا، گەرایـەوه بـۆ ئـەلبانیا، لـه ئـەلبانیادا بەنووسـەرێکی رەسمـی دەژمێـردریٚ، نزیکـەی سـەدهەزار خوێنـەری هەیـە، ئەنـدامی یـەکێتی نووسـەرانی ئەلبانیایـەو نوێنـەری پەرلەمانـە لـە تیرانا و لەگەڵ ئەمەشدا ترسی لە دەربرینی بیرو باوەرو بۆچوونەکانی نییە.ئاوێتـەی

ڕووداوەکـانی ئەلبانیایـە. وڵاتەکـەی خـۆی خـۆش دەویٚ.پەیڤـداری میللەتێکـە کـە هەمیشە دژی داگیرکەر لەخەباتابووە.کادارە وەستای خواستن و کینایەیە،لە میانی شـێوازێکی سـادە، بـیٚ پـێچ وپـەنا،کورت وپوخـت، ووێنەگەلێکـەوە هەنـدیٚ جـار خەیاڵاوی و ورێنە ئامێزەو تا سنووری شێتی دەچێتە پێشـیٚ،تابلۆیەکی مێـژووی و کۆمەڵایەتی دەولەمەند وبەربلاو لەمەر ئەلبانیا دەکێشێت. کادارە هـەر لـە منداڵییـەوە حـەزی لـە خوێندنـەوەو نووسـەری بووەو لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: (( کـە دەسـاڵان بـووم مـەکبس–م دەخوێنـدەوە. شـەیدای حیکایـەتی رۆح و شـەبەنگان بـووم..)) لـە حەڤدە ساڵییەوە دەستی بە چاپکرنی شیعرەکانی کردووە.یەکەم رۆمانی لـە ساڵی ١٩٦٠دا کـە تەمـەنی ٢٤ سـاڵبوو، نووسـیوە،ئەم رۆمانـە هـەم لـە وڵاتەکـەی خۆیـدا و هـەم لـە رۆژئاوادا شۆرەتی پێداوە.کادارە لـە ساڵی ١٩٩٠دا داوای پەناهەنـدەیی سیاسـی لـە فەرەنسـا کـرد.ئـەم رووداوە لـەم رووەوە سـەیرە کـە کـادارە نـەك هـەر لەلایـەن رژێمـی وڵاتەکەیەوە راونەنراوە بەڵکو رژێم لـوتفی تایبـەتی دەرهـەقی هەبووە،نوێنـەر بـوو لـە پەرلەمان و ئەندامی یەکێتی نووسەران بوو.

بەقەولی خـۆی کتێبـەکانی لـە قوتابخانەکانـدا دەخوێنران،زۆربـەیان لـە ماوەیـەکی کورتـدا دەفرۆشـران ولـە بـازارا نـەدەمان وبـازاری رەشـیان پەیـدا دەکـرد ..کـە ئـەو پرسـیارەیەیان لێکـرد ئایـە رووبـەرووی ئـەم خەتـەرە نابێتـەوە کـە وەکـو زۆربـەی نووسـەانی ئـاوارەو دوورە وڵات، لــە سەرچـاوەی ئیلــهام و ســەرۆی خــۆی دوور بکەوێتـەوە؟ لـە وەڵامـا گـووتی: ((بـۆ نە،ئـەم خەتـەرە هەیـە ، لیٚ ئامـادەم تەنانـەت ئەدەبیاتیشی بکەمە قوربان..))

## ٤٠- گۆستاف فلۆبێر

١٨٢١-١٨٨٠

**مەدام بوڤاری**

((١))

**فلـۆبێر هــەر لــە منداڵییــەوە، واتــە لــە دە ســاڵییەوە حــەزی لــە ئــەدەبیات کـردووە.هەرچـەند مرۆڤێکـی بـە تـەوس و تـوانج بـوو ، بـەڵام وەکـو زۆربـەی کەسـانی توانجهاوێـژ لـە ناخـدا زۆر ناسـك بـووە.بـابی حـەزی نـەدەکرد خـوو بداتـە ئـەدەبیات ونووسـین، بـەڵکو حـەزی دەکـرد ببـێ بـە پزیشـك.لێ کـە قۆنـاغی خوێنـدنی ئامـادەیی تەواو کرد،ئیدی بە راشکاوی بە بابی گوت کە نایـەوێ ببـێ بە پزیشك.بـەڵام بـابی حـەزی دەکـرد کورەکەشـی وەکـو خـۆی ببـێ بـە جـەراحێکی بـە ناوبـانگ و لـە دنیـای ئایندە نادیـاری ئـەدەبیات دووری بخاتـەوە.چونکە ئـەدەبیات و کـاری ئـەدەبی بـەلاوە سـووك بـوو، وئـەوەتا لەوبارەیـەوە بـە راشـکاوی دەڵێـت: ((ئێمـەی ماڵبـاتی فلـۆبێر خانوادەیەکی موحتـەرەمین،نامانەوێ بەرەڵایان یا شاعیرانمان تێدا هەڵبکەوێ.))**

((٢))

**فلـۆبێر کەسـێکی لاسـارو گـلاراو بـووە، بـەخۆی لەمبارەیـەوە دەڵێـت: (( مـن بەربەریم،هـەمان سەرسـەختی بەربـەرەکان وبنجـبری ئـەوانم هەیـە.)) بەراسـتیش لـە سەرکێشیدا هەمان تەبیعەتی وانی هەبوو، ئەوەتا بـەخۆی دەڵێت: ((من لـە بنەماڵـەی دزانـی سـەقەلییەم،و دەبم بـە دزی دەریایی،بـەناو ئۆقیانوسـی رۆحـان دەکـەوم، خـۆم وەبنیدا دەکەم، بە دووی دەسـتەواژەی زێرینـی دڵرفێنـدا دەگـەڕێم، مـن دەمـەوێ ببم بەنووسەرو هیچی دی.!))**

((٣))

**فلۆبێر چونکە نەخۆش بوو و نەخۆشی نەیهێشت بە شێوەیەکی سروشتی بژی ،ئەمە بوو بە فاکتەرێك تا ئەدەب بە پیشەی خۆی هەڵبـژێرێ.چونکە ئـەدەب باشـترین پیشەیە بۆ خەڵکانی گۆشەگیر و دوورە کۆمەڵ.**

((٤))

**فلۆبێر لـە سـاڵی ١٨٤٦دا چـوو بـۆ پـاریس وسـەری لـە (برادییـە)ی پەیکەرسـاز داو داوای لێکـــرد نیوپەیکـــەرێك بـــۆ (کـــاروولین)ی خوشـــکی،کە مردبـــوو ، دروسـتبکات.لەوێنـدەر خـا(لـویز کولیـە)ی شـاعیری ناسـی کـە زیـاتر بـە زەبـری**

جوانییەکـــەی نـــەك بـــەهرە ئەدەبیەکـــەی پایـــەو ناوبـــانگێکی باشـــی لـــە ناوەنـــدە ئەدەبییەکاندا بەدەست هێنابوو.

((٥))

فلـــوبیر لـــە تەمـــەنی ســـی ســـاڵیدا رۆمـــانی( مـــەدام بوڤـــاری) بـــە پێـــنج ســـاڵ نووسی.فلوبیر لەو نووسەرانە بووە کە یەکجار زۆر بە نووسینی خۆیدا چووەتەوە ورسـتەو دسـتەواژەکانی چـاك کردووەتـەوەو هـەرگیز لـەم پرۆسـەی چـاككردنەوەو پێداچوونەوەیە بێزار نەبووە.جاری وا هەبووە رۆژێکی تەواوی بە نووسینەوە بەسەر بردووەو تەنیا دوو دێڕی نووسیوە.دوودێڕەکە بە دڵی خۆی بووە..فلۆبیر رای وابوو پەخشـان دەبـێ رەوان وسـوار بـێ، ناسـك وریتمـدار و بەئاهـەنگ بـێ...بـەلای ئـەوەوە وشـە تـەنیا پەیامبـەرێك نـەبووە کـە بیروبیرۆکـان بـۆ خوێنـەر بگوازێتـەوە.بـەڵکو وشـە بوونـــەوەرێکی زنـــدوو بـــوو، بـــۆن، دەنگ،کەســـایەتی ورۆحـــی تایبـــەتی خـــۆی هـەبوو.هینـدەی لـە توانایـدا بـووە هەولیـداوە، یـەك وشـە دوو جـاران لـە لاپەرەیەکـدا دووبارە نەکاتەوە.بەخۆی لەمبارەیـەوە دەڵێت: (( کـە دووبارەکردنەوەیـەك لـە دەسـتە واژەیەکمـــدا دەبیـــنم، هەســـتدەکەم کەوتوومەتـــە داوەوە.لـــە راســـتگۆیی دوور کوتوومەتەوە.))

فلۆبیر عادەتی وابوو بیرۆکەکانی خۆی رەشنووس بکات و پاشانبگەرێتەوە سەری ، وشـەو دەسـتەواژان لاببـات و پـاش وپێشیان بکـات یـا لـە نـوێ بیاننووسێتەوە،تا دەگەییە ئەو ئەنجامەی خۆی دەیویست،ئەوسا دەچووە سەربانیژەکەی و بە دەنگی بـــەرز نووســـینەکەی خـــۆی دەخوێنـــدەوە،خۆ ئەگـــەر جـــۆرە لەنگییـــەگی تێـــدا بدیبا،یەکسەر دەگەرایەوە سەر مێزەکەی ودەکەوتە بژارو چاككردنەوەی.

((٦))

رۆمـانی مـەدام بوڤـاری وەکـو(فاوسـت)ی گوتیە،بەسـەرهاتی نەفسـێکی هەڵـە کردووە،لەگەڵ جیاوازییەکی گـەورەدا کـە:قارەمانەکـەی گوتیـە لـە کۆتـای دا غـەریزەو کەڵکەڵە بەرەو رێگەی راستی دەبات، بەڵام قارەمانەکەی فلۆبیر غـەریزە بـەرەو رێگـەی هەڵەی دەبات. ئەم رۆمانە باری رۆحی قارەمانـەکانی زۆر هونەرمەندانـەو رەشبینانە خسـتووەتە روو.کـە دەشـێت ئەمـە رەنگدانـەوەی بـاری دەروونـی و رۆحـی خـودی نووسەرەکە خۆی بێ،کە نەخۆشی و نەساغی بوونە کۆسپ و نەیانهێشت بە ئاوات بگات.

((٧))

ئـــەم رۆمانـــە لـــە ســـاڵی ١٨٥٧دا بـــە زنجـــیرە لـــە گۆڤـــاری(ریفـــودی بـــاری) بلاّوبووەوە،خوێنـەران بـە تاسـەوە پێشـوازیان کرد،کـە بـە کتێبـیش چـاپ بـوو،خێرا رەواجێکی بێوێنەی پەیا کرد.چەند رەواجی هەبوو، ئەوەندەش رەخنەگران هێرشیان کردە سەری.نووسەرەکەیان بەوە تاونبار کرد کە تووشی نەخۆشی ( الجدام الخلقی) بووە! ئەوجا دەسەلاّتی وەخت گرتیان بەتاوانی ئەوەی کە(٠ ئەدەبی بیٚ پەردەی بلاّو کردووەتەوە) بەلاّم دوای دادگاییەکی زۆر لە ئەنجامدا بیٚ تاوان دەرچو و ئازاد کرا. لیٚ فلـوبیر بەمـە سـاردنەبووەوە و نـاو بـەناو بەرهـەمێکی تـازەی بـلاّو دەکـردەوە، بـیٚ ئەوەی چاوی لـە چـەپڵەو ستایش بیٚ یـان گـویٚ بـە لۆمـەو گازانـدەی خـەڵکی بـدات، چونکە خۆی دەڵێت: ((من کەسێکی بە تەوس و توانجم ،تەوس وتوانج ئەو خوێیەیـە کە یارمەتی مرۆڤ دەدات تا تۆڕەهاتەکانی ژیان هەرس بکات.))

---

تێبینی:

بۆ زانیاری پتر بڕوانە رۆمانی مەدام بوڤاری وەرگێڕانی د. محمد مندور

## ٤١- كارلۆس فۆینتس

-١٩٢٨

### مەرگی ئارتیمیۆ کرۆت

((١))

ئەم رۆمانە جێیەکی دیارو تایبەتی لە نێو بەرهەمە زۆر و هەمە جۆرەکانی کارلۆس فۆینتس دا هەیە.ئەم بەرهەمە بەردی بناغەی ئەو شۆرەتە جیهانییەیە کە نووسەر بەو پەری شایستەییەوە وەکو یەکێك لە جەمسەرە هەرە گرینگەکانی نوێکردنەوەی ئەدەبیاتی ئەمریکای لاتینی لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی رابردوودا وەدەستی هێنا. هەر ئەم شۆرەتە تاجی خەڵاتی پربانتس– نۆبڵی ئادابی ئەسپانی نووسانی لە ساڵی ١٩٨٧دا لەسەر نا... رۆمانەکە دیالۆگی ئاوێنانە. فۆینتس گەلەك ژێهاتیانە لە نێوان لایەنەکانی کاراکتەرێکدا کە لەسەر جێی مرگ کەوتووە و یادگارەکانی وەبیر خۆی دێنێتەوە،دەیبا بەرێوەو هەموو مێژووی مەکسیکی تازەمان بۆ بەرجەستە دەکات. بەدەم خوێندنەوەی ئەم ر ۆمانەوە خۆمان لە بەردەم بونیادێکی گێڕانەوەیی بتەوی بێ وێنەدا دەبینینەوەو ئەزموونێکی بوێرانە دەخاتە روو و سەرلەنوێ و بە قوڵی زمان دەخولقێنێتەوەو بەمەش کەڵکەڵەیەکی هەرە دیاری نووسەرمان بۆ کەشف دەبێ ئەویش شەیدابوونی مێژووی مەکسیکە،کە لە هەر هەموو بەرهەمەکانیدا بەزەقی رەنگی داوەتەوە. بە تەکنیکێکی هەرە جوان و تازە ئەم رۆمانەی نووسیوە کە بە ئاسانی لە ناو بەرهەمی هەموو هاوچەرخەکانی خۆیدا دەناسرێتەوە..

((٢))

کارلۆس فۆینتس جەمسەرێکی هەرە دیاری تازەکردنەوەی سەردەمی ئەمریکای لاتینی ساڵانی شەستەکانی سەدەی بیستەمە، کە هەندێ لە سوارچاکانی ئەو بوارە بریتی بوون لە: گارسیا مارکیز، بارگاس یۆسا، خولیو کورتاساو،وخوسییە دوتوسو وزۆری دی..فۆینتس لە زۆربەی ئەو نووسەرانە پڕ بەرهەمترە.نزیکەی بیست رۆمان وژمارەیەك کۆمەڵە چیرۆکی نووسیوە و هەندێ لە رۆمانەکانی بریتین لە : ( هەرێمە شەفافترەکان، مەرگی ئارتیمیۆکرۆت، دەڤەرێکی پیرۆز، پێستە گۆرکێ، خاکەکەمان، گرنیکۆی پیر،کریستوبال نوناتو و ئورا کە جوانترین کورتە رۆمانییەتی..)هەندێ لە کۆمەڵە چیرۆکەکانیشی ئەمانەن: (رۆژگارە دەمامککراوەکان،سروودی کوێران، داری پرتەقاڵ.)

فۆینتس لـه پـاڵ کـاری داهێنانـدا رەخنـەی ئەدەبیشـی نووسـیوەو بەشـداری لـە تیۆریزەی نووسینی تازە کردووە، درامای نووسیوەو سیناریۆی بۆ چەند فیلمێکی ئەزموونگەری نووسیوە ئەمە جگە لە چالاکییە رۆژنامەوانییـە هـەرە دەوڵەمەنـدەکانی لە مەکسیك و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو ئەوروپا.

فۆینتس چەندین خەڵاتی وەرگرتووە کە گرنگترینیـان خـەڵاتی پربـانتس– نۆبڵی ئـەدەبیاتی نووسـراو بـە ئەسـپانی بـوو کـە لـە سـاڵی ١٩٨٧دا وەریگرتـووە.ئـەم کەڵـە نووسەرە لە ساڵی ١٩٢٨دا ل دایك بووە .بابی کابرایەکی دبلۆمات بوو، بۆیـە بەشـێك لەتەمەنی منداڵی لە ئەرجەتین و شیلی بەسـەر بـردووە، لـە یـەکێك لـە قوتابخانـەکانی واشـنتۆندا فێـری ئینگلیـزی بـووە.یاسـای لـە سـانتیاگۆی شـیلی و لـە جنێـف خوێنـدووەو دکتـۆرای وەرگرتـووە ،چـونکە ماوەیـەکی زۆر لـە دەرێـی وڵاتـی خـۆی ژیـاوەو زۆر وڵاتـان گـەراوە، گەلـەگ زمـانی ئـەوروپی و تـازە فێربـووەو ئاسـۆیەکی دەگەمـەنی لـە بەردەمـدا ڤـەبووەو تـا رادەی شـەیدایی و ئاشـقاتی گـیرۆدەو پابەنـدی مێـژووی مەکسـیك وئـەمریکای لاتینـی بـووەو ئەمـەش زۆر بـە چـری و هونەریانـە لـە بەرهەمەکانیا رەنگی داوەتەوەو بەکارهێنراوەو...

((٣))

فۆینتس پێی وایە سەرلەبەری کەلتوورو ئەدەبیاتی کیشوەری ئەمریکای لاتینـی بە سـێ قۆناغـدا تێپـەریوەو بـریتین لـە: یۆتۆبیـا، مەلحەمـە، ئەفسـانە، کـە کیشـوەرەکە دۆزرایـەوە وای بیر لێدەکرایـەوە کـە یۆتۆبیایـە. لێ ئـەم یۆتۆبیایـە زۆری نەخایـاند و مومارەسـەی عەمـەلی دۆزینـەوەو ئیسـتعمار وێرانـی کـرد.ئەوەبووئەسـتێرەی یۆتۆبیـا ئـاوا بـوو و مەلحەمـە(داسـتان) شـوێنی گرتـەوە.بـە درێـژایی ژیانمـان لـە ژێـر ئـاڵای مەلحەمەدا ژیاین، رۆمانەکانمان مەلحەمین. هونەرمان مەلحەمییە.لێ گاڤێ کە ئەم وزە مەلحەمییە لەبن دێ،وا پێدەچێ تەنیا دەرفەتی ئەفسانەمان بۆ بمێنێتەوە.

مەلحەمە وا دەگەیەنێ کە ئەم کیشـوەرە مێژوویـەکی پـیرۆزی هـەبێ.واتـە لـەدەرێی مێـژوودا بـژی .لێ ئەفسـانە دەرفـەتی قۆسـتتنەوەی ئـەو رابردووەمـان دەدات تالـەو رابـردووە دەرچـین،کە مێژوویـەکی تایبەتیـەو مـوڵکی کـەس نییـە، بچـینە نـاو دیالیکتیکـەوە.دەرچوون لـە نووسـینی مێـژوو بـۆ چـوونە نـاو دیالیکتیك،کـە دەکاتـە دروستکردنی مێژوو، دروستکردنی بەو ئەفسانانەی سەرە داوانمان وێدەدات. سەرە داوی هەر هەموو ئەو رابردووە تۆباوی و مەلحەمییـە تـا بیگـۆرین بـۆ شـتێکی دی، لـە رێگەی ئەفسانەوە گوڕ بە رابردوو دەدەینەوەو کارای د ەکەین.

ئیدی ئەمە ڕێگەی خۆشکرد نووسەر لە وەعزو وەعزکاری لابدات و ببێ بەنووسەرێکی حەقیقی و بەشداری لە گوناح و تاواندا بکات.و ئاوێتەی وەزعە هاوبەشەکەی خەلکانی دی بێ و هەر لە بورجەکەی خۆیدا قەتیس نەمێنێ.جا لێرەوە جۆرێك لە واقیعبینی دێتە گۆرێ. واقیعبینی ئەوەیە چۆن هونەریان مامەڵە لەگەڵ واقیعدا دەکەی ،واقیع نەك بگێریتەوە بەڵکو بیڵێی،بەلاّم ئەو تەکنیکە بدۆزیتەوە کە چۆنی بڵێی ،بیخەیتە بەر تیشکی چ خەیاڵێکی بەپیتەوە. واتە واقیع بە خەیاڵێکی تەژی وزە بسپێریت.ئەمەش قۆناغی بەسەر چوونی سەردەمی مەلحەمییەو سەرەتای سەرهەڵدانی واقیعیە.واقیع نەك وەکو چۆن لە دەرێی هۆشدا هەیە، بەڵکو وەکو چۆن لە هۆش و لەناو هۆشدا دەماسێت وقاڵبی خۆی وەردەگرێ و لە خەیاڵی تایبەت بە ئەدەبدا خۆی دەنوێنێ و ریالیزمی جادوویی دێتە کایەوە کە بریتییە لە گەران ودۆزینەوەی شتە عەجایەبەکانی ناو واقیعی رۆژانە وناو هەست وهۆشی نووسەر وخوێندنەوەی هونەریانەی نووسەر بۆ ئەو واقیعە .هەڵبەتە نکولی لەوە ناکرێ کە زمان یەکێکە لە فاکتەرە بابەتییەکانی واقیع و هەر زمان و توانای زمانە کە مانایەکی دیکە بەواقیع دەبەخشێت و واقیعی ئەمرۆژگارەش لە وشەدا بەرجەستە دەبێت و هەر لێرەوە ناکۆکی و ململانێییەکی توند لە نێوان زمانە درۆزنەی دەسەلاّت و زمانی رەسەن و راستگۆی هونەردا سەرهەڵدەدات. بە کارهێننی راستە قینەی زمان کەڵکەڵەی شۆرشگێرانەی لێدەبێتەوە. هەموو شتێك دەخاتە بەر پرسیارو هیچ حاڵەت و ساتێك نابوێرێ و ئەمەش تاقە رێگەیە بۆ بەشداری کردن لە مێژووی بەرهەمهێنانی مێژوودا.کەواتە زمان بەم پێیە وەلاّمدانەوەی پێداویستیە هونەرییەکانی نووسەرە،وەلاّمی پێداویستییەکانی کۆمەڵەو هەر ئەم پرۆسەیە و خەملێنی ئەم پرۆسەیە دەکاتە هاوچەرخێتی و هاوچەرخاندن. کەواتە نووسەر لە خەباتێکی بێ وچاندایە، لەخەباتێکی رەسەندایە بۆ گوتن و نیشاندانی شتگەلێك کە بە شێوەیەکی داهێنەرانەی وزەدار واقیعمان بۆ روناکبکاتەوە.

<u>تێبینی:</u>

بۆ زانیاری پتر بروانە رۆمانی: موت ارتیمیو کروت /کارلوس فوینتس- ترجمە:احمد احسان.

## ٤٢- ويليام سارۆيان

### كۆميدياى مرۆڤانى

((١))

بێگومان هەر نەوەيەك دەنگ و رەنگى خۆى هەيەو مامەڵە لە گەڵ ئەزموون و تەجرەبەى خۆيدا دەكات.ئەزموون و تەجرەبەو دەنگ و رەنگى هەر نەوەيەك جياوازە لە هى نەوەى پاش وپێش خۆى.بەڵام ئەمە بەو مانايە نييە كە هيچ پەيوەندييەكى راستەوخۆ يا ناراستەو خۆيان لە نێواندا نييە. جا رەنگدانەوەى ئەم ئەزموون و تەجرەبانە، بە پێى كات وشوێن لە بەرهەمى نووسەرانى هەر سەردەمێكدا،شەقڵى تايبەتى ئەدەبياتى ئەو سەروبەندە ديارى دەكات..واتە هەر نەوەيەك لە روانگەو جيهانبينى سەردەمى خۆيەوە دياردەورووداوەكانى سەردەمى خۆى تاو توێ دەكات و مامەڵەى لە تەكدا دەكات،جا جياوازى ئەدەبياتى هەر سەردەمێك لەگەڵ سەردەمانى پێش يا پاش خۆى لە جياوازى روانگەو جيهانبينى نووسەرانى سەردەمەكەوە هەڵدەقوڵێت، كەواتە هەر دەقێكى ئەدەبى دەكاتە روانگەو جيهانبينى سەردەم و زەمانى هەر نووسەرێك، بەڵام دەبێ ئەوەش فەرامۆش نەكرێ كە هەر جيهانبينى و روانگەيەك، رەگى لە هەست و ئەزموونێكدايە وجا نووسەر دێ ئەو هەست و ئەزموونە دەهونەرێنێ و بۆ وەرگرى دەگوازێتەوەو لە زەينى وەرگردا هونەريانە بەرجەستەى دەكات. هەڵبەتە هەر بەرجەستەكردنێكى هەنەريانەش، شێوازى تايبەتى خۆى بەرهەم دێنێ.

((٢))

جا بەوپێيەىكە ئە دەبياتى هەر سەردەمێك رەنگدانەوەو دەنگدانەوەى سەردەمى خۆيەتى و دەشێت بە بەڵگەنامەيەكى شعورى زندووى ئەو سەردەمە دابنرێ..بۆ نموونە گەر سەردەمى جەنگە جيهنييەكان وەربگرين دەبينين دەرهاويشتەكانى جەنگى وەكو: ترس،وێرانى ،ماڵكاولى،غوربەت،تێكچوونى شيرازەى ژيان و لە گرێژەنە چوونى هەموو شتەكان، دەردى چاوەروانى و تاسەى گەرانەوەلە بەرەكانى جەنگ و..هەوێنى گەلەك شاكارى كەڵە نووسەرانى ئەو سەردەمانەى پێكهێناوەو نموونەشمان بەرهەمى نووسەرانى وەك: جان دۆس پاسۆس،ئى ئى كامينگيز، هەمينگوايە.. كە لە هەر هەموو هاوعەسرانى خۆى كارامەترو لێهاتووانەتر و هونەريانەتر درندەيى و بێهودەيى جەنگى نيشان داوەو بە خۆى هەم وەكو سەربازو

هــەم وەكــو پــەيامنێری جــەنگی بەشــداری لــە شــەرەكاندا كــردووەو ئــەزموون و تەجرەبەيەكی فرەی لەو بوارەدا پەيدا كردووەو لێهاتووانە هونەراندوويەتی.

ويليـام سـارۆيان)ش كـە پـێم وايـە نـاوێكی ئاشـنايە لای خوێنـەری كـورد، لـەم بــوارەدا خــۆی تاقيكردووەتەوە،هەرچــەندە لــە ئاســتی هونــەرو هونەرمەنــدی هەمينگوايـدا نييـە.، بـەلاّم هـەوڵی خـۆی داوەو بەرهـەمێكی دڵگـرو جـوانی نووسـيوە بەناوی(كۆميديای مرۆڤانی)كە رەنگە شاكاری ئەو نووسەرە مرۆڤدۆستە بێ ئەم دەقە ئەدەبييە بريتييە لە سەرگوزشتەی ژيانی خێزانێكی هەژاری ئەمريكايی كە بەبۆنـە شـەرەوە تاقـە نـان پەياكـەری ئـەو خێزانـە دەبـرێ بـۆ بـەرەی جـەنگ و بـارو دۆخـی مادييـان لـە خراپـەوە خراتـر دەبـێ.بۆيـە هۆمـەری كـوڕی چواردەسـاڵەيان ناچـار بـۆ هاوكاری خێزانەكەيان دەبێ بە پۆستەبەر، جا ئەم كورە بەزەبری كاری پۆسـتە بـەری هەواڵی مەرگ،پەيامی مەرگ و ژيان،خۆشەويستی و ئومێد دەگەيەنێتـە سەرانسـەری مالـەكانی شـاری ئيسـاكی ،لـە پـاڵ هۆمـەری شـا قارەمـانی ئـەم چيرۆكەدا گـەلێك قارەمانی ديكە دەبينرێنو هەر يەكـەيان بەشـێوەيەك لـە گـەڵ رەورەوەی رووداوەكانـدا دێن ودنيای چيرۆكەكە ئاوەدانتر دەكەن، لەوانـە يۆلسـيس و ماركـۆس ،بس، مـاری و دايكيان.

چــيرۆكەكە بــە شــێوازێكی رياليســتی روون و رەوان نووســراوەوكاريگەری هەمينگوای پێوە دیارە. گەرچی هەندێ جار نووسەر هەنێ لـە قارەمانـەكانی كـردووە بـە بڵنـدگۆو لـە وێنـدەرەوە راو بۆچـوون و فەلسـەفەبازی خـۆی دەردەبرێـت لەوانـە: دايكی هۆمەرو كابرای تەلەگرافچی، كە زياتر گوزارشت لە بۆچوونی نووسـەر دەكـەن نەك لەبۆچوونی خۆيان كە ئەمە بۆ دەقی هونەری بە خەوش دەژمێردرێ. بەهەر حاڵ مرۆڤدۆسـتی و هاوسـۆزی بێوێنـەی سـارۆيان لـە گـەڵ خـەڵكی شارۆچـكەی دوورە دەستی ئيساكيدا،كە جەنگ لەدوورەوە داغمەی ناديارى خۆی پێوە ناون، شايستەی ئافەرين و دستخۆشييە.نووسەر هاوزمان لەگەڵ قارەمانـەكانياو بە زمانی ئەوانـەوە هيواو ئاوات دەخوازێ كە دنيای پاش جەنگ دنيايەكی باشتر بێ.

كۆميديای مرۆڤانی لە سەرەتادا لە شێوەی سيناريۆدا بۆ فيلم ئامادە كرابوو. لە سـاڵی ١٩٤٢دا سـارۆيان لەسـەر خواسـتی دەزگـای فيلمسـازی چـوو بـۆ هۆليـوود تـا فيلمی كۆميديای مرۆڤانی بە چاودێری و ئاگاداری خۆی ئامادە بكرێ. بەلاّم چونكە فيلمسـازو دەرهێنـەرەكان ئەوەنـدە گوێيـان بـە رێنوێنييـەكانی ئـەو نـەداو لايـەنی بازرگانی فيلمەكەشيان مەبەست بوو، بۆيە سارۆيان وازی هيناو بە جێيهێشتن.بەلاّم

فیلمەکـــە هـــەر ئامـــادەکراو خرایـــە بـــازارەوەو ســـەرکەوتنی باشـــی وەدەســـت هێنـا.سـەرکەوتنی فیلمەکـە لـە خـودی چیرۆکی کۆمیـدیای مرۆڤـانی کـە باشـترین بەرهەمی سارۆیانە و یەکێکە لە بەرهەمە دیارەکانی سەردەمی خۆی، کەمتر نەبوو..

((٣))

ویلیـام سـارۆیان لـە سـاڵی ١٩٠٩دا لـە شـاری فـرزی نـوێ ی کالیفۆرنیـا لـە خێزانێکـی ئەرمـەنی لـە دایکبـووە.ویلیـام دووسـاڵان بـوو کـە بـابی مـرد،(تـاکوهی سارۆیان)ی دایکی ناچار بوو کورەکەی بخاتە هەتیوو خانە. ویلیام تا حەوت ساڵان لەوێندەر مایەوەو ئەوجا لە هەمان شاردا(فرزی نوێ) چووە بەر خوێندن و تا ساڵی دووەمی ئامادەیی لەوێ بەسەربرد. بەڵام لە تەمـەنی ١٥ساڵیدا ناچار بوو دەست لـە قوتابخانە هەڵبگرێ و روو بکاتە قوتابخانەی ژیان.ئیدی لەو تەمەنەوە دەستی بە کار کـرد.هـەر کـارێکی بـۆ رێککەوتایـە دەیکـرد.و زۆر شـتان فـێر بوو،رووداوەکـانی سـەردەمی منـاڵی وئـەو ئەزموونانـەی لـە رێگـەی کـاری جۆراوجـۆرەوە وەدەسـت هێنابوون،هەوێنی چیرۆکەکانی پێکدێنن. لە ١٦ساڵییەوە خووی دایە نووسین وبۆ ماوەیەك بوو بە پەیامنێری رۆژنامە. لە ساڵی ١٩٣٣دا یەکەم چیرۆکی بڵاو کردەوەو لـە سـاڵی ١٩٣٤دادووەم چـیرۆکی بـڵاو کـردەوەو بـەم دووچـیرۆکە نـاوێکی پەیـدا کرد.سارۆیان پتر لە ٣٠٠ چیرۆکی نووسیوە.چەند شانۆنامەیەك و چیرۆکێکی درێژی بە ناوی(کۆمیدیای مرۆڤانی) نووسیوە.

سارۆیان ژیـانی خـۆش ویسـتووە وبـەم جـۆرە بـاوەری خـۆی سـەبارەت بـە ژیـان دەردەبڕێت: (لە قۆناغی ژیانی خۆتدا بەراستی بژی تا لـەم ماوە کورتـەدا کـە لەسـەر ئەم دنیایەی خەمی دنیا زیاد نەکەی ،بەڵکو بۆ ژیان پێبکەنە شتێك بخـە سـەر شـادی بێ پایانی ژیان..

<u>تێبینی:</u>

بۆ زانیاری پتر بروانە:

کمدی انسانی،نوشتە ویلیام سارویان

ترجمە:سیمین دانشور-شرکت سهامی-انتشارات خوارزمی، چاپ سوم ١٣٨٠

## ٤٣- ليف تۆلستۆی

١٩١٠-١٨٢٨

تۆلستۆی یەکێکە لەو دەنگە رەسەنانەی کە لە ناوەندی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردیا ناسراوە.ئەم کەڵە نووسەرە لە خێزانێکی زۆر دەوڵەمەن پەروەردە بووە.هەموو خۆزیایەکی ئەوە بوو کە ژیانی جووتیاران چاك بکات.بەهرە مەندێکی مەزنی گێتی نووسین وئەدەبیات بوو.تا ئێستاش بە گەورەترین نووسەری سەدەی بیستەم دەژمێردرێ،لە ساڵی ١٨٥١دا (چەند دیمەنێکی سیباستۆبول)ی نووسی.ئەم بەرهەمە زادەی ئەزموونەکانی نووسەرە لە جەنگی قرمدا. لە ساڵی ١٨٥٢دا(منداڵێتیم)ی نووسی و شۆرەت و نێوبانگی پێدەرکرد.

پاش ئەوەی سەفەرێکی رۆژاوای کرد ، بەجارێ باوەری بە مەتریالزمی ئەوروپا لەق بوو .وەختێ لە سەفەرەکەی گەرایەوە چوو لە ناو موڵکەکانی خۆی و لە گوندا نیشتە جێ بوو .لە گەڵ خەڵکی دێهاتا کاری دەکرد، فێری خوێندن و حیسابی دەکردن، قوتابخانەی بۆ کردنەوە.

لە ساڵانی ١٨٦٢-١٨٦٩دا رۆمانی (جەنگ و ئاشتی) نووسی..لێرەدا پێویستە ئامارژەیەك بۆ ئەوە بکەین کە کتیبش وەکو مرۆڤ دەمرن و ئەو کەس و کتێبانەی کە کۆن نابن و نەمری بەدەست دێنن،گەلەك دەگمەنن (جەنگ وئاشتی) یەکێکە لەو کتێبە نەمرانەی کە بە گەشی گەییوەتە سەردەمی ئێمە وبێگومان هێوەترش دەروات.ئەم ر ۆمانە یەکێکە لەو شاکارانەی کە شۆرشی لە جیهانی ئەدەب و هزرو بیری خەڵکی روسیا وجیهانیشدا بەرپا کرد.دیارە ئەم بابەتە بەرهەمانە هێند دەگمەنن کە رەنگە هەر سەدەیەك کەرەتێك بەرهەمێ یا دووانی وەها بێتە نووسین، ئەم رۆمانە کە لە ساڵانی ١٨٦٢-١٨٦٩دا نووسراوە، بریتییە لە شیکردنەوەیەکی وردی کارەساتی ساڵانی ١٨٠٥-١٨١٢ی هێرش و پەلامارو لەشکرکێشی ناپلیۆن بۆ سەر مۆسکۆ،بۆیە ئەم رۆمانە لە پاڵ ئەوەدا کە شاکارێکی ئەدەبی جیهانییە، تابلۆیەکی هەرە دەوڵەمەندو زندووی ژیانی روسیای ئەو سەروبەندەیە، رەنگە شەرەکانی ناپلیۆن وقارەمانێتی و خۆراگری روسەکان لە دەیان و سەدان سەرچاوەو ژێدەراندا هاتبنە تۆمارکرن، بەڵام هیچکەسێك نەیتوانیوە وەکو تۆلستۆی ئەنگێزە دەروونی ونهێنییەکانی ئەم بەرەڤانی و خۆراگرییەی میللەتی روس ببینێ و

دەربڕێ. لە کاتێکا ناو و شکۆداری خەیاڵیی ناپلیۆن بووبووە داستان و کەوتبووە سەر زاران و سەدان کەس دڵبەندی بووبوون، نووسەری جەنگ و ئاشتی بەزەبری قەڵەمی بێ ڕییا، لە ئاسمانی مەزناتی دەسکردەوەهێنایە سەر زەوی وبە خۆی و لەشکرە بێ ڕەزاکەیەوە لە بەردەم گەورەیی و قارەمانێتی میللەتی ڕوسدا داینا وحەقیقەتی بچکۆلانەی ئەو داگیرکەرەی بە هەموو دنیا ڕاگەیاند.!هەرچۆنێ بڕوانیتە ئەم شاکارە، هەستی پاك و بنەمای ئەخلاقی و دەرکی قوڵی ڕازو ڕەمزی جیهانی ڕۆحی خەڵکی،کە ڕەنگدانەوەی ڕۆحی نووسەرە، پێشوازیت لێدەکات،ئەوەتا جارێ مێژوو نووسێکی بەتوانا دەتدوێنێ ، جارێ نیگارکێش و وێنەگرێکی بە دەسەڵات دەتلاوێنێ، تاوێ دەروونناسێکی بەڵەدو شارەزا دڵخۆشیت دەداتەوەو لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە شاعیرێکی ڕەندو مەردو ئازادو متمانە بەخۆ، بە ئاشکرا دێتە گۆو پێت دەڵێت کە نەژیان لاسایی کردنەوەیە و نەنووسین..بە بەرچاوتەوە ژیان دەجەربێنێ، ڕازەکان کەشف دەکات،ئەم تەجرەبانە لە مەحەکی هونەر دەداو دەیانگۆڕێ بۆ هەست.. واقیعی ژیان دەگۆڕێ بۆ واقیعی هونەرو قارەمانەکان دەخاتە سەر ڕاستە ڕێگەی چوون بەرەو کامڵبوونی ئینسانی و ئەوەتا لە کۆی نزیکەی ٧٠٠قارەمانی هەمە جۆر، تاقە قارەمانێك نابینرێ کە بەئاستەم فەرامۆش کرابێ..

تۆلستۆی بۆ خۆی پێی وایە هونەرمەند ئاوەدانکەرەوەی ڕۆحی بەشەرن و ئەم ئەرکە قورس و پەیامە پیرۆزەش وا دەخوازێ کە هونەرمەند بەردەوام لە هەڵچوون و داچوون و نیگەرانی دا بێ. بە زەبری شارەزایی ، واقیعبینی،جەربانـدنی ژیان، هاندەری ڕۆحی، ڕاستگۆیی، بێ ڕییایی، بەهرەو توانای خوڵقاندن،خەیاڵی هونەری دەوڵەمەند،خەونی مرۆڤدۆستانە، توانای بە حیسی کردنی ئەزموونەکان،ڕەوایی بابەتەکەو ئاشقێنی لە گەڵ بابەتدا،نەمری بە بەرهەمەکەی ببەخشێت...هەڵبەتە تۆلستۆی لە پاڵ ڕەچاوکرنی یەکە بە یەکەی فاکتەرەکانی نەمری بەخشین بە شاکارەکەیدا، بە خوێنی دڵش ئاوی داوە،هەرجارێ قەڵمی بە مەرەکەبدا کردبێ،پارچەیەك لە جگەری خۆی لە نێو شووشەی مەرەکەبەکەدا جێهێڵاوە.بێگومان جەنگ وئاشتی بەو ئەشقەوە هاتووەتە نووسین،و تۆلستۆی مەزن هونەرمەندانە ژیانی جەڕباندووەو واقیعبینانە تەجرەبەی هونەراندووە،دەنا جەنك و ئاشتی بەم شێوەیە ژیانی لێنەدەباری وبەم کەموێنەییە نەمری بە دەست نەدەهێناو بەم دڵنیاییەوە نەدەگوترا.گەر ئەلیادەی هۆمەر یەکەم مەلحەمەی جیهان بێ، ئەوا جەنگ و ئاشتی دوا مەلحەمەی جیهانە!

له سالآنی١٨٧٥-١٨٧٧دا رۆمانی(ئاننا کارنینا)ی نووسی...

تۆلستۆی وەنەبیٚ هەر ئەدەبی کردبیٚ بەخەم. بەڵکو خاوەن پەیامێکی مرۆڤانە بوو، تا مردنیش دەسبەرداری نەبوو..زۆر بە راشکاوی لە ئاین، گیرو گرفتە کۆمەلآیەتییەکان وهونەرییەکان دەدوا.لە سالّی ١٨٧٩دا کتێبی(دان پێدانان)ی نووسی.له سالّی ١٨٨٤دا(ماالعمل)ی نووسی و لەوێدا زۆر بەتوندی هێرش دەکاتە سەر خراپییەکانی سامانپەروەری و ماڵپەرستی، داوا له چینه دەوڵەمەندەکان دەکات کە گەل نەچەوسێننەوە، بەرۆکی گەل بەربدەن وئازادی بکەن.

رژێمو دەسەلآتی تزاری زۆر گوتارو نووسینیان قەدەغە کرد، بەلآم لەبەر شۆرەتە جیهانییەکەی نەدەوێران سەخڵەتی بکەن... بەلشەویکەکان وێرای ئەوەی کە تۆلستۆی رەفزی تەفسیری مەتریالیستی مێژوویی دەکرد و دژی هەموو جۆرە زەبرو زەنگێکی شۆرشگێرییش بوو،ئەوجاش رێگەی بەرهەم و نووسینەکانیان دەدا....

تۆلستۆی له سالّی ١٨٩٧دا کتێبی( هونەر چییە؟)ی نووسی ، لەم کتێبەدا بە توندی بەرپەرچی تێوری هونەر بۆ هونەر دەداتەوەو هێرش دەکاتە سەر گەلەك نووسەری ناوداری جیهانی.تۆلستۆی زۆر کەیفی بە ناوەندە ئەدەبییەکان نەدەهات.وکەمتر دۆستایەتی هونەرمەندانی دەکرد. ئەم کەڵە نووسەرە دانووی لەگەلّ رەخنەگراندا نەدەکولا، ئەوەتا له کتێبی(هونەر چییە؟) دادەڵیّ:(( هونەرمەند ئەگەر هونەرمەندی راسەقینە بیّ،لە رێگەی هونەرەکەیەوە هەست بۆ گوێگر یا خوێنەر دەگوازێتەوە، ئیدی رەخنەگر دیّ چ هەڵدەسەنگێنیّ؟! کە هەست له دەقەوە گەییە گوێگر یا خوێنەر ئیدی ئەو گوێگرو خوێنەرە بۆخۆیان تەجرەبەی دەکەن.خۆ ئەگەر هونەر ئەم کارەی ئەنجام نەدابیّ-هەستی نەقلّ نەکردبیّ- ئەوا هیچ تەفسیرێك ئەم حاڵەتەی پیّ نابەخشێت و تەفسیری بەرهەمی هونەر مەند کارێکی مەحاڵە..گەر هونەر مەند تەفسیری مەبەست بووایە، ئەوا لە رێگەی وشەوە دەیکرد،بەلآم هونەرمەندی راستەقینە بە هۆی هونەرەکەیەوە دەدویّ..))

تۆلستۆی هەر لە ئاستی روسیادا گەورەو مایەی رێز نییە، بەڵکو لە ئاستی هەموو دنیادا هەر رێزدارو بە ناوو دەنگە..

## ٤٤- ئالدۆس هاكسلی

هاكسلی نووسەرێكی قسە خۆش و سوعبەتچی و قسە لە رووبووە. لە ماوەی ژیانی ئەدەبی خۆیدا جگە لە دە رۆمانی تەنز ئامێز كۆمەڵێك بەرهەمیشی لە بواری شیعرو شانۆ نامە، سەفەرنامە،ژیاننامە ومێژووشدا نووسیوە.تێكرا پتر لە ٤٥ بەرهەمی نووسیوە، لەوانە: (خاڵ و خاڵی بەرانبەر-١٩٢٨،پەلكی بێ بەر-١٩٢٥، دنیای جوانی نوێ-١٩٣٢،بلیمەت و خواوەند-١٩٥٥،دوڕگە ١٩٦٢) هاكسلی نەوەی بنەماڵەیەكی خانەدانی سەردەمی شابانۆ ڤیكتۆریایە..كەڵكەڵەی زانست و ئەدەبیاتی لە ( تۆماس هنری هاكسلی)باپیری و لە (میسۆ ئارنۆلد)ی مامییەوە بۆ ماوەتەوە. سەرەتا بە هۆی هەردوو رۆمانی (ئانتیك)و (خاڵ و خاڵی بەرانبەر)كە دوو رۆمانی جوانی تەنز ئامێزن، شۆرەتی پەیداكردو ناوی كەوتەسەر زاران.لە ساڵی ١٩٣٧ بە دوواوە ئیدی لە دنیای چیرۆك و رۆمان دوور كەوتەوەو چوو لە شاری كالیفۆرنیای ئەمریكای باكور نیشتە جێ بوو پتر خووی دایە فەلسەفەو مێژوو و عیرفان...یەكێك لە خووەكانی ئەم نووسەرە ئەوەبوو كە بەدڵ و بەگیان گوێی لە قسەی خەڵكی دەگرت و ئەوجا بە دڵنیایی و متمانەوە وەڵامی دەدایەوە.وا لێرەدا چەند پرسیارو ەڵامێكی نێو هەڤپەیڤینێكی ئەدەبی درێژ كە جۆرج ویكس و ری ریزەر كاتی خۆی لە گەڵیان سازداوە بۆ خوێنەران هەڵدەبژێرین بە هیوای سوودی خۆی هەبێ:

١-هەندێ نووسەر وەك فرجینیاوولف،بە رەخنەی رەخنە گران ز ۆر قەڵس بوون، ئایا تۆش بە رەخنەی رەخنە گران قەڵسی؟

هاكسلی: نەخێر بە هیچ جۆرێ كاریان لێنەكردووم، چونكە هەرگیز رەخنەیانم نەخوێندووەتەوە.هیچ بەرهەمێكی من بۆ كەسێكی تایبەتی نەنووسراوە، هەموو هەوڵێكم بۆ ئەمە بووە كە كارەكانم بە شێوەیەكی باش ئەنجام بدەم وئە وجا لەبیری خۆمیان بەرمەوە، هیچ پەیوەندییەكیشم لە گەڵ رەخنە گراندا نەبووە.چونكە ئەوان مامەڵە لە گەڵ رابردوو و ئەو بەرهەمانەدا دەكەن كە نووسراون.بەڵام من عەوداڵی ئەو شتەم كە لە ئێستا بە دوواوە دێتە ئاراوە.بۆ وێنە تا نهوو رێك نەكەوتووە كە رۆمانەكانی سەرەتام بخوێنمەوە،بەڵام لەگینە لەم رۆژانەدا ئەم كارە بكەم..

٢-پێدەچێت ئەوەندە كەیفت بە فرۆیدزم نەیەت وانییە؟!

هاكسلی: گیرو گرفتی بنەرەتی فرۆیدزم ئەمەیە کە لەسەر بناغەی موتالاّکرنی((دەروون نەخۆشان ))رۆنراوە. فرۆید هیچ کاتیّ مامەڵەی لە گەل ّمرۆڤێکی ساغدا نەکردووە،یا پەیوەندی تەنیا بە نەخۆشەکانی خۆی و دکتۆرە ئەفسانەییەکانەوە هەبووەو بەم پێیە دەرونناسی فرۆیدش تەنیا مامەڵەی لە گەڵ رابردوودا کردووە.بەرای من سیستەمەکانی تری دەروونناسی کە مامەڵە لە تەك وەزعییەتی ئێستای کەسان وتوانای نادیاری ئەوکەسانە لە ئایندەدا دەکەن، واقیعیترن.

هاکسلی ئامۆژگاری نووسەرانی تازە کورە دەکات کە رووبکەنە کاری رۆژنامە گەری و پێی وایە مەیدانێکی چاکە بۆ فێربوونی رازو نهێنی و رەمزەکانی نووسەری و دەڵێت: ئەم کارە ناچارتان دەکات دەربارەی هەموو شتێك بنووسن. بەهرەو تواناتان مشت ومالّ دەکات.فێرتان دەکات چۆن بەلەز بەسەر کەرەستەی کارەکانتانا زالّ ببن.ناچارتان دەکات بە وردی بروانن هەموو شتێك...

## ٤٥- ئەدوارد مۆرگان فۆرستەر

١٨٧٩-١٩٧٠

یەکێکە لە نووسەرە ناودارەکانی ئینگلستان وشوێنێکی گەلەك دیاری لە مێژووی ڕۆمانی سەدەی بیستەمدا گرتووە.تێکرای بەرهەمەکانی بریتین لە چوار ڕۆمان و ژمارەیەك کورتە چیرۆك و دوو کتێبی بە نرخ دەربارەی چیرۆکنووسین و هەندێ نووسینی پەراگەندەی دیکە. فۆرستەر بەخۆی دان بەوەدا دەنێت کە ڕۆماننووسێکی گەورە نەبووە. بەلأم لە بواری لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا شارەزاییەکی زۆری هەبووەو کتێبی (پایەکانی ڕۆمان)-١٩٢٧،یەکێکە لە کتێبە چاکەکانی ئەم نووسەرەو لە بنەرەتدا بریتییە لەو دەرسانەی لە زانستگەی کمبریج دا گوتوونییەوە.لێرەدا چەند پرسیارو وەلأمێکی دوورو درێژی ئەدەبی بۆ خوێنەران هەڵدەبژێرین کە کاتی خۆی پ.ن قوربانك و ف.ج.ھ هاسکل لە گەڵیان سازداوە، هیوادارین سوودی هەبێ:

پ/١: ئایە قارەمانانی ڕۆمانەکانت هەموو واقیعین؟

فۆرستەر: قارەمانانی بەرهەمەکانم یا لە ناو ئەو کەسانەوە هەڵبژاردوون کە خۆشم ویستوون یائەوانەی رقم لێ بوون،یا ڕەنگدانەوەیەکی خودی خۆم بوون.ئەم تایبەتمەندییە من لە کۆمەڵێك ڕۆماننووس جیا دەکاتەوە کە ڕۆماننووسی واقیعی نین وپێویستە سوود لەم سێ بابەتە کەسانە وەربگرن بۆ چیرۆکەکانیان.چونکە ئێمە توانای بینین و هەڵسەنگاندنی وردو هەروەها عەکس کردنەوەی بێلایەنانەی مەودا جیاوازەکانی ژیانمان نییە. هەڵبەتە ژمارەی ئەو ڕۆماننووسانەش کە تا نهو لە عۆدەی ئەم کارە هاتوون، گەلەك کەم بووە،بۆ وێنە تۆلستۆی(١٨٢٨-١٩١٠)یەکێکە لەوانە، نەوەسایە؟

پ/٢: گەر بە ئەرك نەبێ کەمێك باسی چۆنیەتی گۆڕینی قارەمانی واقیعی بۆ قارەمانی چیرۆك بکەی؟

فۆرستەر: یەکێك لە تەکنیکە بە سوودەکان بۆ ئەم کارە، ئەمەیە کە بەچاوی نیوە کراوەوە سەرلەنوێ بڕوانینە قارەمانی واقعی،واتە تەنیا پاژێك لە تایبەتمەندیەتی وان بە تەواوەتی شرۆڤە بکەین.من خۆم هەمیشە کاتێك کە دوو لەسەر سێی خەسڵەت و سیفەتی یەك قارەمانی واقیعی نەبینم، ناتوانم سوودی لێ وەربگرم.هەڵبەتە ئەنجامیش نابێ لێکچوونی سەدی سەدی قارەمانی چیرۆك و

**قارەمـانی واقیعـی بـێ، ئەگەرچـی هـیچ کـاتێ ئـەم ئەنجامـەش نایەتـە دی. چـونکە هەرکەسێك بگری تەنیا لە هەندێ هەلومەرج ومەوقیعیەتی تایبەتی ژیانیدا دەتـوانرێ هەڵسەنگێنرێ.. کاتێ هەموو شتێك بە جوانی لـە چیرۆکدا گەشـە دەکات و دەچێتە پێشـێ ئـەو قارەمانـە واقیعیـەش کـە چـیرۆکەکەی لەسـەر رۆنـراوە بـە زووی نـامێنێ وقارەمانێـك لـە دایـك دەبـێ کـە تـەنیا بەنـدە بـەو چیرۆکەکە و بـەو کتێبـەوە نـەك بـە شوێنێکی دیکەوە..**

## ٤٦- ستندال

١٨٤٢-١٧٨٢

ستندال ناوی هونەریی رۆماننووسی بناڤ ودەنگی فەرەنسایی(هنری بیل)ە، ئەم نووسەرە دیارترین رۆماننووسی رۆمانی دەروونی سەردەمی خۆیەتی.هاوعەسری ناودارانی وەك: سکۆت ، بالزاك و گۆتێیە.حاڵەتی دەروونی ئاشقێنی، لە دوو رۆمانی بایەخدارا بەشێوەیەکی جوان و ناسك دەربریوە.رۆمانی یەکەم بریتییە لە (سورو رەش-١٨٣٠) هی دووەم ناوی (ماڵی شارتەر دو بارم-١٨٣٩)ە.هەندێ لە ناودارانی ئەدەب ئەم دوو کارە بە هاوتای رۆمانە مەزنەکانی بالزاك دەزانن.بە هەرحاڵ ئەم نووسەرە رابەرە بەرهەمی گەلەکن.کۆی بەرهەمەکانی بریتییە لە هەژدە بەرگ.رۆمانی(ماڵی شارتر دوبارم)یەکێکە لەو رۆمانانەی کە گوایە کەڵە نووسەرێکی وەکو تۆلستۆی لە رۆمانی (جەنگ وئاشتیدا) لە کاریگەریی بەدەر نەبووە ..ئەمە جگە لەوەی رۆماننووسی نێودار بالزاکیش زۆری بە دڵبووە.ولە خانەی کارە ئەدەبییە نەمرو دەگمەنەکانی داناوە.ئەم نووسەرە یاخییە پێی وایە مرۆڤ تا پتر بەناخی رۆحی خۆیدا رۆبچێ وتا زیاتر قوڵایی نهێنییەکانی بیرو خەیاڵی خۆی لە قاڵبی وشەدا نیشان بدات، بەرهەمەکەی رەسەنترو سەرکەوتووتر دەبێ.پێی وایە نووسەر نابێ هیچ شتێ بنووسێت تەنیا ئەو کاتانە نەبێ کە شتی زۆر گرینگ، یا زۆر جوانی لا کەڵەکە ببێ بۆ گووتن.خۆ گەر شتی زۆر جوان و گرنگ تەنگە تاویان کرد، ئەوا هەنگێ دەبێ بکەوێتە نووسین.و تا دەتوانێ بابەتەکەی خۆی بە شێوازێکی سادەو رۆشن نیشان بدات.ستندال لە شوێنیکدا دەڵێ : ((من یەك حەقیقەت دەزانم ئەویش ئەوەیە کە شێواز نابێ لە رادەبەدەر روون یا سادە بێ))کەواتە شێواز کە بریتییە لە چۆنییەتی مامەلەکرنی هونەریانەی نووسەر لە گەڵ زماندا، بایەخێکی یەجگار گرینگی لە نووسیندا هەیە.بۆیە نووسینی داهێنراودەبێ هەمان روونی و تەم ومژی خەونی گربیتە خۆ، واتە لەلایەکەوە شەفاف و ناسك بێ و لەلایەکی دییەوە تەنکە تەمێکی ئەوتۆ سەری گرتبێ کە ئیشتیای خوێندنەوە لای خوێنەر بهاروژێنێ. دیارە نووسەریش لە خۆرا ناگاتە ئەم ئامانجەو بە لاسایی کردنەوەش نابێ بە خاوەنی شێواز.بەڵکو شێواز زادەی ئەزموونە..تا ئەم ئەزموونە دەوڵەمەندو ئاسایی تربێ، سادەیی و روونی بۆ نووسین دەستە بەر دەکات. هەڵبەتە

ئەزموونیش زادەی پەیوەندی مرۆڤە لەگەڵ ژینگەدا، دیارە مەبەست لە ژینگە هەموو جۆرە ژینگەکانە، هەر لە ژینگەی خانەوادەییەوە بیگرە تا دەگاتە ژینگەی سروشتی و کۆمەڵایەتی.. بیگومان پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ ژینگەدا لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی دەگۆرێ، ئەم گۆرانکاریە لە شێوازیشدا رەنگدەداتەوەو جیاوازی پێدەبەخشێت..

هەڵبەتە هەموو دەزانین کە وشە لە حاڵەتە ئاساییەکەیدا هیچ جۆرە هەڵچوونێکی نەگرتووەتە خۆو ،شێواز زمان لە حالەتی ئاسایی دەردەکات و جۆرە دینامیکییەتێکی وای پێ دەبەخشێ کە خوێنەر بخاتە دووی خۆی.. بۆیە نووسەر لەسەرێتی لە نووسیندا بەموو لەم دروشمە لانەدات: (کە وشەی کورت بۆ شوێنێك شیا،هەرگیز وشەی درێژ بە کار مەیەنە.) دانیال دیفۆ لە باسی شێوازی چاکدا دەڵێت: ((بریتییە لە بەکارهێنانی وشەی گونجاو لە شوێنی گونجاودا))

## ٤٧- چیخۆف

١٩٠٤-١٨٦٠

((١))

ئانتۆن پافلۆفیچ چیخۆف بە ڕەچەڵك کۆیلە، لە شاری تاگانرۆك لە دایك بووە.لە ساڵی ١٨٧٩دا قۆناغی ئامادەیی تەواو کرد و لە هەمان ساڵدا چووە زانستگەی مۆسکۆ تا دکتۆری بخوێنێ. لە ساڵی ١٨٨٤دا قۆناغی کۆلیجی پزیشکی تەواو کرد. لە ساڵی ١٨٨٠دا یەکەمین چیرۆکی بڵاو بووەوە. ماوەیەك کەوتە دکتۆری و پاشان ئەم پیشەیەی تەرککردو نووسینی کرد بەخەمی یەکجارەکی خۆی. لە ساڵی ١٨٩٠دا سەفەرێکی بۆ ساخالین(کە لەو زەمانەدا یەکێك بوو لە تاراوگەکانی حکومەتی تزاری) کرد تا وەزع و حاڵی زندانیان بخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە، یادگاری ئەم سەفەرە زنجیرە چیرۆکێك بوو کە لە ژێر سەرناڤی ساخالین-١٨٩٣ بڵاوبووەوە،و جەزرەبەیەکی توندی بە دەزگای بێدادی تزاران گەیاند. بە ناوبانگترین چیرکی ساخالین (ئۆدەی ژمارە شەش)ە کە یەکێکە لە ترسناکترین چیرۆکی رووسی.. چیخۆف لە ساڵی ١٨٩١دا سەفەری نەمسا، ئیتالیا، و فەرەنسای کرد. لە ساڵی ١٩٠١دا لە گەڵ خائۆلگاکنیپەر-ی ئەکتەردا زەماوەندی کرد،سەرەنجام نەخۆشی دەردە باریکە کە لە تەمەنی بیست ساڵییەوە دابوویە گیانی باری گرانتر کرد. چیخۆف چەند ساڵێك لە شاری بەندەری یالتا ژیاو پاشان بۆ چارە سەری بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوایی چوو.لە حەسانگەی سیلداران لە بادن وایلەر-ی ئاڵمانی خەوت و ئاقیبەت لەوێنەر مرد..

((٢))

چیخۆف وەکو گوگۆل، هەستێکی گاڵتەبازی سەیری هەیە کە تێگەیشتنی قووڵی مسیبەتەکانی ژیانی لە گەڵدایە. چیرۆکەکانی سەرەتای لە راستیدا هەندێ پلۆت و سکێچی شادو پێکەنین هێنن،بەڵام هەر ئەم چیرۆکانە توانای ئیدراکی حیسی وی بەباشی نیشاندەدەن. هەندێ لە رەخنە گرانی رۆژگاری چیخۆف(( خەفەتی ئەوە دەخۆن کە بۆچی دەبێ ئەم بەهرە لاوە هەموو وەختی خۆی سەرفی پێکەناندنی خەڵکی بکات.)) رەنگە هەر ئەم ئامۆژگارییەی دوایی وپوختەیی و خەمڵین و نەخۆشی، بۆچوونی چیخۆفی گۆریبێ،و زۆربەی ئەو چیرۆك

وشانۆنامانەی کە لە نێوان سالآنی ۱۸۸۸-۱۹۰۰ی نووسیوونی خەمناك وبە ئازارو سوێن.ئەوسا کەوتە ئەوەی کە ئەو تروسکە هیوایەی کە سەبارەت بە گۆرانی بارو دۆخی نالەبارو بەزەیی ئەنگێزی ولآتەکەی لە دلآندا درەوشابووەوە، لە بەرهەمەکانیا عەکس بکاتەوەو بنوێنێتەوە، راستە رێگەی دەرمانکردنێکی دیار پێشنیاز ناکات، بەلآم دەردو نەخۆشییەکان بەوردی دەناسێت و چاو دەبرێتە شۆرشی ئایندە.

((٣))

کورتە چیرۆکەکانی چیخۆف رەنگە پتر وەسفی بن تا نەقلّی. لە کۆی شەش سەد کورتە چیرۆکی چیخۆف،زۆربەیان وەسفی موقیعیەتەکانە وهیچ جۆرە نەخشەو پلۆتێکی واقیعیان نییە. چیخۆف لە بنە رەتدا میتۆدێکی گۆشەگیر خوازی و ناشەخسی هەیە،و دەربەستی فێرکردن و فێرکاری و رێنیشاندان نییە. چیرۆکەکانی وەکو هەموو چیرۆکنووسانی روسیا،لێوان لێون لە جوزئیاتی واقیعیانە. هیچ کاتێك هەڵناچێ و دووی هەست وهەستیاری ناکەوێ، بە دەگمەن دەستەمۆی سۆزو گودازانی توند دەبێ،و چیرۆکەکانی پتر لە ئەقڵەوە دەرسکێن تا لە هەستو سۆز،لە کورتە چیرۆکی(ئۆدەی ژمارە شەش-۱۸۹۲)دا، بەزەیی و دڵسۆزی دکتۆرێك دەرهەق بە نەخۆشە شێتەکانی خۆی، وا لە هاوکارەکانی دەکات بە شێتی بزانن. لە ژوورێکی ناخۆشدا زیندانی دەکەن،و لە زەرفی چەند سەعاتێکدا دەمرێت.لە کورتە چیرۆکەکانی دیکەی چیوٚف(ڤانکا، سیرین، گالیسکە، دلْرفێن، خەوالّو، دوئێل، و جووتیاران) کەم و زۆر ناوبانگیان دەرکردووە.یەکەمین کورتە چیرۆکی چیخۆف (نامەیەك بۆ هاورێیەکی زانا-۱۸۸۰) لە گۆڤارێکی فوکاهی دا لەپتروزبرگ بلآوبووەوە. بەرگی یەکەمی چیرۆکەکانی بە ناوی (چیرۆکەکانی ملپامنی-۱۸۸٤) بریتی بوو لە شەش چیرۆکی (پلۆت) کورت.یەکەمین کۆکورتە چیرۆکی گرینگی(چیرۆکێن رەنگاورەنگ-۱۸۸٦)ی ناوبوو،کە چیرۆکی مینا( نەشتەرگەری،و خەم)ی لە خۆ گرتبوو.دوو کۆچیرۆکی دوواتری چیخۆف بەناوی ( لە بەرەبەیاندا-۱۸۸۷ وچیرۆکان-۱۸۸۸) بلآوبوونەوە.. کۆمەڵەی(چیرۆکان) چیرۆکی وەسفی بەناوبانگ (دەشت، راموسان، و شادی)لە خۆ گرتووە..( قسانی بێ زەرەر-۱۸۸۷و کاشتانکا-۱۸۸۷) دوو کۆچیرۆکی دیکەی چیخۆفن.

((٤))

هەموو تایبەتمەندییەکانی چیخۆف لە دراماکانیدا دەردەکەویٚ یەکەمین بەرهەمی درامی چیخۆف کۆمیدیا تاکپەردەییەکانیەتی، لەوانە: ( لەشارِێدا–١٨٨٥، ئاوازی قو–١٨٨٨، ورچ–١٨٨٨، خوازبێنی–١٨٨٩، زەماوەند–١٨٩٠، شەوی پێش دادگایی–١٨٩١، و ساڵوەگەڕ–١٨٩١)

شانۆنامەکانی تەواو بیٚ فۆرم و ناپەیوەستن، ڵێ رەنگە هەر ئەم نا پەیوەستی و شپرزەییە رەمزو هێمایەك بیٚ بۆ ئەو کۆمەڵگەیەی کە چیخۆف تیایا دەژیا..

ئیڤانۆف–١٨٨٧ یەکەمین شانۆنامەی د ریزِی چیخۆف کە ریٚچکەو ریٚگەی دارو دەستەی رۆشنیرانی روسی وێنە دەگرێت و ئارەزو و کەڵکەڵە خاوەکانی وان نیشاندەدات..لەم شانۆنامەیەدا تراجیدیای یەکێك لە رۆشنبیران بەنێوی ئیڤانۆف دەگێردرێتەوە. شاشا، کیژێکی گەنجە کە ئارەزو و خۆزیابەرزەکانی ئیڤانۆف بەگەن دەکات، و حەزی لێکردووە. ڵێ ئیڤانۆف کە هەموو جۆش و خرۆشێکی خۆی لەمەر ژیان لە دەست داوە دەزانیٚ کە ئارەزووەکانی پێشووی هەموو مردوون. کە هیچ رێگەیەکی رزگاری نابینیٚ رێك بەر لە دەست پێکردنی ئاهەنگی زەماوەند بە گوللە خۆی دەکوژێت..

باغی ئاڵوباڵو–١٩٠٤: لە هەموو شانۆنامەکانی چیخۆف پتر رەنگدانەوەی تایبەتمەندییەکانی ئەوە. ئەم بەرهەمە تراجیدیای بیٚ چارەیی و فەوتان و نەمانی چینی ئەرستۆکراتی روسیایە، ئەو چینەی ئاگای لە نەمانی نزیکی ژیانی هەرەس بردووی بیٚ کەڵکی خۆیەتی.بەڵام هیچ کارێکیشی لە دەست نایەت –خەڵکانێکی تەواو ناشایستەو دەسەوسان و بیٚ چارە کە هیچ کارێکیان بۆ چاکردنی وەزعی خۆ لە دەست نایەت. ئەم درامایەشاکارێکی تەسویرییە.ئەرستۆکرات و رۆشنبیران لە بەرانبەر کۆیلەیەکی ئازادبووی زبرو توورە، بەڵام کاریگەرو پیاوی کار،کە نیشانەی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی تازەیە، وێنە دەگیرێن..مەدام رانفسکایا، ژنێکی هەستیارو دەسبڵاو، کە تا ناقرگەی لە قەرزایە رووبەرووی لە دەسچوونی موڵکەکەی خۆیەتی. لوپاهین،کۆیلەیەکی ئازادبووە کە ئێستا بازرگانێکی دەوڵەمەندە،بیر لەوە دەکاتەوە کە چارەیەکی بۆ بکا..بە گوێرەی پێشنیازی وی دەبیٚ مەدام رانفسکایا دار ئاڵوباڵوەکانی باخە بەرینەکەی ببرێتەوەو زەوییەکەی بکات بەقەتحەو بە هاوینگەسازانی بفرۆشێت. بەهەرحاڵ باغەکە رەمزی هەموو شتێکی ئازیزە لای مەدام رانفسکایا، یانی سیستەمی کۆن، لە پێشنیازەکەی لوپاهین دەترسێت و رەتی دەکاتەوە، بەڵام تەواو روونە کە باغەکە لە دەست دەچێت. هەموو موڵکەکە دەچێتە

هەراج،و كريار خودی لوپاهین)ە. شانۆنامەكە بە دەنگی داهاتنەوەی تەوران بۆ سە ر دار ئاڵو باڵووەكان كۆتایی دێت.

شاكارە درامییە درێژەكانی چیخۆف، جگە لە باخی ئاڵو باڵو،بریتیە لە: مەلی دەریایی-١٨٩٦،كە كیشمانەكێشی نێوان نەوەی پیرو لاو دەخاتە بەر باس، لالۆڤانیا-١٨٩٧، كە رەنج و ناكامی خەڵكی رەش ورووت تاوتویٚ دەكات،و سیٚ خوشك-١٩٠١، كە ژمارەیەك لە رەخنە گران بە شاكاری چیخۆف-یان داناوە، ئاوێنەی نەمانی سیستەمی كۆمەلأیەتی كۆنە.بە شێوەیەكی گشتی نێوەرۆكی سەرەكی ئەم درامایانە خەونە بە ژیانێكی تازەوە..

((٥))

چیخۆف هەرچەندە توانای عەجیبی تۆلستۆی، پوختەیی وكەماڵی تۆرگینیف، و هەستی هاوسۆزی جیهانگیری دۆستۆفسكی مەزنی نییە... بەلأم شرۆڤەكارو لێكدەرەوەی دیارو بەرجەستەی رۆژگارو ولأتی خۆیەتی، و شانۆنامەو چیرۆكە وردو كاریگەر، و نا هەستۆكییەكانی وی لە ولأتانی ئینگلیزی زماندا یەكجار بە ناوبانگن ( بە هەرحالٚ ئەم مامۆستای سەراحەت و كرتبرییە، نوێنەری بەرزو دیاری قوتابخانەی ریالیزمی كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەیەمی روسیایە. زێدەباری ئەمە توانای تەنزخوڵقێنی وهەستی حەنەكبازی چیخۆف، ئەوی خستووەتە ریزی گەورە تەنزپەروەران وحەنەكبێژانی مێژووی ئەدەبیاتی جیهانەوە..

## ٤٨- كارلو گولدونی

١٧٩٣-١٧٠٧

به (مۆلیری ئیتاڵیا) ناسراوەو لە ڤینیس لە دایك بووە. ماوەیەك بە خوێندنی مافەوە خەریك بوو و سەردەمێكیش وەكو دیپلۆمات خزمەتی كرد، بەڵام دڵی هەر لە لای شانۆ بوو، و لە هەشت ساڵیشدا شانۆنامەیەكی نووسی بوو. لە ساڵی ١٧٤٨ دا دەستی لە هەموو كارێك هەڵگرت تا شانۆنامە بۆ شانۆی ڤینیس بنووسێت. باشترین بەرهەمی خۆی لە ساڵانی ١٧٤٨-١٧٦٢ دا بە زمانی ئیتاڵی نووسیوە. ئەوجا چوو بۆ پاریس و تا كۆتایی تەمەن هەر بە زمانی فەرەنسی شانۆنامانی نووسی.

گەورەیی گولدونی لەوەدا بوو كە شانۆنامەی ماسكی، واتە((كۆمیدیای دل ئاتەرئا))ی بە كۆن و لە باو كەوتوو نەزۆك دەزانی. گولدونی بۆ كلاسیزم گەرایەوە و لە ژێر كاریگەری مولیردا رەواجی بە كۆمیدیای رەفتاران بەخشییەوە. گولدونی دوو شتی مەبەست بوو : ١-كاراكتەرەكان لە شێوەی بوونەوەرانی مرۆڤانی دا بەرجەستە بكرێن و ٢-بویەرو رووداوەكان رەنگدانەوەی ژیانی واقیعی بن. گەلێك لە شانۆنامەكانی گولدونی زادەی دیتن و خوێندنەوەی ئەون بۆ چینی بورژوای ڤینیسیا. گولدونی ئەگەر چی لە رووی تەنز، توانا، قوڵبینی فەلسەفی، یان سایكولوژییەوە بە پێی مولێر-ی مامۆستای دا ناگات، لێ لە رووی داهێنانی دیالۆگ، پوختەیی پلۆت، و بەهرەی پێكەناندنەوە، بە هاوتای شانۆنامەنووسانی فەرەنسەوی دەژمێردرێ.

گولدۆنی لە چاكسازی كۆمیدیای ئیتاڵیدا سەركەوتن بە دەست ناهێنێ: كەسێك جێی ناگرێتەوە، چاكسازییەكانی وی روو بەرووی هێرشی توندی پییترۆكیاری، كارلوگوتزی، و جۆزپیەپارتی بوونەوە.

گولدونی، نزیكەی سەدو بیست كومیدیا و هەشتا دەقی ئۆپرای داهێناوە. بەناوبانگترین كۆمیدیاكانی بریتین لە: قاوەخانە، میوانخانەدار، و ماڵی نوێ.

# ٤٩- ویلا کا تر

WillaCather

١٩٤٧-١٨٧٥

خەڵکی ویلایەتی (ڤیرجینیا)ی ئەمریکا بوو کە زۆربەی ژیانی خۆی لە (نبراسکا) کە یەکێکە لە شارەکانی نیمچە رۆژهەڵاتی ئەو ولایەتە، بەسەر بردووە. زانکۆی لەم ویلایەتە تەواو کرد و ساڵانێکی دوور و درێژ مامۆستا بووە لە قوتابخانەکانی شاری (بتزبورگ).

لە تەمەنی گەنجیدا وازی لە کاری مامۆستایەتی هێنا و پاش ماوەیەك ئاوارەیی، بوو بە سەرنووسەری گۆڤاری بەربڵاوی (مك کلور) و لە شاری نیویورك ئاکنجی بوو. لە پاڵ ئەم کارەدا کەوتە نووسینی کورتە چیرۆکان کە ناوەرۆکی زۆربەیان کەم و زۆر بە دەوری ژیان و داب و نەریت و کار و کردەوەی گوندنشینانی دڵپاك و دێهاتیانی گۆشەگیری ویلایەتی نبراسکا دا دەسوڕێتەوە.

یەکەم چیرۆکی بەناوی (پردی ئەلکساندر) بوو، کە نموونەیەکە لە هەوڵ و تەقەلای تاڵ و شەو و رۆژی ئەو بۆ هەنگاونان بەرەو شۆرەت و سەرکەوتن. ئەم کتێبە بوو بە مایەی سەرنجی گەلێك لە نووسەرانی ئەو رۆژە کە یەکێك لەوانە خا (سارا ئورن جیوئیت ١٨٣٩-١٩٠٩) کە بەخۆی لە چیرۆکنووسە دیارەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمی ئەمریکا بوو. خا جیوئیت ئامۆژگاری ئەوی کرد کە لە چیرۆکنووسیندا، یەك ئامانجی لە بەرچاو بێ ئەویش ئەوەیە (کە سادە و بێ پێچ و پەنا و راستگۆیانە) بنووسێت.

ویلا کارتر بۆخۆی هەمان ئامانجی هەڵبژارد و تا کۆتایی تەمەنی دەستبەرداری نەبوو. چیرۆکەکانی بە شێوەیەکی گشتی بە سۆزێن سادەی بەشەری و ژیانی خەڵکی دڵپاکی گوندنشین بارگاوین، ناوەرۆکی کتێبەکانی زیاتر دەربارەی شێوەی ژیانی هەوەڵین کۆچبارانی ئەوروپاییە بۆ ناوچەکانی ویلایەتەکانی رۆژاوای مەرکەزی. کورتە چیرۆکی (هاپۆ روسیکی) وێنەیەکی زیندوو و روناکی ژیانی خانەوادەیەکی موهاجیری (چیك)ە لە ویلایەتی نبراسکا. پسپۆران ئەم چیرۆکە بە یەکێك لە باشترین بەرهەمەکانی ئەو دەژمێرن.

## ٥٠- ستیفن كرین
## STEPHEN CRANE
## ١٩٠٠-١٨٧١

ناوێكی دیاره لە ئەدەبیاتی ئەمریكادا و لە رووی شۆرەتی ئەدەبییەوە قەرزارباری كتێبی: "نیشانەی سووری ئازایەتی"یە كە بابەت و ناوەرۆكەكەی لە سەر دیمەنە دڵتەزێنەكانی جەنگە ناوخۆییەكانی ئەمریكایە. كرین بەم بەرهەمە بوو بە یەكێك لە چیرۆكنووسە دیارەكانی ناو چیرۆكنووسە گەنجەكانی ئەمریكا و ئەنگوستی بۆ رادەكێشرا. واتە بە نووسینی ئەم كتێبە و زۆر كورتە چیرۆكی دیكە كە (بەلەمی بێ قەرار) لە ریزی پێشەوەیان دێت پایەیەكی بەرزی لەنێو نووسەرانی دنیای نوێدا بەدەست هێنا.

ستیفن كرین لە شاری (نیوئارك) لە پارێزگای (نیوجەرسی) هاتۆتە دنیاوە. دەورانی كورتی ٢٩ ساڵەی تەمەنی سەرانسەر پڕ لە رەنج و ئازار و نەخۆشی بوو. لە هەوڵی بەردەوامدا بوو كە ببێ بە پەیامنێرو رۆژنامەڤانێكی سەركەوتوو، بەڵام بەو ئاواتەی نەگەیی و دووچاری شكست بوو. خەیاڵ و هزر و بیری بەرز و سەلیقەی تایبەتی ئەو لە واری چیرۆكنووسیدا، لە لایەنی رۆژنامەوانان و بڵاوكارانەوە پەسند نەكرا. ئەمە جگە لە بێ جورمی بەدەنی و نەخۆشی بەردەوامی خۆی كە لێی بوو بوو بە سەربار، بۆیە سەرەنجام لە غوربەت داو دوور لە وڵاتی خۆی لە نیعمەتی ژیان مەحروم بوو.

چیرۆكی (بەلەمی بێ قەرار) بووە مایەی سەرنجی زۆربەی نووسەرانی ئەمریكایی و بێگانە لەوانە: (جوزیف كونراد ١٨٧٥-١٩٢٤)ی چیرۆكنووسی ئینگلیزی. كونراد لە بیرەوەرییەكانی خۆیدا سەبارەت بەم چیرۆكە دەڵێت: (ئەوسادەیی، رەوانی و سۆزە بەرزە مرۆڤایەتییەی كە لە رووداوی دەربەدەری چواركەسی ناو بەلەمێكی بچووكی بەر لافاودا شرۆڤە و شەرح كراوە، ئەوەندە بەرزە كە دەتوانرێ بگوترێ دیمەنێكە لە ژیانی واقیعی بەشەر و كێشمانە كێشە هەمیشەییەكانی بەشەر.)

## ٥١- سارا ئۆرن جیوئیت

sara orne jewett

١٩٠٩-١٨٤٩

یەکێکـە لـە نووسـەرە بـە نامێکـانی نیـوەی دووەمـی سـەدەی نـۆزدەی ئـەمریکا و بەرهەمەکانی لە سەرانسەری جیهاندا ناسراون و شەیدایانی زۆریان هەس.

سادەیی و بێ پێچ و پەنایی و راستگۆیی خەسڵەتی زاڵی بەرهەمەکانی بوون.

ئەم نووسەرە خەڵکی نیوئینگلاند بوو، لە شاری "سوت برویك"ی سەر بە پارێزگای (مین) هاتۆتە دنیاوە و زۆربەی تەمەنی خۆی لە سەرزەمینی پڕ گوڵ و گیا و دەریاچە و رووبار و جۆبارانی ئەو دەڤەرە بەسەر بردووە. باب و باپیرانی هەموو بە ئەهلی زانست و خزمەتگوزارانی رۆشنبیری دێنە هەژمار.

سارا هەر لە منداڵییەوە دڵبەندی دیمەنێن جوان و ژیانی سادە و ساکاری گوندییانی نیوئینگلاند بوو. ئەوەی لە دەوروبەری خۆیدا دەیبینی و هەر شادی و خەمێکی کە لە دیتنی ئەو دیمەنانەوە هەستی پێدەکرد، هەر هەمووی بە سادەیی و بێ پێچ و پەنا، بەڵام بە ووشەو ڕستەییێن دڵگیر دەخستە سەر کاغەز. نووسینەکانی بە شێوەیەکی گشتی وەکو تابلۆی زیندوو بوون کە لەگەڵ خوێنەردا دەپەیڤین و خەیاڵیان پێدەبەخشی هەر ئەم نووسینانە بوون کە پاشان بوون بە سەرچاوەی ئیلهامی ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی ئەمریکا.

یەکەم بەرهەمی سارا کتێبێك بوو بە نێوی (پەناگەی قووڵ) کە لە ساڵی ١٨٨٧دا بڵاو بووەوە. ئەم کتێبە بەڕای شارەزایان باشترین (ئوتوبیوگرافی) خەڵکی نیوئینگلاندە و بە جوانترین شێوە داب و نەرێت و رەفتار و رێ و رەسم و هزرو بیری دانیشتوانی ئەو دەڤەرە وەسف دەکات. لەوە بەدواوە ئیدی کتێبەکانی یەك لە دووای یەك بڵاو بوونەوە و پایەیەکی بەرزیان لە دڵی خەڵکی ئەو دەڤەرەدا بۆ وەدەست هێنا.

کورتە چیرۆکی "ماسیخۆری سپی" لە جوملەی ناودارترین کورتە چیرۆکەکانی ئەوە.

## ٥٢- ڕەی.ب. ویست "کوڕ"

Ray.B.West jr

نووسەری چیرۆکی (دووا پاشماوەی ورچانی بۆر) یەکێکە لە نووسەران و ڕۆژنامەنووسانی ناوداری ئەمریکا کە تەمەنێکی لە کاری چیرۆکنوسی، ڕۆژنامەنووسی و خزمەتێن ڕۆشنبیرییدا سەرف کردووە.

خەڵکی شاری (لوگان)ی سەر بە ویلایەتی (یوتا)یە و لە ساڵی ١٨٠٩دا لەدایك بووە و دوای وەرگرتنی کارنامە لە کۆلیژی دەوڵەتی یوتا و زانستگەی یوتا و زانستگەی ویلایەتی (ئیوڤا) دەستی دایە کاری مامۆستایەتی. ساڵانێکی زۆر لە شارەکانی یوتا، مونتانا، کانزاس، میسوری، ئارکانزاس، ویسکونسین و ئیوڤادا دەرسی دەگوتەوە و لە هەمان کاتدا ووتارێن بەسوود و جوانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارانی ئەو سەردەمەدا دەنووسی.

لە تەمەنی ٢٨ ساڵیدا بوو کە گۆڤاری "وسترن ریو ریو"ی بەربلاوی بلاو کردەوە و لەو زەمانەوە ئیدی بە ڕەسمی کاری چیرۆکنووسی و بلاڤۆکانی گرتە دەست.

هەر لەو سەردەمەدا کە کتێبی جوانی مێژوویی و جوگرافیایی و هەروەها کورتە چیرۆکانی دەنووسی کە زۆربەیان مایەی سەرنجی ڕەخنەگرانی ئەدەب بوون هەندێکیان چەند جارێك چاپ کرانەوە لەوانە: "ڕۆژانەکانی ڕوکی، هونەری چیرۆکی مۆدرێن" کە ناویان خستە سەر زاران.

لە بەرهەمەکانی دیکەی: (کۆمەڵە گوتارێك لەمەڕ ڕەخنەی ئەدەبی نویٚ، کورتە چیرۆکێن ئەمریکایی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا. کورتە چیرۆکی هەرە جوانی "دووا پاشماوەی ورچانی بۆر" لە بەرهەمە هەرە باشەکانی ئەوە و لەگەڵ زۆر هەڵبژاردەی (بالاترین کورتە چیرۆکی ئەمریکایی)دا بلاو کراوەتەوە و توانای چیرۆکنووسی و شێوازی نووسین و دەسەلاتی بە سەر بابەتە مێژوویی و جوگرافیاییەکاندا بە جوانترین شێوە دەنوێنیٚ.

## ٥٣- پگی هاردینگ لاف

peggyHardingLove

پگی هاردینگ لاف لە ساڵی ١٩٢٠دا لە شاری شیکاگۆ هاتۆتە دنیاوە و سەردەمی منداڵیەتی خۆی لە (مینیا پولیس) بەسەر بردووە. قۆناغی خوێندنی زانکۆی لە کولیژی (سوئارت مور) تەواو کردووە و هەر لەوێندەر کیژێکی دەرچووی زانکۆی خواستووە و خێزانی پێکەوە ناوە. دەربارەی رووداوەکانی ژیانی خۆی نووسیویەتی کە: "ئێمە لە زۆر شار و ویلایەتی جیاجیای ئەمریکادا بووین، بەڵام هەمیشە ژیانی گوندییانەی نێو دەشتە سەوز و بەرینەکانم لە ژیانی شاران پێ خۆشتر بووە..." تا ئەمڕۆش ژیانی ئەم نووسەرە بە زەوقە هەر بەو شێوەیەیە و زۆربەی تەمەنی خۆی لەگەڵ ژنە خۆشەویستەکەیدا لە ناوچە گوندییەکان و مەزرا جوانەکاندا بەسەر دەبات .

ئەم نووسەرە، هێشتا قوتابی ئامادەیی بوو کە دەستی کرد بە چیرۆکنووسین و یەکەم خەڵاتێك کە لەسەر چیرۆك وەریگرت ئەو کاتە بوو کە هێشتا قوتابی زانکۆ بوو و چیرۆکێکی بۆ گۆڤاری "ئەستوری" نووسی بوو. پاشان زۆر چیرۆکی دیکەی بڵاو کردەوەو ناوبانگی دەرکرد. گۆڤاری بەربڵاوی مادموزال، سێ چیرۆکی جوانی پگی بڵاو کردەوە کە یەکێکیان چیرۆکی "گوێرەکەی جیرزی" بوو.

## ٥٤- ناتانیل هاتورن

NathanielHawthorn

١٨٦٤ – ١٨٠٤

یەکێکە لە چیرۆکنووسە گەورەکانی ئەمریکا کە تا تەمەنی ٤٦ ساڵی وەکو خۆی گوتوویەتی گومناوترین کەسی ناوەندە ئەدەبییەکەی ئەمریکا بووە. بەڵام لەو تەمەنەوە و کە کتێبی "پەیڤی ئاگرین"ی بڵاو کردەوە ئیدی شۆرەتێکی زۆری پەیدا کردو ئەستێرەی بەختی کەوتە بەرزی.

ساڵانێکی زۆر لە گۆڤارو رۆژنامەکانی ئەمریکادا هەندێ جار بەناوی خۆیەوە و هەندێ جار بەبێ ناو چیرۆکەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە.

دوو ساڵ پاش بڵاو کردنەوەی کتێبی پەیڤی ئاگرین زیارەتی بیت المقدس و هەندێ شاری دیکەی شارانی رۆژهەڵاتی ناڤین و نزیکی کرد. پاش ئەوە ماوەی حەوت ساڵان کونسوڵی ئەمریکا بوو لە لیڤەرپول.

لە ساڵی ١٨٦٠دا لە ئەنجامی ئەوەی کە ساڵ و نیوێك لە وڵاتی ئیتاڵیادا مابووەوە، کتێبێکی بەناوی (نیو خودای مەڕمەڕین– The Marble faun) بڵاو کردەوە کە زۆر لە جاران پتر ناوبانگی پێ دەرکرد.

لەم سەر و بەندەدا، کە تەنیا چوار ساڵ لە تەمەنی مابوو، سەرهەڵدانی جەنگێن ناوخۆی ئەمریکا و نەخۆشی تولانی خۆی لە هەموو جۆرە چالاکییەکی ئەدەبییان خست.

جا بەر لەوەی بمرێ، هەموو بەرهەمەکانی لە چیرۆك، نامەی تایبەتی، یادداشتنامە، سەفەرنامە و... . چاپ و بڵاو کرانەوە. شارەزایان و پسپۆران هاتورن بە یەکێك لە نووسەرە شارەزاو لێهاتووەکانی ئەمریکا دەزانن کە لە پەخشاننووسیدا مامۆستاو لە نووسینی چیرۆکی قووڵ و فەلسەفی دا لەناو نووسەرانی ئەمریکادا دیارە. هەردوو چیرۆکی (میوانی شۆرەتخواز) و (چارەی بەردینی مەزن) بە باشترین و ناودارترین کورتە چیرۆکی ئەو دەژمێردرێن.

## ٥٥- ماری بولته

MaryBolte

ماری بولته له ساڵی ١٩٢١ له شاری ریورتن لەدایك بووە كە یەكێكە لە شارەكانی ویلایەتی نیوجەرزی ئەمریكا. پاش تەواو كردنی خوێندنی باڵا لە زانكۆی "ولزلی" چەند مانگێك لە شاری نیویورك نیشتەجێ بوو، پاشان و لە ساڵی ١٩٤٧دا لەگەڵ (چارلز بولتە)ی مێردیدا چووە بۆ ئینگلتەرا و دوو ساڵێك لە زانستگەی ئوكسفورد خوێندی. (كۆتایی قەیران) یەكەم چیرۆكی بڵاو كراوەی ئەم خانمە ئەمریكاییە كە لە ساڵی ١٩٥١دا و لە گۆڤاری "هارپرز بازار"دا بڵاو بووەوە و لە هەمان ساڵدا وەكو باشترین كورتە چیرۆكی ئەمریكایی خەڵاتی ئەدەبی ساڵی وەرگرت.

بابەت و نێوەرۆكی چیرۆكەكە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٢٩ تا سەرەتاكانی دووەم جەنگی جیهانی كە قەیرانێكی دارایی بێ وێنە یەخەی میللەتی ئەمریكای گرت و كە ئەگەر كارزانی و فیداكاری پیاوانی نێوداری وەكو فرانكلین رۆزفڵت-ی سەرۆك كۆماری ئەمریكا نەبووایە، ئەوا نابوودی و بێكاری و تێكشكان، ئەم وڵاتەی بەرەو كودەتاو پارچەپارچە بوون دەبرد.

## ٥٦- كاترین ئانن پۆرتر

katherine anne porter

له نێو نووسەران و چیرۆکنووسانی ئەمریکادا، هەرچەندە بەرهەمێن کاترین ئانن پۆرتر تا ڕادەیەك کەمن، بەڵام وێڕای ئەوەش شۆرەتێکی فرەی لەنێو ئەدەبدۆستانی ئەو وولاتەو وولاتە ئینگلیزی زمانەکانی دیکەی دنیادا هەیە. ڕەنگە هۆی ئەم کەم بەرهەمییەش بگەڕێتەوەبۆ ئەوەی کە خاپورتر نووسەرێکی ورد بین و کنوکۆکارە و تا بەرهەمێك چەند جارێك نەخوێنێتەوەو چەندین جار ووشە و ڕستە و ناوەڕۆکی دەستکاری نەکات و داینەڕێژێتەوە نایداتە بڵاوەکاران و بڵاوی ناکاتەوە.

هەموو ڕەخنەگرانی ئەدەبیات و لایەنگرانی بەرهەمێن ئەو پێیان وایە کە نووسینەکانی ئەم خاتوونە لە هەڵە و پەڵە و غەڵەتی زمانەوانی و درێژدادڕی و ووشەێن زیادە و سەنگەلا بەدەرن. ئەوەی ئەو دەینووسێت جوان و قولڵ و دڵگیر و لێوان لێوی هەست و سوزێن مرۆڤانییە.

(درەختی ئەرخەوان)ەکەی ئەو زۆرجار لەگەڵ هەڵبژاردەی باشترین بەرهەمێن نووسەران دا چاپ بووەتەوە و زەوق و سەلیقە و پایەی ئەدەبی ئەوی بە خەڵکی جیهان نیشانداوە. کورتە چیرۆکی سێرك-ش یەکێکە لە بەرهەمە ناودارەکانی و لە ساڵی ١٩٤٤دا لەگەڵ چەند چیرۆکێکی دیکەدا لە کتێبی (بورجی کەچ و چیرۆکێن دیکە)دا چاپ و بڵاو بووەتەوە.

خاپورتەر لە ساڵی ١٩٨٤دا لە شاری (ئیندیان کریك)ی ویلایەتی تەکزاسی ئەمریکا لەدایك بووە و تا ئەو دەمەی کە وەکو چیرۆکنووسێك شۆرەتی پەیدا کرد، هەرگیز لە خەیاڵی ئەوەدا نەبووە کە ببێ بە نووسەر و تەنانەت پەیوەندی لەگەڵ تاقە نووسەرێکیشدا نەبوو. لە ژینامەکەی خۆیدا دەڵێت:

"تا ئەو زەمانەی کە خەڵکی بە بەرهەمەکانم ئاشنا بوون، تاقە نووسەرێك یان چیرۆکنووسێکم نەدەناسی. چ کەسێك لە ماڵباتی من یان لە ئاشنایانم ئەهلی ئەدەب نەبوو تا بەرهەمەکانی خۆمی نیشان بدەم یا شیرەت و راوێژی پێ بکەم. هیچ کەسێك نەبوو هاندەرم بێ یان ڕێنوێنیم بکات..."

کاترین پۆرتەر وەختێ لە شارە دوورە دەستەکەی خۆی هاتە دەرێ و پێی نایە ناو کۆڕێن زانست و ئەدەب کە لە ڕێگەی نووسینەکانییەوە شورەتی تەواوی پەیدا کردبوو، ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٣١دا خەڵاتی فلوشیپ "گوگنهایم"ی وەرگرت و توانی بە پارەکەی خوێندنی باڵا لە ویلایەتە ڕۆژهەڵاتییەکان تەواو بکات.

## ٥٧- ئۆ. هنری
## O.Henry

ئۆ هنری ناوی خوازراوی نووسەرێکی ناودارە کە ناوی راستەقینەی خۆی (ویلیام سیدنی پورتر)ە کە لە ساڵی ١٨٦٢دا لە شاری (گرینز بورو)ی ویلایەتی کارولینای باکووری ئەمریکا هاتۆتە دنیاوە. لە تەمەنی هەرزەکاریدا بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە دەرمانخانەکەی مامیدا کاری کردووە و ئەوسا لە ساڵی ١٨٨٢دا رووی کردە ویلایەتی تەکزاس و لەوێندەر کەوتە کارکردن لە دنیای چاپەمەنیدا. لە ماوەی ئەو ساڵانەدا بەرهەمە ئەدەبییەکانی لە دوو رۆژنامەی گەورەی ئەم ویلایەتەدا بەناوی دەیلی پۆست و RolliodStoneدا بڵاو دەبوونەوە.

ئۆ هنری پاشان لە یەکێك لە بانقەکانی تەکزاس دا دامەزرا بەڵام زۆری نەبرد کە ئەم بانقە (ئاستین بانك) نابوود بوو و زەرەرێکی زۆری کرد. ئەم تۆمەتە راستەوخۆ بەرەو رووی ئۆ هنری کرایەوە و ئیدی دادسێن یان دادوەر ناچار داوانامەی دژی ئەو دەرکرد. بەڵام ئۆ هنری لەوێندەر هەڵات و ماوەیەك بە دزییەوە لە نیوئەرلیان ژیاو پاشان چوو بۆ وولاتی هندۆراس لە ئەمریکای ناوەندی.

دۆستانی ئۆ هنری و ئەو بیرەوەرینووسانەی کە هەواداری ئەو بوون ئەو لەم مەسەلەیەدا بەبێ گوناح دەزانن، بەڵام ئیعتراف کردنی خۆی گوناحەکەی خۆی لە سەر دەسەلمێنێ. ئۆ هنری کە بیستی ژنەکەی نەخۆشە گەڕایەوە بۆ وولاتی خۆی و ئیدی کەوتە زیندان و پتر لە سێ ساڵی لە زیندانی (ئوهایو)دا بردەسەر.

پاش ئەوەی لە زیندان بەربوو زۆر بە جددی خوی دایە نووسین و بڵاو کردنەوەی کورتە چیرۆکان لە گۆڤارە فرە تیراژەکانی نیویورك و ئیدی بەر لەوەی لە تەمەنی چل و هەشت ساڵیدا و بە نەخۆشی سیل بمرێ ناو و ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد و پتر لە ٦٠٠ کورتە چیرۆکی لە پاش بەجێما.

چیرۆکەکانی ئۆ هنری زۆر کاریگەر و دڵگیر و چڕوپڕ و سفت و مکوم تانووپۆن. کۆتایی چیرۆکەکانی بە زۆری کوتوپڕ و ناگەهان و پێچەوانەی تەسەور و وێناکردنی خوێنەرن.

رەخنەگرانی ئەدەبی، ئۆ هنری بە یەکێك لە پێشەنگانی هونەری کورتە چیرۆك دەزانن و بایەخی زۆر بۆ کارەکانی دادەنەن.

## ٥٨- ئامبروز بییرس

١٨٤٢-١٩١٧

AmbroseBierce

ئەم چیرۆكنووس و نووسەرە خەڵكی (ئوهایو)یە و سالانێكی زۆر وەكو ئەفسەری فەخری لە شەڕە ناوخۆییەكانی ئەمریكادا بەشداری كردو خزمەتی دیاری بە هێزی باكورییەكان كرد.

پاش كۆتایی جەنگ بارگەی پێچایەوە و رووی كردە شاری سانفرانسیسكۆ و لەوێندەر بیرەوەرییەكانی خۆی بە شێوەی زنجیرە ووتارێكی جوان لە رۆژنامە و گۆڤارانی هەفتانەی ئەو دەڤەرە بلاو كردەوە.

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٧٢دا رووی كردە وولاتی ئینگلتەرا و چوار ساڵ لە پایتەختی ئەو وولاتەدا هەر خەریكی نووسینی گوتار و چیرۆكان بوو. لەم شارەدا، یەكەمین بەرهەمی ئەدەبی خۆی كە نموونەی هەڵكەوتووی چیرۆكنووسینی ئەو بوو بە ناوی (دۆڵی روحان)ەوە بە شێوەی كتێبێكی جیا و سەربەخۆ بلاو كردەوە.

پاش چوار ساڵ ئەوسا بییرس بۆ سانفرانسیسكۆ گەڕایەوە و باقی تەمەنی خۆی كە نزیكەی ٢١ ساڵێك بوو لەم شارەدا بە كاری ئەدەبی و رۆژنامەوانییەوە بەسەر برد.

چیرۆكەكانی بە شێوەیەكی گشتی زادەیبیرەوەرییانی رۆژانی پڕ مەینەتی جەنگن. سەربوری قارەمانانی چیرۆكەكانی، خەمناك و ترسناكن. نووسەر هەندێ جار دیمەنەكان بە جۆرێ ئاوێتەی رەگەزێن ترسناك و رووداوێن سامدار دەكات كە مووی لەشی خوێنەر رەق دەكەن. هەندێك لە خوێنەرانی ئەمریكایی چیرۆكەكانی بییرس بە هۆی ئەم تاڵی و سامناكییەیانەوە پەسند ناكەن، لێ رەخنەگرانی ئەدەبی باوەڕیان وایە كە بییرس لە نووسەرە بەتواناكانی ئەمریكایە و بەرهەمەكانی بەشێك لە سامانی نەمری ئەدەبیاتی ئەو وولاتە پێك دێنن.

قارەمانان، یان بە گوتەیەكی دی قوربانیانی چیرۆكەكانی ئەو بە زۆری لە نێوان كەسایەتی تەنیا و مەینەتبارەوە هەڵدەبژێردرێن و لە ئەنجامی رووداوێن سەیر و لە تەسەور بەدەرەوە، دووچاری چارەنووسی شووم دەبن و فەوت و فەنا دەبن.

كورتە چیرۆكی (رووداوی پردی ئول كریك) لە جوملەی ئەو بەرهەمە نەمرانەیە كە شۆرەتێكی فرەی لە نێو ئەدەبدۆستانی ئەمریكادا هەس.

## ٥٩- نیکولای گۆگول

١٨٠٩-١٨٥٢

نیکولای گوگول ناوەکەی مانای "سۆنەی کێوی" دەگەیەنێ، لە ساڵی ١٨٠٩دا لە ئۆکراین هاتۆتە دنیاوە، بەڵام بەرلە تەمەنی ٢٠ ساڵی بە نیازی سامان کۆکردنەوەو شۆرەتی ئەدەبی روویکردە سانپتر زبورگ کە پایتەختی رۆشنبیریی روسیای تزاری بوو. لە ساڵی ١٨٣٦دا لەسەر شانۆنامەی تەنز ئامێزی جەنابی موفەتیش بۆ ماوەی دوازدە ساڵ دوور خرایەوە، چونکە ئەم کارە هونەرییە زۆر بە توندی رەخنەی لە دام و دەزگاو دەسەڵاتی وەخت گرتبوو. لە ساڵی ١٨٣٧ رۆمانی "گیانە مردووەکان". لە ساڵی ١٨٤٢ رۆمانێکی دیکەی بەناوی "تاراس بۆڵبا" بڵاو کردەوە، ئەم رۆمانە دەربارەی خەباتی قۆزاقەکانە لە سەدەی شازدەدا.

لە روسیادا نیکولای گوگول بە باوکی ریالیزم لە ئەدەب دا دەژمێرن، هەرچەند بە رۆمانتیک-ش ناسراوە. تەنانەت فلادیمیر نابوکوف بە "خەیاڵپەروەری"ش ناو بردووە. هەڵبەتە ئەم هەموو تایبەتمەندییە بە رواڵەت ناکۆکانە یەکیان گرتووە و دیارترین و کاریگەرترین کورتە چیرۆکی تا ئەمڕۆکەی دنیایان بەرهەم هێناوە. پاڵتۆ، هاوڕێ لەگەڵ بەرهەمەکانی ئەدگار ئالن پۆو ناتانیل هاتورن و چەند نووسەرێکی دیکەدا پردێکە لە نێوان حیکایەت، واتە شەرح وەرگێڕانەوەی سادەو ساکاری رووداوان، و کورتە چیرۆکی ئەمڕۆکەدا بە هەموو لایەنە ئەخلاقی و شرۆڤە کۆمەڵایەتی و راڤە دەروونییە ئاڵۆزەکانیەوە.

فرانك ئوکانر کە خودانی کتێبی (دەنگی تەنیا)یەو ئەم کتێبە تۆژینەوەیەکی بەرجەستەو جددییەدەربارەی کورتە چیرۆك، دەڵێت ئەگەر بیویستایە ناوێکی دی لەو کتێبەی بنێ ، ئەوا لەوە بوو رستەیەکی لە چیرۆکی پاڵتۆ هەڵبژاردایە: "من برای ئێوەم". ئەم ووشانە. کە لە زاری فەرمانبەرێکی بچووکی بێ پلەو پایەی هەراس لێ هەڵگیراوەوە دەردێ- یەکێك لە هاوارەکانی ئەو کە نوێنەری گوتیاری "راوی" چیرۆکەکەیە بە جۆرێ دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە کە "زۆرجار لە ژیاندا لەم بیرە ترساوەو لەرزی لێهاتووە کە مرۆڤ تا چ رادەیەك دەتوانێ دڵرەق بێ." ئوکانر دەڵێت کە ئەم چیرۆکە "یەکەمین تەجەلیگەی مرۆڤی بچووکە". "هەموو شتێکی ئاکاکی ئاکاکیوفیچ، لە ناوە پێکەنین ئامێزەکەیەوە بیگرە تا کارە هیچەکەی بە یەك ئەندازە

حەقارەتبارە و بەم حاڵەشەوە گۆگۆل بە شێوەیەك لە شێوەکان جیلوەیەکی روحانی بە پوچی ئەو دەبەخشێت."

هەرچەندە مەرج نییە هەر چیرۆکێکی کورت لە شاردا روودات، بەڵام چیرۆکی کورتی ئەمڕۆکە کەم و زۆر رەنگدانەوەی ژیانی ئەمڕۆی شارە بە هەموو نامۆیی و غەریبی و بێگانەییەکیەوە. گوگول وەختێکی زۆر بۆ وەسفی سانپترز بورگ و بە تایبەتی ژیانی فەرمانبەران تەرخان دەکات. پاڵتۆ بە هەمان ئەندازەی کە چیرۆکی ئەو کۆمەڵگەیەیە حیکایەتی "مرۆڤێکی بچووکە کە هەم پێی پێدەکەنین و هەم بەزەییمان پێدا دێتەوە.

گوگول تەکنیکی ریالیستی و رۆمانتیکی و خەیاڵپەروەرانەی بە شێوەیەکی پرشنگدار بەکار هێناوە.

گۆگۆلی خاوەنی "پاڵتۆ"ی شاکاری قەڵەمڕەوی کورتە چیرۆکی جیهانی لە ساڵی ١٨٥٢دا لە کاتێکدا تەواو شێت بووبوو، ماڵاوایی یەکجارەکی لە دنیای ئەدەبیات کرد.

## ٦٠- ئیدگار ئالین پو
١٨٠٩- ١٨٤٩

ئیدگار ئالین پو لە ساڵی ١٨٠٩دا، لە بۆستون-ی ئەمریكا هاتۆتە دنیاوە لە ریچموند، لە ڤیرجینیا و لە ئینگلتەرادا گەورە بووەو، دایك و باوكی خۆی نەبووەو ژن و مێردێك هەڵیان گرتۆتەوە و بەخێویان كردووە. ساڵێكی لە زانستگەی ڤیرجینیا، دوو ساڵی لە سوپای ئەمریكا و ماوەیەكی كورتی لە زانكۆی ڤیست پۆنیت بەسەر بردووە. بڵاو بوونەوەی یەكەم كۆمەڵە شیعری نە دەستكەوتێكی بۆ ئەو تێدا بوو، نە سەرنجی رەخنەگرانی راكێشا. پۆ پاشان كەوتە نووسینی كورتە چیرۆكان كە نێوەڕۆكی زۆربەیان هەجوی تەوسئامێزی زەوقی ئەدەبی دەوران و سەردەمی ئەو بوو. لە ساڵی ١٨٣٥دا پەیوەندی بە گروپی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری "ساوترن لیترەری میسینجەر"ەوە كرد كە هەم چیرۆكەكانی ئەوی بڵاو دەكردەوەو هەم ئەو نووسینە رەخنەییانەیان بۆ بڵاو دەكردەوە كە لەسەر كتێبانی دەنووسین. ئیدی لێرەوە رەوتی ژیانی بە تەواوەتی گۆڕا. لەمە بەدواوە زۆربەی ژیانی بە نووسین و ئامادە كردنی ووتارانی ئەدەبی بەسەر بردو بۆ گۆڤارانی وەكو بالتیموروو فیلادلفیاو نیویورك كاری دەكرد. بەشی هەرەزۆری بەناوبانگترین چیرۆكەكانی لەو گۆڤارانەدا بڵاو كرانەوە.

ناوی پۆ یەكەمجار وەكو رەخنەگرێكی بە ئاژاوە و نەترس و بێ منەت كەوتە سەرزاران. لە ساڵی ١٨٣٩دا "٢٥" چیرۆكی پۆ لە كتێبێكدا بەناوی "ئەفسانەێن غەریب و خەیاڵئەنگێز" هاتە بڵاو بوونەوەو رەخنەگران كەوتنە ستایشی، بەڵام فرۆختی كتێبەكە باش نەبوو. پۆ لە ساڵی ١٨٤٥دا بە بڵاو كردنەوەی قەسیدەی "قەلەڕەش" شۆرەتی پەیدا كردو رێك لەو كاتەدا كە دەرگاكانی شۆرەتی لێدەكرانەوە كەوتنە شەڕەدەنووكی توندو چزودار لەگەڵ جەمعی ئەدیبانی نیوركدا؟ لە ساڵی ١٨٤٥دا (هەڵبژاردەی ئەفسانەكان)ی بڵاو كردەوەو لەمەشیاندا هەر سەركەوتنی بەدەست هێنا. بەڵام بەردەوامی پۆ لە هێرش كردن بۆ سەر ئەدیبان، پەرچە هێرشی ئەوانی بەدواوە بوو، و گێرۆدەی "شەڕی ئەدیبان" بوو. خەنیمان و دژمنان كەوتنە پەلاماردانی شۆرەتی ئەدەبیی ئەوو ئابڕوی شەخسی ئەویان بە واتە وات و بوختانان لەكەدار دەكرد. لە ساڵی ١٨٤٨دا پەخشانە شیعری (دۆزیمەوە)ی بڵاو كردەوە. پۆ لەم پەخشانە شیعرەدا هەوڵ دەدا بیرو خەیاڵی زانستی بە كەشف و شهودی شاعیرانەوە ببەستێ. هەندێ لە جوانترین هۆزانین پۆ لە دوا سێ ساڵی تەمەنیدا

نووسراون و وتراون. پۆ لە ساڵی ١٨٤٩دا و لە بالتیمور لە هەلومەرجێکی ئاڵۆزو نادیاردا، کە تا ئێستاش هەر نادیارە، مرد.
ناوزڕاندن و بەدناو کردنی پۆ پاش مەگیشی هەر بەردەوام و بگرە ئەفسانەی پۆ رەواجی پێدرا، ئەفسانەی پیاوێکی گەندەڵکاری شێت و شور، تلیاکی و مەشروب خۆرو گومان لێکراو. زۆرجار لەگەڵ ئەو شتانەدا کە خۆی لە چیرۆکەکانیدا خولْقاندبوونی بە یەك کەس دەژمێردراو کەسایەتی و خولْق و خووی دەخرایە بەر هێرش و پەلامار. دیارە خەڵکانێکیش هەبوون بەرگرییان لێدەکردو ستایشی هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەیان دەکرد دژی ئەمریکای گەندەڵ و پارەپەرست. بە هەرحاڵ ئەو دوو بۆچوونە دەرهەق بە پۆ هەبوو، و هەر یەکەشیان بنەمای خۆی هەبوو. لەگەڵ ئەمەشدا توێژەرانی تازە هەوڵیان داوە جۆرە هاوسەنگییەك لە نێوان ئەو دوو بۆچوونەدا بەرقەرار بکەن. و لایەنگرییان لە پۆ کردووە وەکو ئەدیبێکی زەین روون و سەرنج تیژ و بەتوانا لە بواری رۆژنامەوانیدا.
پۆ لە ژیاندا زیاتر وەکو رەخنەگر ناسرابوو و دەستکەوتەکانی لەو وارەدا کەم نەبوو. بۆ نموونە، تواناو بەهرەکانی ناتانیل هوتورن-ی کەشف کردو زۆر وریایانەو هوشیارانە لاوازییەکانی شیعرەکانی لانگفیلو-ی دەست نیشانکرد. یەکێك لە بەڵگەکانی بایەخی رەخنەکانی ئەو ئەمەیە کە خۆی زۆر بەهەندی وەردەگرت. باوەڕی وابوو کە رەخنە دەبێ سەربەخۆ بێ و خۆی لە هەموو وابەستەگییەکی لاوەکی دوور بگرێ و تەنیا کاری بە دەقی بەرهەمەکەوە هەبێ. بەلای ئەوەوە رەخنەگر دەبێ توانایەکی تایبەتی لە هەڵسەنگاندن و جیاکردنەوەو گێژەو بێژە و تەتەڵەی دەقدا هەبێ و بۆ ئەوەی ببێ بە خودانی قەزاوەت و داوەرییەکی دروست و ساغڵەم دەبێ یاساو رێسای تایبەت دابهێنێ. پۆ کە حەزی لە ئەدەبیاتی پەروەردەیی نەدەکرد، دەربارەی توانای هونەر جۆرە تێورییەکی داهێنا کە لەو تێورییەدا پێشبینی پرەنسیپی (هونەر بۆ هونەر)ی کردبوو. پۆ لەگەڵ خەیاڵپەروەریدا بوو، پێی وابوو هونەرمەند هەق نییە پابەندی ریالزم و نیشاندانی واقیع بێ. دەیگوت نووسەر ئازادە تا جیهانی تایبەتی خۆی بخولْقێنێ. هەروەها دژی ناسیونالیزی ئەدەبی بوو کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا لە ئەوروپادا باو بوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سووربوو لەسەر ئەوەی کە نووسەرانی ئەمریکایی نابێ لاسایی نموونە ئەوروپاییەکان بکەنەوە. هەرچەندە بەهرەی شاعیرانەی زیاتر بە

کەشف و شهود دەزانی، بە بەڵگەوە داوای دەکرد کە نووسەر دەبێ سەنعەتکار بێ و بایەخی تەواو بە وردەکاری بەرهەم بدات.
ئیدگاری شاعیر لە تاقی لاویدا زۆر لە ژێر کاریگەری بایرون، کولریج، شیلی و کیتس دا بوو. شیعری بە خوڵقاندنێکی جوانی دەزانی و بە هونەرێکی ئامانجداری دەژمارد کە مەبەستی بەرز کردنەوەی روحە. بۆ هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە بە کۆمەکی رەمزێن ئاڵۆز و رازدار بابەتێن لە وەسف نەهاتوو بخاتە روو. لە واری ووشەدا، زیاتر چەمکە ناراستەوخۆکانی ووشەی رەچاو دەکرد تا مانای واقیعی ووشە. هەندێ لە رەخنەگران ستایشی قوڵی شیعرەکانیان کردووە. بەڵام هەندێ رەخنەگری دی گلەییان لە ئاڵۆزی و تەم و مژاوی دەقەکانی کردووە. پۆ هەم لە چیرۆك و هەم لە شیعردا کەسێکی بەتوانا بوو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەوە تاوانبار دەکرا کە چەمکی بازاڕی و خەڵەتێنەر هەڵدەبژێرێت. هەڵبەتە گومان لەوەدا نییە کە حەزیدەکرد هەست بکات بە بریکاری چەمك و مانا. دیارە دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە شیعری پۆ پردێك بوو لە نێوان پەیڕەوانی رۆمانیتیزم و سەمبولیزم، بە تایبەتی لە فەرەنسا. لەو شاعیرە فەرەنساییانەی کە ستایشی شیعری ئەویان دەکرد و لە رووی شیعرەوە خۆیان بە قەرزار باری ئەو دەزانی، دەکرێ ناوی بودلیر، مالارمێ و ڤالیری ببڕێ. جوانی ناسی و ئەزموونی سەمبولیزم زۆر شتیان لە بەرهەمەکانی ئەوەوە وەرگرتووە.
بە هەرحاڵ، دەستکەوتی سەرەکی پۆ کورتە چیرۆکەکانیەتی. پۆ لە بەکارهێنانی بابەتێن سامناکی وەك مەرگ، شێتی، تاوان، نەخۆشی و فەوتاندا وەستابوو لە ئەفراندنی قارەمانانی لات و لەوێرو شێت و دێوانەدا بەهرەمەند بوو. زۆربەی قارەمانانی بەرهەمەکانی گیرۆدەی وەسواسی زەین و گوناهن، لە نێوان ئارەزووە ناکۆکەکاندا وێڵ و سەرگەردانن و توانای موناقەشەیان هەیە، بەڵام لە رووی مرۆڤایەتی و ئەقڵییەوە تەواو نین. لەنێو چیرۆکەکانیدا چیرۆکی داشۆرینی توند، چیرۆکی پۆلیسیانە، چیرۆکی خەیاڵی رۆمانتیك و ئامانجدەرانە بەدی دەکرێ. پۆ مامۆستای چیرۆکی ترس و دڵە خورپێ بوو، چیرۆکی پۆلیسی داهێناوە.
پۆ کەسایەتییەکی سەیر و ئاڵۆزکاو بوو، نووسین و هزر و بیرو خەیاڵیشی بە هەمان ئەندازە ئاڵۆزکاوە. پۆ شەیدای رەمز و رازان بوو هەمیشە هەر لە بیری کردنەوەی ئەو رەمز و رازانەدا بوو. ترسناکترین ترسی دەئەفراند و ئەوجا قاقا پێی پێدەکەنی و گاڵتەی پێدەکرد. شێتانێکی دەخوڵقاند کە لە هەڕەتی شێتایەتیدا پەیرەوی

مەنتقیان دەکرد، یان ئاقلانێکی دروست دەکرد کە لە هەرەتی ئاقڵییدا دەستیان دەدایە شێتێتی. پۆ شەیدای خوڵقاندنی نا هاوسەنگی و ناتەبایی بوو. قارەمانانێکی دروست دەکرد کە لە چاو تروکانێکدا لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی دیکە دەگۆڕان کاریگەری پۆ وەکو کاریگەری نووسینەکانی هەمەجۆرو ئاڵۆزە. کاریگەری بەرهەمەکانی بەسەر بەرهەمی کەسانی وەکو: روبرت فراست، گراهام گرین، فیودور دۆستۆفسکی، رۆبرت لویس، ستیڤنس، ئاندرێ جید، جیمز جویس و خورخەلویس بۆرخس-ەوە دیارە. کاریگەری چیرۆکە ترسناك و پۆلیسییەکانی بەسەر چیرۆکنووسانی ئەو بوارەدا، بە تایبەتی بەسەر کونان دویل-ەوە دیارە. پۆ تەنانەت کاریگەری بەسەر شیعری ئەوروپای ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەمەوەو هەروەها بەسەر شێوەکاری و مۆسیقاشەوە بەزەقی دیارە. مارگریت و دیبوسی لە جوملەی ئەو شێوەکار و مۆسیقاوانەن کە ئیعترافیان بە کاریگەری پۆ کردووە..
دیارە بایەخی پایەی ئەو وەکو داهێنەرێکی گەورە هەر لە یادا دەمێنێ.

## ٦١- شیروود ئەندیرسین

١٩٤١-١٨٧٦

ئەندیرسین لە ساڵی ١٨٧٦دا لە کامدین-ی ئوهایو لەدایك بووە. بە منداڵی لەبەر هەژاری قوتابخانەی سەرەتایی تەرك کردو بە مەبەستی نان پەیدا کردن بۆ خێزانەکەیان شانی داوەتە بەر کاری جۆراوجۆر. لە ڕێگەی کارکردنەوە ئاشنای وەرزێران، ڕەنگ کارانی ناوچەیی و توێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان بووەو شارەزایی لە ژیان و گوزەران و خووخدە و تەبیعەتیان پەیدا کردووە. ژیانی ئەو بابەتە خەڵکە پاشان بووە بە هەوێن و دەستمایەی گەلێك لە چیرۆکەکانی. لە نۆزدە ساڵیدا و بە دووی کارا ڕووی کردۆتە شیکاگۆ و شارەکانی دیکەی ڕۆژاوای ناوەڕاستی ئەمریکا. پاشان چووە ریزی گاردی نەتەوەییەوە لە کۆتایی جەنگی ئەمریکا و ئەسپانیادا بۆ کوبا نێردرا. پاش گەڕانەوە لە کوبا، لە تەمەنی ٢٣ ساڵیدا بۆ ماوەی ساڵێك چووە قوتابخانەی ئامادەیی. پاشان لە شیکاگۆداو لە کاری نووسینی ریکلام دا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا. لە ساڵی ١٩٠٧دا کارخانەی ڕەنگسازی ئەندیرسین-ی لە یەکێك لە شارەکانی ئوهایودا کردەوە. بۆ ماوەی پێنج ساڵان لە کاری دروستکردن و فرۆتنی ڕەنگدا بێ هاوتاو بێ خەنیم بوو و شۆرەت و سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا. ڕۆژێك کوت و پڕ لە کاتی خوێندنەوەی نامەیەك دا بۆ سکرتێرەکەی خۆی لە نووسینگەو کارخانەکەی وەدەرکەوت دوای چەند ڕۆژێك خۆی لە خەستەخانە بینییەوە. تووشی لاوازی ئەعساب بوو بوو، هەر ئەمەش کردییە کارێك کە لە تەمەنی سی و شەش ساڵیدا ڕێگەی هەڵاتن بگرێتە بەر، خۆشگوزەرانی چینی بورژوا وەلاوە بنێ و بەرەو جیهانی هونەر دابکشێ. ئەندیرسین چوو بۆ شیکاگۆ و لەوێندەر سەرقاڵی نووسین بوو. بەخۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "پێیەکانم هێندە لە ئاوی ڕوباری ساردا مانەوە، شێدار و قورس بوونە، ئێستا گەرەکمە ماوەیەك بەسەر زەوی ووشکدا بڕۆم." لە شیکاگۆدا بە کۆمەکی کارل ساند بورگ و ئیدگار لی ماستیرز زەوقی چووە سەر نووسین و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە باوەشیان بۆ کردەوە. ڕۆمانی (فەرزەنی وێندی مەك فیرسین)ی ئەندیرسین باسی سەربوری گوریژگەیەکی لادێی بێکارە کە دەبێ بە خانەدارێکی سەرکەوتوو، بەڵام پاشان عەوداڵی کەشقی حەقیقەت دەبێ و دەستبەرداری خەونی سەرکەوتنی

مادی دەبێ. ئەم ناوەرۆکە جارجاریێ لە بەرهەمەکانی دیکەشیدا دووبارە دەبێتەوە. بۆیە هاوعەسرانی ئەندیرسین، بە هونەرمەندێکی یاخی دەزانن. ئەندیرسین پێشڕەوی ئەو تاقمە نووسەرانە بوو کە پاش کارەساتەکانی یەکەم جەنگی جیهان، بە هاکانی نەوەکانی پێشوویان وەلاناو گرنگیان دا بە ئازادی تاك باوەڕیان وابوو کە کۆمەڵگەی ئەمڕۆ نایەڵێ مرۆڤ بگاتە کەماڵ. ئەم نووسەرانە لەنێو شارستانییەتێکی لێکپچڕاوی بێهودەدا عەوداڵی بەهاو چەمکە ئامانجدەرەکانی خۆیان بوون. ئەمانە کە بە نووسەرانی رینسانس–ی شیکاگۆ ناویان دەرکردبوو لەگەڵ د. ئێچ، لورانس دا هاوبیرو بۆچوون بوون کە دەیگوت شارستانییەت لە تەحەمول نایەت و هەر خەڵکانی کۆن لەناو سروشت داو لەپاڵ سروشتدا بەختەوەری راستەقینەیان وەدەست هێناوە. ئەندیرسین لە ساڵی ١٩٢٥دا رۆمانی (خەندەی تاڵ)ی بڵاو کردەوە. لە ساڵی ١٩١٧دا (پیاوانی بزاڤ)ی بڵاو کردەوە کە رۆمانێکە دەربارەی کانەزوخاڵەکانی پەنسیلڤانیا. لە ساڵی ١٩١٨دا کۆمەڵە شیعری (گۆرانییەکانی ئەمریکای ناوەند)ی بڵاو کردەوە. لە ساڵی ١٩١٩دا کۆمەڵە چیرۆکی (واینز یبرگ ئوهایو)ی بڵاو کردەوە و بەم کۆمەڵە چیرۆکە گەیبیە لوتکەی شۆرەت و ناوبانگ. ئەم کۆمەڵە چیرۆکە لێکدانەوەی سایکۆلۆژین لەمەڕ ژیان لە شارە بچووکەکانی ئەمریکادا. هەندێکیان، وەکو چیرۆکی (دەستەکان) بە حاڵ و هەوایەکی شاعیرانە نووسراوەو هەندێکی تریان تەژی خەمێکە کە وەکو داوە دەزوویەکی نەبینراو بە سەرانسەری چیرۆکەکەداکێشراوە.

(واینز یبرگ ئوهایو) تا رادەیەك بە شێوازی (وێنەی هونەرمەند لە لاویدا)ی جیمس جۆیس نووسراوە. جۆرج ویلیارد، یەکێکە لە دانیشتوانی واینز یبرگ، و لێبڕاوە ببێ بە نووسەر و گەلێك لە خەڵکانی تەنیای ئەوێندەر باسی گرفتەکانی خۆیانی بۆ دەکەن جۆرج لە رێگەی گێڕانەوەکانی ئەوانەوە ناخی خەڵکانی بۆ کەشف دەبێ و دەیخوێنێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بۆی بەدیار دەکەوێت کە هیچی پێ ناکرێ. گۆشەگیری مرۆڤ یەکێکە لەو سێ رەگەزەی کە چیرۆکەکانی ئەم کتێبە پێکەوە دەبەستێ. واتە گۆشەگیری مرۆڤ یەکێکە لە رەگەزە هاوبەشەکانی چیرۆکەکانی ناو ئەم کتێبە. هونەرمەندی و دەست رەنگینی نووسەر لەم کۆمەڵە چیرۆکەدا بە جۆرێ بەرجەستە بووە کە نووسەرانی وەکو هەمینگوای و فۆکنەری هەڵوەدای خۆی کردووەو لاساییان کردۆتەوە.

چیرۆکی (دەستەکان) کە یەکێکە لە چیرۆکەکانی ناو کتێبی (واینز یبرگ ئوهایو) حیکایەتی دەستانێکە کە نائومێدانە بۆ لە هەمێز گرتنی خەڵکانی دی کراوەتەوە. لێ ئەم دەستە کراوانە چ ئەشق و پەیوەندییەك لەم جیهانەدا نابینن.

ئەندیرسین لە ساڵی ١٩٢١دا و پاش بڵاو کردنەوەی رۆمانی (سپیی ماندوو) رووی کردە ئەوروپا و لەوێندەر جیمز جویس-ی بینی. ماوەیەك دواتر لە نیوئورلیاندا ویلیام فۆکنەری "کەشف" کرد. (سەرکەوتنی هێلکە مریشك و ئەسپان و مردووان) بە باشترین کۆمەڵە چیرۆکی ئەو، لە پاش (واینز ئیبرگ ئوهایو) دێتە ژماردن. ئەندیرسین (زەوجینی زۆر)ی لە ساڵی ١٩٣٣دا بڵاو کردەوە.

رۆمانەکانی ئەندیرسین بە پێچەوانەی کورتە چیرۆکەکانییەوە زۆر سەرنج راکێش و سەرکەوتوو نین. چونکە قارەمانەکانی لە رێگەی کارو کردەوەوە گەشە ناکەن و نایەنە ناسین، واتە نووسەر پشتی بە کارو کردەوەی قارەمانەکان نەبەستووە، بەڵکو زیاتر پشتی بە شی کردنەوەو راڤەو شرۆڤەی دوورو درێژ بەستووە.

بەرهەمێن ئەندیرسین لە دەیەکانی ١٩٢٠دا، لە ئەمریکادا زۆر بە رەواج و بەناوبانگ بوون. چینی خوێنەواری ئەمریکا زۆر رمووەدەی بوون و ئەم رەواجەش بیست ساڵێك درێژەی کێشا. لە ساڵی ١٩٤١دا لاینیل تریلینگ-ی رەخنەگری ناوداری ئەمریکا، جورئەتی پەیدا کرد کە پەلاماری شۆرەتی ئەو بدات. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا دەستکەوتە هونەرییەکانی ئەو بۆ دنیای چیرۆکنووسی تاکو ئێستاش هەر بایەخدارن. بڵاو بوونەوەی (بیرەوەرییەکانی شیروود ئەندیرسین) لە ساڵی ١٩٤٩داو هەروەها چاپ کردنەوەی هەندێ لە بەرهەمەکانی و پێشوازی گەرمی خوێنەران لەو بەرهەمانە، بەڵگەی ئەو قسەیەی سەرێمانە.

"مردن لە جەنگەڵدا"، "دەمەوێ بزانم بۆ" ، "هێلکە مریشك"، "گلۆپە دانەگیرساوەکان" ، "ئەو پیاوەی بوو بە ژن" بە باشترین کورتە چیرۆکی ئەو دەژمێردرێن.

ئەندیرسین لە واری نووسینی کورتە چیرۆکدا بە شێوەی یەکەم کەس زۆر بەتوانا بوو. کورتە چیرۆکی (دەمەوێ بزانم بۆ) یەکێکە لەو کورتە چیرۆکە هەرە سەرکەوتووانەی کە بە شێوەی یەکەم کەس نووسراوە. ئەم شێوەیە کە مارك توین یەکەمجار لە (هەکیلبیری فین)دا بەکاری هێنا، لە راستیدا سەرکەوتنی چیرۆکنووسانی ئەمریکاییە. کەم چیرۆکی کورت توانیویەتی بە بنجبڕی "دەمەوێ

بزانم بۆ" بێ تاوانی منداڵێك وێنە بگرێ، كە هێنراوەتە ناو جیهانی گەندەڵییەوە.
ئەندیرسین لە ساڵی ١٩٤١دا لە پەنەمادا مرد.

## ٦٢- ئیڤان تورگینیف

١٨٨٣-١٨١٨

بە گوتەی هینری جیمز، چیرۆکی (بیرەوەری راوچییەك)ی ئیڤان تورگینیف، دەورێکی هێندە گرینگی لە ئازادناسی مسکێنان و رەعییەتانی روسیادا بینیوە، مەگەر هەر "کوخی هاپۆ تۆم" ئەو رۆڵەی لە ئازادیی کۆیلەکانی ئەمریکادا بینیبێ. (بیرەوەری راوچییەك) ناوی کۆمەڵە چیرۆکێکی تورگینیف-ەو دووره لە هەر بانگەشەکا بانگە شارییەك و تورگینیف هێندە زیندووانەو هەوەس بزوێنانەو شاعیرانە وێنەی تەبیعەتی گرتووە، مەگەر هەر لەخۆی بوەشێتەوە. هنری جیمز دەڵێت جیاوازی تورگینیف لە (هریت بیچراستو) لەمەدایە کە چیرۆکەکە بە هونەرێکیٚ هێندە پەنهانی و ناڕاستەوخۆ دەگێڕێتەوە کە بەم نیگایە نایەتە گرتن، هونەرێك کە پتر قولایی دەهاڕوژێنێ تا سەتح.

دیارە ئەم هونەری "پەنهانکارییە"ی تورگینیف چەند بۆخۆی هونەرو نواندنی بازووی هونەرمەندایەتی بووە، جۆرێکیش بووە لە خۆپاسکردن لە خوێنەری تەمەڵ، تورگینیف لە ساڵی ١٨١٨دا هاتۆتە دنیاوە، کوڕی بنەماڵەیەکی زەویداری دەوڵەمەند بووە. پاشان کە گەورە بوو و کەوتە ستایشی گۆگۆل، ئەو گۆگۆلەی کە لەسەر شانۆنامەی تەنزاوی جەنابی موفەتیش دوور خرابووەوە. لە ماڵەوە حەپسیان کرد. بەرە بەرە ئاشنایەتی لەگەڵ رەعیەتەکانی خۆیدا پەیدا کردو هەستی هاودەردی و ئازادخوازانەی لەسەر ئەوان گیرسایەوە. لە ترسی سزای زیاتر نەیدەتوانی راستەوخۆو بیٚ پەردە قسە بکات، بۆیە (بیرەوەری راوچییەك)ی نووسی کە ئەگەر چی ناراستەوخۆ بوو بەڵام کاریگەر بوو. دەڵێن کە تەنانەت خودی تزاریش لە کاریگەری ئەو چیرۆکە بەدەر نەبووە.

چیرۆکەکە بریتییە لە گێڕانەوەی کۆمەڵێك بەرخورد و هەڵس و کەوت و مامەڵە کە گوتیاری یەکەم کەس لە رۆژانی راوەکیدا دەیکات. گوتیار (ڕاوی) ئەو شکار و جەنگەڵ و هەماجەی کە تێیکەوتووە شەرح و شرۆڤە دەکات. وێنەکاری لە چیرۆکەکەدا تەواو زندوو شاعیرانەو مادییە:

"درەختەکان پێکەوە بارستاییەکی تاریکی گەورە چێدەکەن. یەکەمین وردە ستێران لە ئاسمانی شیندا دەردەکەون. باڵندەکان هەموو خەوتوون. تەنیا کلك سوران و هەندیٚ دارکونکەرەی بچووك جارجاریٚ بەدەم خەوەوە فیکە دەکێشن. سەرەنجام ئەوانیش تەسلیمی خەو دەبن.. .

له چیرۆکەکانی تۆرگینیف دا پلۆت "گریێ"یان زۆر کەمە یان هەر نییە: راوچی دێ و دەڕوات، دەبێ بە شەوو رۆژ دەبێتەوە. ئەم قاڵبانە هەستی روودانی شتێك دەگوێزنەوە. بەڵام بەڕاستی چیرۆکەکە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەگوترێت و چ هەقێکی بەسەر رووداوە دیار و رواڵەتییەکانەوە نییە. لە چیرۆکی (ئیرموولای) وژنی ئاشەواندا، راوچییەکەو ئیرمولای لادەدەنە لای ئاشەوانەکە راوچییەکە ژنی ئاشەوانەکە دێنێتە بیر خۆی، بیر لەوە دەکاتەوە.. ئیرمولای قسە دەکات، ژنەکە سەریاندەدات. نان دەخۆن و دەخەون. هەر ئەوەندەو بەس. لەگەڵ ئەمەشدا سەرانسەری ژیانی ئیرموولای و ژنەکە ئاشکرا دەبێت. لە کۆتایی چیرۆکەکەدا، خوێنەر هەموویان دەناسێت، لەو زوڵم و زۆرەی لێیان کراوە، لەو سەبر و حەوسەڵەیەی نیشانیان داوە، حاڵی دەبێ و تێدەگات، هنری جیمز دەڵێت: "ئەم چیرۆکانە هەستی خودی ژیان دەگوێزنەوە، نەك شتێکی دەستکرد".

تۆرگینیف گەلێك رۆمانانی نووسیوەو دەکرێ لێرەدا ئاماژە بۆ رۆمانی هەرە بەناوبانگی باوکان و کوڕان ١٨٦١، و دووکەڵ ١٨٦٧، بکرێ، تۆرگینیف زۆربەی تەمەنی گەورەیی خۆی لە ئەڵمانیا و فەرەنسا بەسەر بردووە، و گەلێك لە رووشەکان– لە جوملەی ئەوانە تولستۆی و دۆستۆفسکی– کە لە رادەبەدەر لە ئەوروپاییان دەژمارد و پەسندیان نەدەکرد. بەڵام ئەوەی راستی بێ تۆرگینیف وەکو جاری جاران لە خەمی روسیاو ئەدەبیاتی روسیادا بووەو لە ناو نوێنی مەرگەوە نامەیەکی بۆ تۆلستوی ناردووە و دەڵێت: "مەبەستم لە نووسینی ئەم نامەیە ئەوەیە کە بڵێم چەند شاد و دڵخۆشم کە هاوعەسری تۆبووم، لەگەڵ تۆدا لە یەك سەردەمدا ژیاوم و پاشان دوا داوای خۆم بخەمە روو. دۆستی ئازیز، بگەڕێوە سەر کاری ئەدەبی"

تورگینیف لە ساڵی ١٨٨٣دا و لە فەرەنسادا کۆچی دوایی کرد.

## ٦٣- لویجی پیراندیللو

-١٨٦٧

لویجی پیراندیللو لەساڵی ١٨٦٧دا لە سیسیلی ئیتاڵیا هاتۆتە دنیاوە، لە هەر دوو زانکۆی ئیتالیا و زانکۆی بۆن خوێندویەتی و دکتۆرانامەکەی لەسەر بەشی دیالێکتی زێدگەی خۆی نووسیوە، پیراندیللو کاری ئەدەبی خۆی بە شیعر دەست پێکرد، بەڵام لویجی کاپویانای رۆماننووسی ناوداری سیسیلی هانیدا کە چیرۆك بنووسێت و پیراندیللو یەکەمین کۆمەڵەچیرۆکی خۆی لە ساڵی ١٨٩٢دا بڵاو کردەوەن ساڵی دواتر رۆمانی (وەدەر نراوی) نووسی، ئەم رۆمانە سەربوردی ژنێکە کە مێردەکەی لەماڵ وەدەری دەنێت و پاش ماوەیەك بەرە بەرە دەبێت بەو کەسایەتییەی کە کۆمەڵگە لە هەوەڵەوەپێشبینی کردووە، تیمە و ناوەڕۆکی هەوەڵین چیرۆکەکانی بریتییە لە روو بە روو بوونی رواڵەت و واقیع، پیراندیللو لەم چیرۆکانەدا لایەنە خەمینەکانی کۆمەڵگە دەخاتە روو، ئەو کۆمەڵگەیەی کە تەنیا بایەخ بەرواڵەت و رواڵەتباری دەدات. پیراندیللو یەکجار حەنەکچی و سولمبەیچی بوو، بەڵام سولمبەتچییەتی ئەو لە چیرۆکەکانیدا زیاتر شەقڵی تاڵ و خەمبارانەی وەرگرتووە.

هەرچەندە پیراندیللو لە چیرۆکەکانی سەرەتایدا لە ژێر کاریگەری ریالیستانی سیسیلی وەکو ورگا و کاپویانادا بووە بەڵام هەر زوو خووی دایە دۆزینەوەی بابەت و نێوە رۆك، رۆمانی "ماتیا پاسکالی رەحمەتی ١٩٠٤" سەربوری پیاوێکە کە رۆژێك هەواڵی مەرگی خۆی لە رۆژنامەك دا دەبینێ، ئەم کابرایە کە ژیان و کوێرەوەری ژیان لە گیانی خۆی بێزاری کردووە بە خوێندنەوەی هواڵی مەرگی خۆی شادمان دەبێت و ماڵ شاری خۆی بە جێدێڵێ، پیراندیللو باوەڕی وا بوو کە کەسایەتی مرۆڤ دیاردەیەکی زەینی یەو پەیوەستە بە شێوەی بیرکردنەوەوە و چەندین جار دەستە وارەی "رێژەیی کەسایەتی" بەکار بردووە، ئەم بیر و هزرەی، کە لە رووی فەلسەفی یەوە رەتکراوەتەوە لە ئالفریربینیە و هانری بیرگسونی جووتە فەیلەسوفی فەرەنسییەوە وەرگرتبوو، بەڵام زۆر بەراشکاوی و دڵنیاییەوە دەریدەبڕی.

لویجی پیراندیللو لە زمانی دیالۆگ و گفتوگۆدا زۆر بەتوانا بوو هەر ئەمەش بە شێوەیەکی ئاسایی بەرە و شانۆی ڕاکێشا. یەکەمین شانۆنامەی (شەڕەنگێزی) لە ساڵی ١٩٠٨دا نووسی. لە ساڵی ١٩١٦دا لە ماوەی یەك ساڵدا نۆ شانۆ نامەی نووسی لەوانە:

"ئەگەر وا بیر دەکەیەوە هەق بەتۆیە" کە شۆرەتی پێ بەخشی، هەڵبەتە لە نووسینی ئەم شانۆ نامانەدا شێوەی باوو تەقیلدی بەکار هێنا، لێ تێکەڵبوونی لەگەڵ گروپێن پێشرەودا کردییەکارێ کە پەی بە گرنگی هاو ئاهەنگی و هاوسەنگی رەگەزەکان بەرێ، لە ساڵی ١٩٢١دا شانۆ نامەی "شەش کەسی عەوداڵی نووسەرێك"ی نووسی و کە بەمە شۆرەتێکی جیهانی وەدەست هێنا،شەش کەس عەوداڵی نووسەرێك، هەر کەسەو بە شێوەی خۆی ١٩٢٤و ئەمشە و دەکەین بە شەوی خۆمان ١٩٢٠، کۆمەڵە شانۆ نامەی سییانەی پیراندیللو پێك دەهێنن کە خۆی ناوی نان "شانۆ نامەین سیانەی شانۆ لە نێو شانۆ"دا، بەم سێ شانۆنامەیە توانای شانۆیی پیراندیللو بۆ هەموو کەسێك دەرکەوت، پیراندیللو جەختی لەوە دەکرد کە شانۆ خەیاڵە، چونکە خۆی لە خۆیدا فۆرم یان وێنەیە، پیراندیللو بە شانۆ نامەکانی کودتایەکی لە تەکنیکی شانۆی تازەدا بەرپا کرد، ئەو قەرار دارە باوەکانی شانۆی رەفز دەکرد، چونکە پێی وابوو تەکنیکە کۆن و باوەکان ئاستی ئەزموونی شانۆ لە جیاتی داهێنان و بڵاوبردن، تاڕادەی سەرگەرمی دێنێتە خوارەوە و تەمەشاڤان تەمەڵ دەکات. ئەو لە شانۆ نامەکانی خۆیدا تەکنیکی تەقلیدی دەخاتە بەر پرسیار، پەردەکانی خەیاڵ یەك یەك وەلاوە دەنێ تا بگاتە حقیقەتی رووتی هەلو مەرجەکانی ژیانی ئادەمیزاد. چونکە پێی وابوو کە تەنیا بە ناسینی ئەم حەقیقەتە دەتوانرێ دڵ بەرزگاری مرۆڤ خۆشبکرێ.

شانۆ نامەی "هزی چوارەم–١٩٢٢" کە بەیەکەمین شانۆنامەی پوچی دێتە ژماردن، لە شانۆ نامەکانی دیکەی پیراندیللو زیاتر نوێنراوە. پوچی دێتە ژماردن، لە شانۆ نامەکانی دیکەی پیراندیللو زیاتر نوێنراوە، تراژیدی هزی لە مەدایە کە ئەو دەمامکی شێتایەتی یەی کە بە هوشیارییەوە لەسەری دەکات و لە دەموچاوی خۆی ناوە، لە کۆتایی شانۆ نامەکەدا، بە حوکمی هێزێکی سۆزداری کە لە دەسەڵاتی ئەو بەدەرە، دەبێ بە بەشێك لە بوونی ئەو، پیراندیللو لەم شانۆ نامەیەدا ئاماژە بۆ ئەو دەمامکانە دەکات کە کۆمەڵگە لە چارەمانی دەبەستێ و جگە لە ئەنجامدانی ئەو رۆڵە، چاوەڕوانی چ شتێکی دی لە ئێمە ناکات، بەرجەستەکردنی بێ ناسنامەیی و دابەزینی کە سایەتی ئادەمیزاد تا رادەی ئەوەی کە دەورێکی کۆمەڵایەتی بگێرێ گەورەترین دەستکەوتی شانۆی پیراندیللو بووە، پیراندیللو لەگەڵ بیرتۆڵت بریشت، جۆن میلینگتین سینگ و بوجین ئونیل دا بە چوار شانۆ نامە نووسی گەورەی سەدەی بیستەم دەژمێردرێت.

لـویجی پیرانـدیللو ژیـانێکی زۆر ناخۆشـی هـەبوو. شـێتێتی ژنـە هـەرە جوانەکـەی یەکێکە لە ترا ژیدیایەکانی ئەو، ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە کە باشترین بەهەمەی خۆی لە قۆناغی هەرە نارەحەتی ژیانی خۆیدا بەرهەم هێناوەن واتە لەو قۆناغەدا بووکە سەر پەرشتی ژنە شێتەکەی دەکرد و کوێرەوەری و هەژاری تەنگیانی پێ هەڵچنی بوو. پیراندیللو لەگەڵ ئەوەشدا لە باری ئەدەبییەوە زۆر پڕ بەرهەم بوو، جگەر لە حەوت رۆمان و پەنجا شانۆنامە، دوسەد و پەنجا کورتە چیرۆکیشی بڵاو کردەوەن نیوەی شانۆنامەکانی لە چیرۆکەکانی خۆیەوە هەڵێنجیاوە.

درۆ بـوونی رواڵـەتان، نـەبوونی رەگـەزی یەکپارچـە لـە کەسـایەتیدا کـە بـە شـێوەی حاڵـەت، بـاوەڕ، هەسـت سـۆز و گـوداز و مـنی هەمـە جـۆر دەردەکـەوێ، نـەمری کاراکتەرانی چیرۆکڤانی لە هەمبەر کەسانی واقیعیدا کە دەمرن و لە بیر دەچنەوە، هەر وەها خۆنواندنی رەگەی مرۆڤ کە گوایە لەسەر بنەمای عەقلانی دەژی، هەندێك لە کەڵکە لەو خولیا زەینی یەکانی پیراندیللوی چیرۆکنووس پێك دێنێ. خوێنـەر کـە چیرۆکەکانی پیراندیللو دەخوێنێتەوە یان شانۆ نامەکانی دەبینێن دەگاتە هەندێ ئەنجام و ئەنجامگیری ئەو تۆ کە زۆر بنەڕەتی ترن لەو هزر و بیر و بۆ چوونانەی کە ئەو بە خۆی لە بەرهەمەکانیدا نیشانی داون و بەرجەستەی کردوونن ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی بەرهەمێن نووسەرێکی مەزن.

## ٦٤- ئیساك بابیل

-١٨٩٤

ئیساك بابیل لە ساڵی ١٨٩٤دا لە ئودسیا لە دایك بووە، بابیل هەر بە منداڵی ماڵبات و خێزان و زێدی خۆی بە جێهێشت، هەوەڵجار چوو بۆ کییف، پاشان بە قاچاخ و بەبێ فایل و مۆڵـەتی ئاکنجی بوون چـوو بـۆ سـان پترزبۆرگ، لـەم قۆناغـەدا بیسـت و یـەك ساڵان بوو، بابیل لەوێندەر، لە شەقامی پوشکین، لە ژێر زەمینێکدا دەژیا و چیرۆکی دەنووسـی بـەڵام کـەس گـوێی نـە دەدایـی، ماکسـم گـۆرگی فریـای کـەوت و چیرۆکی "ئیسـا کـومێچ و مارگاریتـا"ی لـە بـڵاو کراوەکـەی خۆیـدا بـۆ بـڵا و کـردەوە، لەگـەڵ ئەمەشدا پێی گوت کە ئەم چیرۆکەی ئەو بەرێکەوت بڵاوبوەتەوە و ئامۆژگاری کرد کە دەسـتبەرداری ئـەدەبیات بـێ و بچـێتە "نـاو خـەڵکی". بابیـل دەربـارەی گـۆرگی گوتویەتی کە لە هەموو شتەکانی خۆیدا قەرزارباری ئەوە. بابیل پاشان لە سوپای سـووردا و لـە بـەرەی رۆمـانی دا کەوتـە خزمـەت، لـە سـاڵی ١٩١٧دا لایـەنی بەشەویکەکانی کرد و بۆ لهوستان (هۆڵەندا) رەوانە کرا. دوای پێنج ساڵان کۆمەڵە چیرۆکی "سەربازی سوارە ١٩٦٢"ی بڵاو کردەوە کە لە راستیدا بیرەوەری خۆیەتی دەربارەی ئەو سەفەرەی و بەمەش شۆرەتێکی پەیدا کرد، هەواڵە گونجاو ورد و مانا دارەکانی ئەم کتێبە دەوڵەمەندییەکی تازەی بەزمانی روسی بەخشی، کاراکتەرەکانی بابیـل لـەم چیرۆکانەدا یـان خـەڵکانی سـادە و بـێ رتوشـن یـان رۆشـنبیرانی لاواز و هەسـتیارن، سـەربازی سـوارە راپـۆرتێکی حەماسـی ئـەزموونی ئەفسـەرێکە کـە لـە هەنگی قوازقدا دانراوە، ئەو دڵرەقی و توند و تیژییـەی لـەم چیرۆکانەدا نیشاندراوە سنورو رادەی نییە بەڵام بە تۆنێکی لیریکی دێتە دەربڕین و پڕە لـە نـز و ئاڵۆزی، بە جـۆرێ کـە خوێنـەر یەکـەمجار نـاتوانێ ئـەوە دەسـت نیشـان بکـات کـە گوتیـار بـە تۆمارکردنی ئەو هـەموو دڵرەقی بگرێ یان دژی بوەستێ، یەك شێوازی، کورتبڕی، چیرۆکەکانی سەربازی سوارە بەخشیوە. ئیساك بابیل لە تەمەنی ٢٦ ساڵیدا و لە وولاتی بێگانەدا، لە لهوستان، وێڕای ئەوەی زۆری دیتووە و زۆری تەحەمول کردووە بەڵام خۆی لە سەرەتای رێگەدا دەبینێ، بۆیە لێدەبڕێ توانای خۆی تاقی بکاتەوە، ئـەم تاقیکردنەوەیـە نوانـدنی ئازایـەتی نییـە، ئیسـاك بابیـل لێکچـوونی زۆری لەگـەڵ سـتیخن کـرین و ئێرنیسـت هیمینگوایـدا هەیـە، بـەڵام ئـەو پرسـیارەی ئـەو روو بـە روویـەتی ئـەو پرسـار و مەسـەلەیە نییـە کـە ئـەو نووسـەرە نـاو دارە ئەمریکاییانـە بایەخی زۆریان دەدایێ، بابیل لە خۆی نا پرسێت کە ئایا دەتوانێ بە شانازییەوە

روو بـەرووی خەتـەر بێتـەوە، بـە گوتەیـەکی دی ئایـا دەتـوانێ "کـوژران" تەحـەمول بکـات؟ بـەڵکو بـەلای بابیلـەوە ئـەم پرسـیارە گرینگـە کـە ئایـا دەتـوانی "کوشـتن" تەحەمول بکات، لە کورتە چیرۆك "پاش شەڕ" گوتیاری چیرۆکەکە لـە مامور بـە تێك دەگەڕێنەوە، بەڵام هاوڕێ قۆزاقەکەی لێی تورەیە، نەك لەبەر ئەوەی ترساوە، بەڵکو لەبـەر ئـەوەی بەتفـەنگی خاڵییـەوە سـواری ئەسـپ بـووەن سـەنجام چـیرۆکەکە بـەم داوایـەی گوتیـار لـە قـەدەر کۆتـایی دێ کـە " سـادەترین بـەهرەم بـدەیێ، بـەهرەی کوشتنی هاو جۆرانی خۆم." .

زەرورەتی تەسلیم بوون بە تاقیکردنەوە لە چیرۆکەکانی دیکەی بابیلدا دەبینین، لـە چیرۆکی "یەکەم قازی من"دا فەرمانـدەی کەشـخە تـەوس بـە قۆزاقێکی تـازە دەکـات، چـونکە عەینـەکی لـە چاوە، رۆشـنبیر و دڵناسـکە و بـەینی لەگـەڵ دڵڕەقـی و تونـد و تیژیدا نییە، بەرپرس دەڵێت:

"ئێمـە لێـرەدا جێمـان نییـە بـۆ ئـەو کەسـانەی بیردەکەنـەوە، منـداڵان دەبـێ بچـن لـە باوەشـی دایکیانـدا بنـوون." پێـنج کـەس لـە هاوڕێیـانی قوزاقەتازەکـە ئـەوە روون دەکەنـەوە کـە ئـەو غەریبـە و بەکـەڵکیان نایـەت. ئیـدی هـەموو سـەردەخەنە سـەری و ناڕەحەتی دەکەن، بەڵام ئەو بەیەك رەفتـار دژمنایـەتی ئـەوان سـەبارەت بـە خـۆی و بـە عەینەکەکەی دەسڕێتەوە. برسییە و داوای خواردن لـە ژنـی خـاوەن ماڵ دەکـات. ژنـە قازەکـەی خـۆی دەداتـێ تـا سـەری ببڕێ، پیاوەکـە "قوزاکـە" بـە دڵڕەقـی قازەکـە سـەر دەبڕێ و پاشان نوکی شمشێرەکەی خۆی تێ دەچەقێنێ و بۆ ژنەکەی درێژ دەکات و دەستوری دەداتێ کە چاکی بکـات بـۆ خـواردن، ئێسـتا قەیرانەکـە نیشـتۆتەوە، بـاجی کۆمەڵگە دراوە. گروپە پێنج نەفەرییەکە نهوو بوون بە شەش، هەموو شتێك بە باشـی و بە خۆشی رەت بووە قسە و باس دەکرێ، پاشان دەخـەون "خـەوتین، هـەر شـەشمان لە ژێر یەك میچ دا کە لە بـەینی دارە ڕاکەیـەوە ئەسـتێرەکان دەبینـران، لاقمـان تێکـەڵ بـوو بـوو، یـەکترمان گـەرم دەکـردەوە، خـەونم بـینی، خـەونم بەژنانـەوە بـینی، بـەڵام دەستەکانم خوێناوی بوون، غەرق لە خوێندا". بەرهەمێکی دیکە بابیل، چیرۆکەکانی ئودیسـا-یەکـە لـە سـاڵی ١٩٢٠دا لـە مۆسـکۆ بـڵاو بـووە وە. ئـەم کۆمەڵـە چـیرۆکە ئودیسـای بـەر لـە شۆڕشـی نیسـان دەدا، شـانۆ نامـەکانی بابیـل: (ئـاوابوونی رۆژ- ١٩٢٨، مۆسکۆ) و (ماریـا-١٩٢٢، مۆسکۆ) نـاو بـانگێکی ئـەو تۆیـان نـەبوو. ئیسـاك بابیـل لـە یەکـەمین کـۆنگرەی نووسـەرانی سـۆڤیەت کـە لـە سـاڵی ١٩٢٤دا بـەر پـابوو بەشداری کرد و ووتەیەکی سادەی خوێندەوە کە پاشان دەرکەوت کە زۆر تەنز ئامێز

بووه. له ساڵی ١٩٢٦ به دواوه به هیچ جۆرێ ناوی ئەم چیرۆكنووسە بلیمەتە لە هیچ بلاّ و کراوەیەکی سۆڤییەتدا بەرچاو ناکەوێت، وون بووه.

## ٦٥- ئەلبیر کامۆ

### ١٩١٣-١٩٦٠

لە ١٩١٣/١١ لە مۆندۆڤی – جەزایر لە دایك بووە، بابی لە کارخانەیەکی شەراب سازیدا کرێکاری جلیکانەسازی بووە.

- لە ساڵی ١٩١٤دا بابی کامۆ لە شەڕدا دەکوژرێ. دایکی ماڵ دەگوازێتەوە بۆ گەڕەکی بلکوری جەزایری پایتەخت و لەوێندەر نیشتەجێ دەبێت. (لە چیرۆرکی نامۆدا، مەرسۆش دانیشتوی هەمان گەڕەکە) . دایکی کامۆ ژیانێکی هەژارانە لەم گەڕەکەدا بەسەر دەبات.
- لە ساڵی ١٩١٨دا، کامۆ دەچێتە قوتابخانەی سەرەتایی بل کورت.
- لە ساڵی ١٩٢٣دا دەچێتە قوتابخانەی ناوەندی و وەکو قوتابییەکی زیرەك دەوڵەت مەسرەفی دەکێشێت.
- کامۆ، لە ساڵی ١٩٢٨دا، داخلّی گروپی فوتبۆڵی، تیپی زانستگەی جەزایری پایتەخت دەبێ.
- لە ساڵی ١٩٢٩دا بۆ یەکەم جار ئاشنایەتی لەگەڵ بەرهەمەکانی ژیدا پەیدا دەکات.
- کامۆ لە ساڵی ١٩٣٠دا قۆناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکات. یەکەمین شوێنەواری نەخۆشی سیلی لێ دەردەکەوێ.
- کامۆ لە ساڵی ١٩٣١دا داخلّی شەشەمی ئەدەبی دەبێ، جیرگرنەر مامۆستای دەبێ کە پاشان دەبێ بە خەمخۆر و هاوڕێی هەرە دڵسۆزی کامۆ.
- کامۆ، لە ساڵی ١٩٣٣دا دەچێتە ریزی راپەڕین و دژی فاشیزم دەخەبنێ. لە ساڵی ١٩٣٤دا یەکەم ژن دێنێ و دوای دوو ساڵ لە یەکەم هاوسەری جیا دەبێتەوە دەچێتە ریزی حیزبی کۆمۆنیست: دەبێ بە لێپرسراوی راگەیاندن لە ناو کۆڕو ئەنجوومەنە مەسڵمانەکاندا.
- لە ساڵی ١٩٣٥دا دەچێتە زانستگەی جەزایر. بۆ بژێوی خۆی، زۆر کاری ناچیزە و سوك دەکات.

- له ساڵی ١٩٣٦دا، نامەی دبلۆمی خوێندنی باڵای خۆی کە دەربارەی.. پەیوەندی زانستەکانی یۆنانی و مەسیحیەت بوو، نووسی، کەوتە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی پاسکال و کیرکە گارد.نمایشی کاری دروست کرد نمایشی: شۆڕش لە ئاستوری نووسی و نمایش کرانی قەدەغە کرا. هەر لەو ساڵەدا هاریکاری لەگەڵ گروپی نمایشی رادیۆی جەزایردا دەکات.
- له ساڵی ١٩٣٧دا، کامۆ چەند گوتارێك  لە رۆژنامەی جەزایری کۆماری خوازدا دەنووسێت، هەر لەو ساڵەدا کۆمەڵە وتارێکی خۆی بە ناوی (پشت و روو)ەوە بڵاو دەکاتەوە.
- له ساڵی ١٩٣٨دا ئاشنایەتی لەگەڵ بەرهەمەکانی (نیچە)دا پەیدا دەکات. هەر لەو ساڵەدا دەست بە نووسینی (کالیکۆلا) دەکات.
- له ساڵی ١٩٣٩دا کۆمەڵەی (شادی) بڵاودەکاتەوە.
- له ساڵی ١٩٤٠دا دووبارە ژن دێنێتەوە. هەر لەو ساڵەدا کامۆ جەزایر بەجێ دێڵێ. نامۆ، تەواو دەکات.
- له ساڵی ١٩٤١دا ئەفسانەی سیزیف تەوا و دەکات. لە ریزی (راپەڕینی خەبات)دا دەخەبتێ.
- له ساڵی ١٩٤٢دا نامۆ بڵاو دەبێتەوە.، دابەزینی متفقین لە جەزایردا، کامۆ تا رزگاری فەرەنسا لە ژنەکەی دادەبڕێ.
- له ساڵی ١٩٤٣دا ئەفسانەی سیزیف بڵاوبووە وە. کامۆ لە لایەن رۆژنامەی کومباوە بۆ پاریس دەنێردرێ. دەکرێ بە راوێژکاری ئەدەبی بڵاوەخانەی گالیمار، یەکەمین نامە بۆ دۆستێکی ئەڵمانی بڵاو دەکاتەوە.
- له ساڵی ١٩٤٤دا شانۆنامەی (بەدحاڵی بوون) نمایش دەکرێ. ئاشنایەتی لەگەڵ سارتەردا پەیدا دەکات. سەر وتارکانی رۆژنامەی کومبا دەنووسێت.
- له ساڵی ١٩٤٥دا کامۆ لە جەزایردا دەکەوێتە تەحقیق دەربارەی کوشتاری موسڵمان لە ستیف. شانۆنامەی کالیگۆلا نمایش دەکرێ. ئاشنایەتی لەگەڵ ژیرار فیلیپی (ئەکتەر)دا پەیدا دەکا.

- له ساڵی ١٩٤٦دا بۆ وڵاته یەکگرتووەکان سەفەردەکات. لەگەڵ رنیەچاری شاعیردا دۆستایەتی پەیدا دەکات. هەر لەو ساڵەدا ئاشنایەتی لەگەڵ بەرهەمەکانی سیمون ویل دا پەیدا دەکات.
- له ساڵی ١٩٤٧دا دژی بێدادی لە مادەگەشکەردا دەوەستێ و نارەزایی دەردەبڕێ، دەس لە رۆژنامەی کومبا هەڵدەگرێ، هەر لەو ساڵەدا رۆمانی تاعون بڵاودەبێتەوە.
- له ساڵی ١٩٤٨دا بۆ جەزایر سەفەر دەکات. شانۆنامەی حوکوومەتی نیزامی نمایش دەکرێ.
- له ساڵی ١٩٤٩دا نەخۆشییەکەی کامۆ زیاد دەکات. هەر لەو ساڵەدا شانۆنامەی (دادپەروەران) نمایش دەکرێ.
- له ساڵی ١٩٥٠دا چالاکییەکانی کامۆ زۆر کەم دەبێتەوە. بەشی یەکەمیactuelles (راستیەکان) بڵاودەکاتەوە.
- له ساڵی ١٩٥١دا مرۆڤی یاخی بڵاو دەکاتەوە. شەرە نووسین لەگەڵ چاپەمەنییە چەپە توندڕەوەکان..
- له ساڵی ١٩٥٢دا بۆ جەزایر سەفەر دەکات. پەیوەندی لەگەڵ سارتەر دەبڕێ.
- له ساڵی ١٩٥٣دا لایەنگری لە شۆڕشگێرانی بەرلینی رۆژهەڵات دەکات. بەشی دووەمیactuelles (راستییەکان) بڵاو دەکاتەوە.
- له ساڵی ١٩٥٤دا چالاکی سیاسی و ئەدەبی کامۆ کەمتر دەبێتەوە. هەر لەو ساڵەدا (هاوین) بڵاو دەکاتەوە.
- له ساڵی ١٩٥٥دا شانۆنامەیuncasinteressant (حاڵەتێکی سەیر) نمایش دەکرێ. لە نووسینێکی بۆ زاتییەوە ئامادە کراوە. سەفەر بۆ یۆنان دەکات. هەر لەو ساڵەدا هاوکاری لەگەڵ ئیکسپرس دا دەکات.
- له ساڵی ١٩٥٦دا، لە مانگی یەك دا سەفەر بۆ جەزایر دەکات، موحازەرە دەدات: بانگەوازی ئاشتی، هاوکاری خۆی لەگەڵ ئیکسپرسدا دەبڕێت (سقوت) بڵاودەبێتەوە. شانۆنامەی نوێژی مردوو لەسەر ئافرەتێکی رەبەن (راهبە) لە نووسینێکی فاکنرەوە ئامادە کراوە، پێشکەش دەکرێ.
- له ساڵی ١٩٥٧دا خەڵاتی نوبڵی ئەدەبیات وەردەگرێ. هەندێ تێفکرین لەمەڕ ئیعدام. بە هاوکاری ئارتور کوستلەر، بڵاو دەکاتەوە.

- له ساڵی ۱۹۵۸دا موحازەرەیەك له سوید. بەشی سێیەمیActuelles (راستییەکان) بڵاو دەکاتەوە.
- له ساڵی ۱۹۵۹دا شانۆنامەی posse,de,s (له نووسینێکی دوستو فسکییەوە ئامادە کراوە) نمایش دەکرێ.
- له ساڵی ۱۹٦۰/ له ۱۹٦۰/۱/٤دا کامۆ بە دەعمی ئۆتۆمبیل له نزیکی مونترو گیانی لە دەست دەداو دەمرێ.

## ٦٦- جيمز جويس

١٨٨٢-١٩٠٤١

جيمـز جـويس لـه سـاڵى ١٨٨٢ لـه دبلـين لـه دايكبـووه لـه تەمـەنى شـەش سـاڵيدا چووەتەقوتابخانەى شەوانە رۆژى تايبەت بە چينى دەوڵەمەندى كاتۆليك، دواى سىٚ ساڵ، پاش ئەوەى بابى نابوو بوو و سەروەت و سامانەكەى لە دەست، بە ناچارى لە قوتابخانـەى نـاو بـراو هاتـە دەرىٚ، جـويس لـە قوتابخانـە ئـاينى و مەزەبييەكانـدا پەروەردە بوو و يەگجار توندڕەو بوو و لە ئەنجامدا كەوتە دژايەتى مەزەبى كاتۆليك، لەگەڵ ئەمەشدا مەزەب بوو بە كەڵكەڵە و وەسوەسەى هەميشەيى زەينى ئەو، جويس لە زانكۆى دبلين دا كەوتە خوێندنى زمانى تازە، بەڵام سەرەڕاى بەهەرەى درەخشانى لـە زمـان ناسـيدا، وێڕاى زەيـن روونـىٚ لـە رادە بـە دەرى لـەو وارەد، چـونكە بـەردەوام خـەريكى ئـەدەبياتى كـۆن و تـازەى جيهـان بـوو، لـە وارى زمانـدا نەگـەيى بـە هـيچ. لـە سـاڵى ١٨٩٩دا، لـە تەمـەنى هەژدەسـاڵيدا ووتـارێكى بـە نـاوى "شـانۆ نامـەى نـوێى ئيبسين" لە گۆڤارى (فورت نايتاى ريوريو)دا بڵاوكردەوە و بوو بە مايەى رەزامەنـدى شـانۆ نامەنووسـى بـە تەمـەن، جـويس پـاش وەرگـرتنى پلـەى بـەكالوريوس، بـۆ خوێندنى پزيشككە رى رووى كردە پـاريس، بەڵام زۆرى نـەبرد وازى لـەم بيرە هێنـا، لە ساڵى ١٩٠٢٠دان وەكو لە رۆمانى ئوليس دا ديارە، بە بۆنەى مەرگى دايكييەوە بۆ دبلين بانگ كرايەوە، جويس لەم ساڵەدا مژولى نووسينى كورتـە چيرۆكانى (دبلـينى يـەكان) بـوو، ئـەم كۆمەڵـە چيرۆكە قـەرار بـوو لـە سـاڵى ١٩٠٦دا بڵاوبێتـەوە بـەڵام تـا سـاڵى ١٩١٦ دوا كەوتـە، جـۆيس، لـە دواى مـەرگى دايكـى سـاڵێكى تـەواوى بـەكارى جۆراوجۆرەوە لە دبلين بەسەر بـرد. لـە سـاڵى ١٩٠٤دا ئاشـنايەتى لەگـەڵ كيژێكـدا بـە ناوى نورا پەيدا كرد و لە حوزەيرانى هەمان ساڵدا گەشتێكيان بۆ دەرێى شار كـرد و عاشـقى بـوو، ئـەم ئاشـنابوونە يـەكێك لـە رووداوە بنەڕەتييـەكانى رۆمـانى ئـوليس پێكدێنىٚ.

جـويس كـە زانـى ژيـان لـە ئيرلەنـدەدا هەرەشـە لـە گەشـەكردنى ئازادانـەى روح و هونەرەكەى دەكات، ئيدى ئارەزوو مەندانە ئاراوگەى هەڵبژاردوو چوو بۆ تريست. لـە وێنـدەر ئاشـنايەتى لەگـەڵ بازرگانێكـدا بـەنێوى ئيتـور شـهيتز پەيـدا كـرد. شـيهتز بـە

**هاندانی جویس هەندێ رۆمانی دەرخشانی نووسی کە بە ناوی خوازراوی ئیتالۆ شیڤیڤۆ وە بڵاو بوونەوە.**

**جیمز جویس لە ساڵی ١٩٠٤دا دەستی دایە نووسینی رۆمانێك بە ناوی ستیڤن دیدلوس، پاشان ئەم رۆمانەی کورت کردەوە و دەستکارییەکی زۆری کرد و بە ناوی (وێنەی هونەرمەند لە لاویدا) لە ساڵی ١٩١٦دا لە نیویورك بڵاوی کردەوە. تازەگەری جویس لە وارێن شێواز و تەکنیك دا کە لە کۆمەڵە چیرۆکی "دبلینی یەکاندا" کە بایەخێکی ئەو تۆی پێ نەدرا و بە هەند نەگیرا، جارێکی دی لەم رۆمانەدا و زیاتر رەنگی دایەوە و پەرەی سەند، ئیدی جۆیس بەرە بەرە وەکو نووسەرێکی رەسەن و بوێر ناسرا، زوو ڕەسمی سێکسی، ترس لە ژنەوتنی وەعزێك لەمەڕ دۆزەخ، تۆبە، خەیاڵی لەبەرکردنی جلی کەشیشی، و سەرەنجام لە دەست دانی ئیمان و باوەڕ بە جوانی و دێگری لەم رۆمانەدا رەنگی داوەتەوە، وێنەی هونەرمەند لە لاویدا کە نووسینی دەساڵێکی جایاندووە، لە ڕاستیدا هەندێ لە سەرکێشییە زەینییەکانی جۆیس لە زانکۆی دبلیس دا دەنوێنێتەوە سەرانسەری رۆمانی هونەرمەند لە تەمەنی لاویدا بە شێوەی ریالیزم نووسراوە، ئەم ریالیزمە لە رۆمانی بولیس شدا بەردەوام ددەبێ و لە ناوەڕاستیدا دەگاتە لوتکەوی خۆی و ئیدی دەوەستێ، جویس ئولیسی، کە کێکە لە دوو بەرهەمە بەرجەستەکەی ئەو، لە ساڵی ١٩١٦دا و پاش لە چاپدانی هونەرمەند لە تەمەنی لاویدا، دەست پێکرد، ئولیس لە مارتی ١٩١٨ بەدواوە بەزنجیرە لە گۆڤارێکی ئەدەبیدا بڵاو بووە و سەرنجام لە ساڵی ١٩٢٢ لە پاریس بڵاو بووەوە، بەڵام چاپکردنەوەی لە زۆر وڵاتاندا، لەوانە لە ئەمریکا قەدەغەکرا. هەر ئەم رۆمانە پاشان لە ساڵی ١٩٢٢ دا لە ئەمریکا و لە ساڵی ١٩٢٦دا لە بەریتانیا مۆڵەتی چاپی درایێ، جیمز جویس ناوی ئەم کتێبەی لە ئۆدیسەی هومەری شاعیری یونانییەوە نووسراوە بریتییە لەسەر بووری ژیانی ئودیسە و بەتایبەتی ئودیسیوس قارەمانی بوو، ناوەلاتینی یەکەی ئولیس شەرم و شرۆڤەی ئەزموونێن دوو پیاوە، لیوپولد بلوم، کە بانگەشەچییەکی جوولەکەیە، و ستیڤین دیدالوس، کە پیاوێکی خەمین و سەرەکی رۆمانەکەیە، هەر چەند ئولیس باسی زۆر هەڵدەگرێ بەڵام ئەم بەرهەمە بەدەستکەوتێکی مەزنی ئەدەبی سەدەی بیستەم لە قەڵەم دراوە، جویس بە بڵا و بوونەوەی رۆمانی ئولیس عۆرەتێکی جیهانی وەرگرت، لەگەڵ ئەمەشدا بە پێچەوانەی دوو هاوولاتی یەکەی دیکەی، شاو ویێس، خەلاتی ئەدەبیاتی نۆ بڵی بەدەست نە هێنا.**

لـه سـالّی ١٩١٧دا چاوپەشـەکەی جـویس زیـادی کـرد. دوای ماوەیـەك لوسـیای کیژیشـی دوو چـاری نەخۆشـی دەروونـی بـوو، زۆر پێشـتر هەسـتی بـە نارەحـەتی و نیگەرانی کیژەکەی کردبوو لەم رووەوە خۆی سەرزەنشت دەکرد، حاڵی لوسیا وەکو چـاوانی خـۆی رۆژ بـە رۆژ خراتـر دەبـوو جـۆیس لـەم سـەرو بەنـدەدا دەسـتی بـە نووسینی رۆمـانی "بێداری ماڵیـانی فینیگـان" کـرد، ئـەم بەرهەمـە رەنگدانەوەیـەکی نیگەرانییـەکانی ئـەو بـوو، رەنگدانـەوەی دژوارییـە داراییـەکانی، کـزی چـاوەکانی، و نەخۆشـی دەروونـی کیژەکـەی بـوو کـە لـە هـەمان کاتـدا نەخۆشـی کۆمەڵگـەش بـوو، رۆمـانی "بێـداری ماڵیـانی فینیگـان" هەوڵێکـە بـۆ نیشـاندانی مێـژوو، ئـەزموون و پەیوەندییـە کەسـایەتی و کۆمەڵایەتییـەکانی هـەموو تـیرەی بەشـەر کـە لەوێـدا سنوردارییەکانی زمـان و هامـاج و زەمـان و تاکایـەتی بـە کۆمـەکی خـەونان، وەلاوە دەنرێ رەگی هەر رستەیەکی ئەم رۆمانە دەچێتەوە سەر بەرهـەمێکی ئـەدەبی نـاودار، خوێندنـەوەی "بێـداری ماڵبـاتی، لـەزەتێکی وەهـای لێدەبینێ کـە هـیچ کتێبێك ئـەو لەوەتەی ناداتێ، لـە سـاڵی ١٩٢٩وە، واتـە لـەو زەمانـەوە کـە ئـەم رۆمانـە چاپ و بڵاو بووەتـەوە تـاکو ئێسـتا رەخنـەگران مژول و سـەرگەرمی لێکۆڵینـەوەی بـوون، و تـەنیا چـەند بـەش و لایـەنێکی روون بووەتـەوە و ئەمـەش شـکۆخوازی و زاڵبـوونی سـەر سورهێنەری جویس لە بواری زماندا نیشاندەدات، رەخنەگران دەڵێن بڵاو بوونـەوەی ئەم رۆمانە نیشانەی ئەوەیە کە بەهرە و توانـای بێ هاوتـای جـویس کەوتۆتـە کوێرە رێگایـان ئـەوەتا پـەرەی بـە مـەرزێن ئـەدەبیات و هـەروەها مـەرزەکانی ئاگـایی و هۆشیاری بنیادەم داوە.

جویس داستان نووسی (اسگورە) مەزنی سەردەمی خۆیەتی و تەنیا تۆماس مان لەم روەوە شان لە شانی دەدات، ئوستورە "داستان" لە رووپەکەوە داستانێکە کە هێشتا بایـەخی خـۆی پاراسـتووە، جـویس و نـا مێـژوویی، داسـتانێکە کـە هێشـتا بایـەخی خۆی پاراستووە، جویس لە رۆمانی "وێنەی هونەرمەنـد لەتەمـەنی لاویـدا" داسـتانی دیدا لۆسی تەلارکاری بینای هەزارتۆیی کریت بەکار دێنێ کە بە داهێنانی باڵ هەڵات و لـە هـەوەڵی فڕینەکەیـدا، ئیکاروسـی کـوڕی بـەرەوە بـوو و گیـانی خـۆی لەدەسـتدا، جویس بۆ نیشاندانی پێگـەی هونەرمەنـدی نوێگەراسـوود لـەم داسـتانە دەبینێ، ئـەو هونەرمەندەن کە دەبێ لـە هـەزار تـوێی خێزان، سیاسـەت و مـەزەب هـەڵێ، بـەم جـۆرە هونەرمەنـد لـە روانگـەی جیهـانی ئاسـایی و رۆژانـەوە دەکـەوێت، بـەڵام لەڕوانگـەی هونەرمەنـدەوە ئـەم کەوتنـە ئـاوە ژووە، کەوتنێکـە لـە تاریکییـەوە بـەرە و رونـاکی.

هەڵبەتە هونەرمەندی لاو، بە پێچەوانەی دیدالوسەوە، لەوەیە سەرکەوتن بەدەست نەیەنێ و روو بە رووی شکست و مەرگ ببێتەوە، شکست و مەرگێك کە بەشێوەیەکی کاریگەر لە رۆمانی ئولیسدا نیشان دەدرێ. جویس بۆ بینای رۆمانە گەورەکەی خۆی، ئولیس عەودالّی ستوونێکە تا پەیکەری مرۆڤی خۆی لەسەر بینا بکات و سەرەنجام ئەوەی لە وێنەی ئودیسیوسی هومەردا بینییەوە: ئەو ئودیسیوسەی کە لە شاری تەروادا ئیدی جەنگاوەر نییە بەڵکو مرۆڤێکی مەرکێش، مێرد، عاشق، دەست پێکەر، هەندێ جار پەلە کار و خودانی دەیان سیفەتی دی کە بە ئاسانی لە مرۆڤی هاو چەرخ دا دەبینرێن. هەر فەسڵێکی ئولیس لەسەر روداوێکی ناو داستانەکەی هومەر رۆنراوە، جولیس دەیەوێ بڵێ کە جیهان و تەبیعەتی ئادەمی نەگۆڕن جولیس لەم رۆمانەدا ریالیزم و سەمبولیزەم بە کۆمەکی رەوتی خود ئاگایی و مەتەلۆگ ئاوێتەی یەکدی دەکات. ئولیس سەلماندی فیتنە ئەنگلیزی ژیانە بە شێوەیەکی خەماوی و پێکەنیناوی کە بەرو بەرەنجامی جۆرەها هونەری ئەدەبی وەك لاسایکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی کۆن، و هەروەها خەیاڵ، برگەی ژیان، نوکتە و ئەو شتانەیە، جولیس لەم رۆمانەدا یەك داستان بە شێوەیەکی جۆرا و جۆر دەڵێتەوە و نائومێدە لە دۆزینەوەی شێوەی دڵخوازی خۆی، سەرەنجام شێوەیەکی دڵخواز دەدۆزێتەوە. جیمز جۆلیس ئاشنایەتی لەگەڵ کەسایەتێن بەر جەستەی ئەدەبی وەك عەزرا پاوەند، فورد، ئیلیوت و زۆری دیکەدا هەوو. هەر وەها دۆستی دڵسۆزی خەڵکی ئاسایشە بوو: بەلام تەنیا ئەك کەس ئەوی بەتەواوەتی دەناسی و ئەو کەسەش ژنەکەی بوو کە میانەی لەگەڵ ئەدەبیاتدا نەبوو و بە پەرۆشەوە دەیویست بزانێ کە جولیس بۆ (کتێبی ئاسایی) نانووسێت. جولیس، بە پێچەوانەی شەکسپیرەوە، خوڵقێنەری ژیان و دیمەنێن دیکە نەبوو، ئەو ژیانی خۆی و ژینگەی کۆمەلایەتی ئیرلەندەی زێدی خۆی بەکار دێناو بە نا چاری هەنگاوی ناو یەك بەیەکی رۆژانی ژیانی ئاوارەیی و دوورە وولاتی خۆیدا، بە زەبری خەیاڵی خۆی، دەنا. هەر چەندە بە یەقین رۆژێ دێ کە داهێنانەکەی جیمز جولیس لە واری چیرۆکنووسیدا، لەبەر چاوی خەڵك داکەون، بەلام نوکتە و شۆخی و مرۆڤ دۆستی سادەی بەرهەمەکانی هەمیشە جوانی و دڵگیری خۆیان دەپارێزن.

## ٦٧- وایت برینیت

-١٨٩٩

وایت برینیت مامۆستای بەشی چیرۆکنووسینی زانستگەی کولومبیای ئەمریکا بوو. لە ساڵی ١٨٩٩دا لە شاری سالت لیک-ی ویلایەتی ئوتا هاتۆتە دنیاوە. تا ساڵی ١٩٣١ پەیامنێری رۆژنامەکانی تایمز، نیویورک هرالدو نیویورک سان بوو. لەم ساڵەدا گۆڤاری پڕ ئیحتوباری چیرۆکی دامەزراند.

جگە لە زانستگەی کۆڵومبیا لە زانکۆو بنکەی چیرۆکنووسی تری ئەمریکاشدا دەرسی گوتووەتەوە. میری ئوهارا. کارلسون مەك کالیرز، هالی بیرنیت و جی. دی. سالنجیر لە جوملەی قوتابییەکانی ئەو بوون.

وایت برینیت پتر لە سی نامیلکەی چیرۆکی بڵاو کردۆتەوە.

## ٦٨- فلانێری ئۆکونور

### ١٩٢٥-١٩٦٤

فلانێری ئۆکونور  لە ساڵی ١٩٢٥دا لە ویلایەتی جۆرجیای ئەمریکادا هاتۆتە دنیاوە. ئۆکونور بە سەیرترین نووسەرە ژنی جیهان هاتۆتە ژماردن. کەسێکی کاتولیك مەزەب بوو و باوەڕی بتەوی بە خودای مەسیحیەت هەبوو، کەچی زۆربەی قارەمانانی چیرۆکەکانی لە واری ئیمانداریدا پێچەوانەی ئەون. کاراکتەرە سکرابەکانی کە لە رووی ئەقڵییەوە ساغڵەم و تەواو نین، هەڵس و کەوت و کارو کردەوەیان توندە. یەکێك لە رەخنەگرەکان گوتویەتی، فلانێری ئۆکونور "نووسەرێکی مەزەبی" نییە، بەڵکو "دەربارەی مەزەب" دەنووسێت.

خەمی ژیان و زنەگی ئادەمی لە بەرهەمەکانیدا بە شێوەی خواستنی مۆتەکە ئاسا رەنگی داوەتەوەو نەیاتە ژبیر کردن. بە بۆچوونی ئەو مرۆڤی هاوچەرخ لە حاڵەتی نەفی و تاراندایە و"لە رەگ و ریشەی خۆی دوور کەوتووەتەوە.) لە ماوەی تەمەنی کورتی خۆیدا دوو کۆمەڵە چیرۆك و دوو رۆمانی نووسیوە. هیزل موتس کە قارەمانی سەرەکی رۆمانەکەیەتی، نموونەو شایەتی یەکێکە لەو مرۆڤانەی کە باوەڕی لە دەست داوە "ئەو باوەڕەی کە بە منداڵی کوێرانە پێی تەڵقین دراوە" دێتە سەر ئەوەی کە بە خۆی کڵێسایەکی راستەقینەی بێ عیسای لە خاچ دراو بونیات بنێ.

چیرۆکەکانی ئۆکونور لەسەر بناغەی رەمزی و مەزەبی رۆنراون و پڕن لە تەعەسوب. بەڵام بەو مەبەستە داڕێژراون کە لە دوا شیکردنەوەدا ئەوە نیشان بدەن کە تەعەسوب بە توندڕەوی و شێتی دەشکێتەوە.

بەرهەمەکانی فلانێری ئۆکونور لە رادەبەدەر ئاڵۆزن و بە ئاسانی نایەنە دەرك کردن، بۆیە ناکرێ عینوانی مەزن بە نووسەرەکانیان بدرێ. بەڵام چیرۆکەکانی لە چیرۆکی هەموو نووسەرە هاوعەسرەکانی خۆی پتر "مەسەلەی باوەڕ"ی لەخۆ گرتووەو مامەڵەی لە تەکدا کردووە.

فلانێری ئۆکونور کە نەخۆشی سیلی دڵ و گورچیلەی لە باوکییەوە بۆ مابووەوە، لە تەمەنی سی و نۆ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

## ٦٩- فیودور میخائیلوفچ دۆستوفسکی

۱۸۸۱-۱۸۱۸

دۆستوفسکی دووەم منداڵی خێزانەکەی خۆیەتی و لە مۆسکۆ هاتۆتە دنیا. هەوەڵین ساڵەکانی تەمەنی لە ژینگەیەکی تەنگك و چەپەکدا بەسەر بردووە. دۆستوفسکی لەگەڵ میخائیل-ی برا گەورەیدا، بە جیا لە منالانی گەڕەك، لە ماڵ یان لە قوتابخانەدا نێردراوەتە بەر خوێندن. باوکی پیاوێکی توندە تەبیعەت و زاڵم و مەشروبخۆر بووە، کەچی بە گوێرەی پێوەرەکانی ئەو دەوروزەمانە خوێنەوارییەکی باشی هەبووەو زانکۆی تەواو کردووە. دایکی ژنێکی بەتەربێت و خۆشپەروەردە و لە ماڵباتێکی رەسەن و خانەدان بووە، خانەوادەی دۆستۆفسکی جگە لە خوێندنی ئنجیل، ئەدەبیاتی رووس و گرنگترین بڵاڤۆکانی رۆژیان دەخوێندەوە. دیارترین بیرەوەری دۆستوفسکی تەماشا کردنی نمایشی "تالانچییان"ی شیلرە لە تەمەنی دە ساڵیدا. چۆنیەتی نواندنی ئەم بەرهەمەو بانگەوازی ئازادیی رۆمانتیك ئامێزی بەرهەمەکە مانایەکی قوڵ و کاریگەرییەکی زۆری بەسەر کارەکانی دۆستوفسکییەوە بەجێهێشت. بابی دۆستوفسکی لە ساڵی ۱۸۳۱دا دوو گوندی ستانی تولا-ی بەچنگ هێناو ماڵباتی دۆستوفسکی پشووی ساڵانەیان لەوێندەر بەسەر دەبرد، ژیانی پڕ هەژاری ئەو دەڤەرەش کارێکی زۆر لە دۆستوفسکی کردو پاشان لە بەرهەمەکانیدا رەنگی داوەتەوە. هەڵبەتە هاتووچۆ کردنی دۆستوفسکی بۆ ئەو گوندانە یەکەمین ئاشنابوونی واقیعی دۆستوفسکی بوو لەگەڵ خەڵکی روسیادا کە پاشان زۆر بە روونی و ئاشکرا کەوتە نووسین دەربارەیان. لە بەرهەمەکانی شیلەر و ستانی نەگبەتباری تولا-وە بابەت و رووداوێن ئەوتۆ دزەیان کرد کە هزرو بیری دۆستوفسکییان تا مردن بەخۆوە مژول کردو کاریگەریان لە دوا رۆمانیدا (برایانی کارامازۆف) بە زەقی دیارە.

لە ساڵی ۱۸۳۷دا، واتە دووساڵ پاش مەرگی بابی ، کە پێدەچێت بە دەستی وەرزێرەکانی کوژرابێ، دایکی مرد. دۆستوفسکی لە دەزگای ئەندازەی سوپایی سان پترزبورگ دا کەوتە خوێندن و هەر چەندە لەوێندەر خەریکی خوێندنی لقی هونەری بوو، بەڵام پتر وەختی خۆی بە خوێندنەوەی بەرهەمێن کلاسیکی روسی و هەروەها بەرهەمێن هەندێ لە نووسەرانی جۆراوجۆری ئەوروپایی وەك: (والتیر سكۆت، هوفمان و دیکوئینسی و بالزال) بەسەر دەبرد. پاش تەواو کردنی دەورەی

ئەنـدازیاری لـە خزمـەتی سـەربازی بـووەوەو یەکسـەر رووی کـردە ئـەدەبیات. دۆستوفسکی لە ساڵی ١٨٤٦دا دەمودەست لە پاش بڵاو کردنەوەی یەکەم کتێبی گەورەی خۆی "بێنەوایان"، ئوژنی گراندەی بالزاکی تەرجەمە کردو بڵاوی کردەوە. بینەوایان لە لایەن رەخنەگری هەرەدیاری ئەو رۆژگارە (بلینسکی)وە پەسند کراو ئەمەش کەمدابێژێك پایەیەکی لە ئەدەبیاتی روسیدا بۆ فەراهەم کرد. دۆستوفسکی هەر لەو سەروبەندەدا دوو بەرهەمی دیکەی بەناوی (ئاغا، ١٨٤٧) و (شەوانی سپی ١٨٤٨) بڵاو کردەوە کە سەرکەوتنی لێیاندا بەدەست نەهێنا. لە کۆتایی دەیەی ١٨٤٠دا ئاشنایەتی لەگەڵ گروپی پیتراشفسکی دا پەیدا کردو لە باس و کۆڕو گفتوگۆکانیاندا دەربارەی سۆشیالیزمی ئامانجدارو شۆڕش بەشداری کرد.

هەڵبەتە کەم و زۆر کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو باوەڕ باوانەوە، ئەگەرچی لە بەرهەمەکانیدا ئەوە بەدی ناکرێ کە راستگۆیانە خووی دابووبێتە تیۆریانی شۆڕشگێڕیی. دۆستوفسکی لەگەڵ کۆمەڵێك ئەندامی دیکەی گروپی پتراشفسکی دا دەستگیر کراو کەوتە زیندانەوەو لە دادگای سوپاییدا بە ئیعدام حوکم درا. تۆمەت و تاوانی سەرەکی ئەو ئەمە بوو کە نامە بەناوبانگەکەی بلینسکی بۆ گۆگۆل، بەدەنگی بەرز لە کۆبوونەوەیەکی گروپی ناوبراودا خوێندووەتەوە، لە (نامەکەدا بۆ گۆگۆل) بلینسکی هێرشی کردۆتە سەر شەیدایی مەزەبی گۆگۆل و لە نامەکەدا رایگەیاندووە کە خەڵکی روسیا روو لە ئیستاتیکان.

بە هەرحاڵ حوکمی ئیعدامەکەی دۆستوفسکی کە بە دەستووری تزاری روسیا نیکۆلای یەکەم دەرکرابوو، گۆڕدرا بوو حوکمی ئەبەدی و دوور خستنەوە، ئەوەبوو دۆستوفسکی لە سەرەتای ساڵی ١٨٥٠دا بە دەست و پێی لە کۆت و زنجیردا بەرەو تاراوگەی سیبریا رەوانە کرا. ئەو تەجرەبەیەی کە دۆستوفسکی لە ئۆردوگای سزادانی ئومسك بەسەری برد یەجگار دژوار بوو. ئەگەر گومانێك لەوەدا هەبێ کە ئاخۆ نەخۆشی فێداری دۆستوفسکی زادەی مانەوەی بێ لەم ئۆردوگایەدا یان نا، ئەوا گومان لەوەدا نییە کە دۆستوفسکی تا کۆتایی تەمەنی ئازارێکی زۆری بەم نەخۆشییەوە "فێداری" چەشت "یاداشتەکانی خانەی مردووان – ١٨٦١-١٨٦٢) کە راپۆرێکە لەمەڕ ئەو چوار ساڵەی لە تاراوگەی بەسەر بردووە بە بەرهەمێکی کلاسیك لە بواری ئەدەبیاتی زینداندا دێتە ژماردن. کاتێ کە لە ساڵی ١٨٥٤دا ئازاد بوو هێشتا هەقی ئەوەی نەبوو لە سیبریا دەربچێت، بەڵام ژیانێکی تا رادەیەك ئازادی هەبوو، بەتایبەتی کە بە عینوانی ئەفسەر مژولی خزمەت بوو. پاشان بێوەژنی یەکێك

له هاوکارەکانی خۆی خواست و سەرەنجام لە ساڵی ١٨٥٩دا مۆڵەتی درایێ کە بۆ بەشی ئەوروپایی روسیا بگەڕێتەوە.
زەوجینەکەی دۆستوفسکی بە شێوەیەکی گشتی سەرکەوتوو نەبوو. ئەمە جگە لەوەی ئەو لە کۆمەڵگەیەکدا رووبەڕووی تازە کردنەوەی شۆڕەت و ئیحتوبار بوو کە باس هەر باسی ریفۆرم و گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە بوو. ئەزموونەکانی بووە هۆی زیاتر مکوم بوونی هەستێن مەزەبی لە دڵ و دەروونیدا کە لە دەیەی ١٨٤٠دا لە بوونی دا پەنهان بوو و کاتێ کە بە یارمەتی برایەکەی رۆژنامەی زەمانی لە ساڵی ١٨٦١دا دامەزراند لە واری باوەڕێن سیاسیدا کەسێکی محافەزەکار، نیشتمان پەروەرێکی توندڕەوو کەم و زۆر جەماوەر پەروەر بوو، بەو مانایەی کە پشتیوانی چینی جوتیاری روسی بوو و داوای لە رۆشنبیران دەکرد لە جوتیارانەوە فێربن. دۆستوفسکی لە رۆژنامەی زەماندا بوو کە یەکەمین رۆمانی خۆی بەناوی (بێزراوان- ١٨٦١) بڵاو کردەوە. هەروەها یاداشتنامەیەکی دەربارەی یەکەمین سەفەری خۆی بۆ ئەوروپا بەناوی "یاداشتێن زستانی دەربارەی... ١٨٦٣" لە هەمان رۆژنامەدا بڵاو کردەوە.
بە هەرحاڵ ئەو سەفەرەی بۆ ئەوروپا بیروباوەڕی تەواو گۆڕی و رۆژنامەکەی بەهۆی بڵاو کردنەوەی وتارێك لەمەڕ شۆڕشی ساڵی ١٨٦٣ پۆڵەندا، لەلایەن حکومەتەوە داخرا. هەرچەندە مۆڵەتی دەرکردنی رۆژنامەیەکی دیکەی بەناوی "دەوران" وەرگرت، بەڵام مردنی هاوسەرەکەی، مردنی براکەی و مردنی ئاپولون گریگوریف ی دڵسۆزترین هاوکاری لە دەرکردنی رۆژنامەکە، جەزرەبەی کاری بوون بۆ ئەو. دۆستوفسکی هەرچەندە بەرجەستەترین بەرهەمی خۆی تا ئەو سەروبەندە بەناوی "یاداشتێن ژێر زەمین ١٨٦٤" لە رۆژنامەی دەوراندا بڵاو کردەوە، زۆری پێنەچوو کە ئەم رۆژنامەیە کەوتە دواکەوتن و پاشان بە تەواوەتی وەستاو قەرزێکی زۆری هێنایە سەر دۆستوفسکی . ئیدی ئەوە بوو لە ئەنجامی رووبەڕوو بوونەوەی دەستکەوتی و تەنگانەیەکی دژواردا، لە پاییزی ١٨٦٥دا لە ویسبادن کەوتە نووسینی رۆمانێك بە ناوی "تاوان و سزا- ١٨٦٦" کە پاش ساڵێك تەواوی کرد. دۆستوفسکی لە ساڵی ١٨٦٥دا بەڵێننامەی تەواو کردنی رۆمانی "تاوان و سزا"ی مۆر کردبوو و بەڵێنی دابوو کە لە ماوەی ساڵێکدا تەواوی بکات، بۆیە بە شێوەیەکی کاتی دەستی لە کارە سەرەکیەکەی خۆی (قومارباز ١٨٦٧) هەڵگرت. دۆستوفسکی رۆمانی قوماربازی بۆ ژنێکی گەنجی خێرانووس بەناوی "ئاننا سنیتکلینا" دەخوێندەوەو ئەو دەینووسی.

دۆستوفسکی پاش ساڵێك ئەو ژنەی خواست، هەرچەندە چارەکە سەدەیەك لە دۆستوفسکی بچووکتر بوو، بەڵام زەوجینەکەیان سەرکەوتوو بوو.
ئەم ژن و مێردە لە تاو قەرزاری و لە دەست خاوەن قەرزان ناچار بوون سەری خۆ بۆ ئەوروپا هەڵگرن و چوار ساڵیان لە دریسدین گوزەراند. دۆستوفسکی لەم ماوەیەدا دوو رۆمانی گەورەی بەناوی (ئەبلە ١٨٦٨) و (دەست لێوەشاوان ١٨٧١-١٨٧٢) نووسی. کە گەڕانەوە بۆ روسیا، ئیدی هاوسەرەکەی دۆستوفسکی ئەرکی بڵاوکەرەوەی بەرهەمەکانی شووەکەی لە ئەستۆ گرت و ژیانێکی خێزانداری ئارام و هێمنی دامەزراند. ئیدی ئەم ژنە بە زەبری ماڵداری خۆی توانی بەرە بەرە هەموو قەرزەکانی دۆستوفسکی بداتەوە. هەرچەندە دوا ساڵەکانی تەمەنی بەهۆی مەرگی زووڕەسی هەندێ لە منداڵەکانی و زیاد بوونی نەخۆشی ڤێ یەجگار نارەحەت و دژوار بوو، بەڵام لە سایەی یادەوەری نووسی (یاداشتەکانی نووسەرێك کە ساڵی ١٨٧٣دا دەستی پێکردو ناوبەناو نەبێ ئیدی تا دوارۆژی تەمەنی بەردەوام بوو) هەروەها لە سایەی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی خۆیەوە بۆ جەماوەری خەڵك، رۆژنامەنووسی (سەرپەرشتی رۆژنامەی هاوشاری ١٨٧٣-١٨٧٤) و کاری وەکو رۆماننووسێك (لاوی هەرزە – ١٨٧٥) و سەرەنجام لە سەرووی هەموو ئەمانەوە، بڵاو کردنەوەی گەورەترین رۆمانی خۆی (برایانی کارامازۆف) لە ساڵانی ١٨٧٩ – ١٨٨٠ شۆرەتێکی کەم وێنەی بەدەست هێنا. شۆرەتی دۆستوفسکی بە درێژایی ئەو سیمینار و کۆڕ و ئاهەنگانەی کە بە بۆنەی پەردە لادان لە سەر پەیکەری پوشکین لە مۆسکۆ، لە ساڵی ١٨٨٠دا بەرپا بوو، وتارێکی دەربارەی پوشکین خوێندەوە کە مایەی ستایشی هەمووان بوو، گەییە لوتکە. ئەوجا بەرێکردنی جەنازەکەی لە شوباتی ١٨٨١دا کە دڵی زۆر کەسی لە رادەبەدەر خەمین کرد.
بێنەوایان: یەکەمین بەرهەمی دۆستوفسکی یەو لەوەیە یەکەمجار وا بێتە بەرچاو کە بە شێوەی کۆنی نامە گۆڕینەوە لە نێوان دوو کەسدا (لە نێوان فەرمانبەرێکی دەست کورتی میانە ساڵ بەناوی دوشکین و کیژێکی زۆر گەنجتر) نووسرابێ. بەڵام ئەم شێوەیە قوڵی و مەنگییەکی سایکۆلۆژی لەخۆ گرتووە. نامەکانی قارەمانانی دۆستوفسکی لە شێوەی ئیعترافاتی ئاڵۆزدا دەردەکەون نەك هەر عەشقی لە رادەبەدەری ئەو بە کیژەکە ئاشکرا دەکات بەڵکو ناسنامەی کەسایەتی ئەو، شوێنی ئەو لە کۆمەڵگەو مانای هەژاری ئەو بە ئەو نیشان دەدات.

دۆستوفسکی کە لە زیندان رزگار دەبێ لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ پەیامنێرێك دا ئیعترافی بە دوو دڵییەکان و باوەڕی خۆی کردووە:
"من دەتوانم تەنیا ئەوەندەت دەربارەی خۆم پێ بڵێم کە من رۆڵەی زەمانم، رۆڵەی بێ باوەڕی و دوو دڵی و تا ئەم ساتەو تا کۆتایی تەمەنم هەر لەسەر ئەم باوەڕە دەبم... ئیدی بەتۆ بڵێم، ئەگەر کەسێك بۆم بسەلمێنێ کە مەسیح لە دەرێی بازنەی حەقیقەتدایەو بەراستی یەقین پەیدا بکەم کە حەقیقەت بە فەرسەخان لە مەسیحەوە دوورە، ئەوجاش پێم باشترە لەگەڵ مەسیحدا بم تا لەگەڵ حەقیقەت." ئەم قسەیەیان بە یەکێك لە بەرجەستەترین وەسێتنامەکانی سەدەی نۆزدەیەم ژماردووە، ئەو سەدەیەی کە رۆشنبیرەکانی بەرە بەرە دەگەینە ئەم ئەنجامەی کە دەبێ خۆ لەو کۆت و زنجیرانە رزگار بکەن کە باوکانی بێ ئاگایان لە دەست و پێی زەینی ئەوانیان کردووە". ئەم وەسێتنامەیە، دە ساڵ پاشتر بۆنەی تایبەتی ئەدەبی خۆی دۆزییەوەو دۆستوفسکی لە "یاداشتێن ژێر زەوی" دوو دڵی خۆی دەربارەی زانستگەری، ماتریالیزم و ریفۆرمگەری دەیەی ١٨٦٠ راگەیاند و بە پێچەوانەی باوەڕی باوەوە کە مرۆڤی لە بنەڕەتدا بە بوونەوەرێکی عەقڵانی دەزانی، تێگەیشتنی خۆی دەرباری مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی هەوەسباز، بە گومان و خۆسەر نیشان دا. راسکولینکوف لە رۆمانی تاوان و سزادا نموونەیەکی سەرکەوتووی ئەو تێگەیشتنەیە. ئەو لەم رۆمانەدا خوێنکارێکە تاوان دەکات تا بیسەلمێنێ کە ناپلیۆنێکی خۆسەرە بەڵام لە ئەنجامدا پەی بە خەتاو بێهودەیی بیانووەکانی خۆی دەبات. راسکولینکوف خۆی لە سەر دوو ریانێکی دژواردا بە سەرگەردانی دەبینێ کە لە راستیدا کەسایەتی دوو پارچەی خۆشیەتی ئەمەی کە گوایە ئەو بە هۆی سونیای سۆزانییەوە دەگاتە ئەخلاق جێی دوو دڵی و گومانە. بەڵام هێزی دارماتیك ئاسای ئەم رۆمانە– تراژیدیا مەزنە، قوڵی ئەو باوەڕانەی تیایدا خراونەتە روو، پێکهاتەی مۆتەکە ئاسای واقیعی ژیانی مەینەتباری شارو بێ ئاگایی قارەمانەکانی– بناغەیەکی هێناوەتە ئاراوە کە شۆرەتی دۆستوفسکی وەکو باڵاترین رۆماننووسی سەدەی نۆزدەیەمی روسیای لەسەر وەستاوە.
دۆستوفسکی لە دووەم رۆمانی خۆیدا (ئەبلە) هەوڵ دەدا تا تێگەیشتنی خۆی لەمەڕ مەسیحی هاوچەرخدا لە قاڵبی ئەبلەیەکی منداڵ ئاسادا، یانی شازادە میشکین کەکتێبی ئینجیلەکەی ئەو پێکهاتەیەکە لە رزگاری بە کۆمەکی هێزی جوانپەروەری و مەسیح گەری ئەدەبییە، بەرجەستە بکات. هەرچەندە دوا بەشەکانی ئەم کتێبە

پرشنگدارو درەخشانە بەڵام ئەم بەرهەمە بە شێوەیەکی گشتی کەڵەکەیەکە لە بابەتی لاوەکی و قارەمانانی چەنەبازو لایەنگری گەنگەشەو مشت و مڕو دەحکە. ئەگەر لە ئەبلەدا لە سایەی مژدەی مەسیحی رۆسیادا ئومێدێك بۆ روسیا هەبێ، ئەوا لە رۆمانی دەست لێوەشاوان دا، کە سێیەم گەورە رۆمانی دۆستوفسکییە ئایندەی روسیا پڕە لە ئاژاوەیەك کە خەڵکی رۆشنبیری ژەهراوی بە باوەڕێن رۆژاوایی و پوچکەرایی، نە باوەڕیان بەخۆ هەیەو نە بە خەڵکی خۆپەرستی روسا، ستافروگینی، بەناو فریارەسی رۆشنبیران، بە رواڵەت لە نێوان روانینی پەچگەرایی بۆ ئازادی و "کە لە قاڵبی کریلوف دا نیشاندەدرێ" لە نێوان ئیمکانی باوەڕی مەزەبی دا "کە لە قاڵبی شاتف-ی ئیمانخوازدا بەرجەستە دەبێ" سەرگەردانە. بەڵام سەرەنجام تەسلیمی باوەڕێن ڤیرخوڤینیسکیی تیرۆریست دەبێ تا ئەمانجە وێرانکەرەکانی خۆی بێنێتە دی. ئەم رۆمانە لەبەر ئەوەی کە زوڵم و زۆری سیاسی، کە لە ئەنجامی شۆڕشدا بەرۆکی روسیا دەگرێ، دیاری دەکات بۆیە شرۆڤەو راڤەو شیکردنەوەی بۆ رەخنەگرانی هاوچەرخی روسی کارێکی یەجگار دژوارە. دۆستوفسکی لە رۆمانی (لاوی هەرزە)دا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا. بەڵام لە ساڵی ۱۸۷۸دا کە لە دادگایی کردنی (ڤیرا زاوسیچ) و تیرۆریست دا ئامادە بوو، توانی چوارچێوەی دوایین و گەورەترین رۆمانی خۆی (برایانی کارامازۆف) دیاری بکات.

ماڵباتی کارامازۆف، وەکو وێنەیەکی روسیای بچوك دارێژراوە کە روسیای هاوچەرخ و زەمینی لە قاڵبی دمیتری داو، دەسەڵاتی رۆژاوا لە قاڵبی ئیڤاندا و روسیای مەزەبی لە قاڵبی ئەلیوشادا بەرجەستە دەبن. جا لەم میانەدا رەخنەگرتنی ئیڤان لە کڵێساو نکۆڵی کردن لە خوا "بەتایبەتی لە فەسڵی موفەتیشی گەورەدا" وەکو هێرشێکی بێ وەڵام بۆ سەر بێدادی جیهان دەژمێردرێ. برایانی کارامازۆف وەکو لوتکەی دەستکەوتی دۆستوفسکی رەنگدانەوەی نیگەرانی دۆستوفسکییە دەربارەی دژوارییەکانی هەڵبژاردن کە هەمیشە لەبەردەم بەشەردایە.

قارەمانانی چیرۆکەکانی دۆستوفسکی لە هەوڵ و هۆڵی گۆڕاندا نین، لە هەوڵی ریفۆرمدا نین، لە هەوڵی ئەوەدان کە خۆیان لە بەرانبەر ناشیرینی و نەگیرسییەکاندا، کە ژمارەیان زۆرە، هەمیشە بەهێزتر و تەیارتر بکەن.

## ٧٠- ماريو بارگاس يوسا

**١٩٣٦**

***- له ١٩٣٦/٢/٢٨دا له ئارەكیپای پیرۆ، له خانەوادەیەكی قەدیمی له دایك بووە، پاش دایكبوونی ئەو بە ماوەیەكی كەم دایك و باوكی لێكدی جودا بوونەوە و ئەو لەلای نەنك و باپیری "دایك و باوكی دایكی" له كوچابامبا له پۆلیڤی گەورەبوو.**

***- لەسالآنی ١٩٤١-١٩٤٩ له كوچابامباو پیورای پیرودا قۆناغی سەرەتایی خوێندن دەبڕێ.**

***- لەسالّی ١٩٥٠دا دایك و باوكی ئاشت دەبنەوە و ئەو دەچێتە خوێندنگەی سوپایی لیونچوپرادۆ له لیما.**

***- لەسالّی ١٩٥٢دا شانۆنامەی (فڕینی ئینكا) دەنووسێت و لەسەر شانۆ دەنوێنرێ.**

***- لەسالّی ١٩٥٥دا لەگەڵ خولیا ئورکیدی دا دەزەوجێ.**

***- لەسالّی ١٩٥٦-١٩٥٨دا له لیمادا چەندین كاری جۆرا و جۆر دەكات- له بەخشی رادیۆدا، له رۆژنامەگەریدا، له كتێبخانەی یانەی ناسیونال، له زانستگەدا پۆستی مامۆستای یاریدەدەر وەردەگرێت.**

***- لەسالّی ١٩٥٨دا لەزانستگەی سان ماركوس ی لیما دەردەچێت و بەكالۆریوس له ئەدەبیاتدا وەردەگرێت.**

***- لەسالّی ١٩٥٩دا یەكەمین كتێبی خۆی كه بریتی بوو له كۆمەڵە كورتە چیرۆكێك بەناوی (رێبەران) بلاّو دەكاتەوە و خەلاّتی لیوپولدو ئالاس ی لەسەر وەردەگرێت.**

***- لەسالّی ١٩٥٩دا له زانستگەی مادریدا بۆ خوێندنی دكتۆرا خۆی ناونووس دەكات.**

***- لەسالّی ١٩٥٩دا له رادیۆ-تەلەفزیونی فەرەنسادا دەبێ بەوەرگێڕ و ڤەكۆڵەر و بێژەر.**

***- لەسالّی ١٩٦٣دا یەكەم رۆمانی خۆی (سەردەمی قارەمان) بلاّ و دەكاتەوە، كه بریتی یه له دنیایەكی بچووكی كۆمەڵگەی پیرۆ و لەسەر بناغەی ئەزموونێن هەرزەكاری خۆی له خوێندنگەی لیونسیوپرادو، رۆیناوە.**

***- لەسالّی ١٩٦٤دا له ماوەی مانەوەیەكی كورتدا له پیرۆ سەفەرێكی لێڕەوار دەكات. كه پاشان دەبێ بەكەرەستەو هەوێنی (خانەی كەسك).**

*- لەساڵی ١٩٦٥دا وەکو داوەری خەڵاتێن ئەدەبی کاسادیلاس ئەمریکاس بۆ کوبا سەفەر دەکات و هاوسۆزی لەگەڵ شۆڕشی ئەو وڵاتەدا نیشان دەدات.
*- لەساڵی ١٩٦٥دا ژنی یەکەمی تەڵاق دەدات، پاشان دۆت مامەکەی خۆی (پاتریشیا یوسا) دەخوازێت. (دوو کوڕ و کچێکیان هەیە) .
*- لەساڵی ١٩٦٦دا ڕۆمانی دووەمی بە ناوی (خانەی کەسك) بڵاو دەبێتەوە و بەمەش وەکو چیرۆکنووسێکی بەرجەستە لە ئەمریکای ئەسپانی زماندا دەناسرێت، خەلاتی پڕ ئیحتوباری ڕومولوگالە گوس لەسەر ئەم ڕۆمانە وەردەگرێت.
*- لەساڵی ١٩٦٩دا ڕۆمانی دوو بەرگی "گفتوگو لە کاتدرال"دا بڵاو دەکاتەوە.
*- لەساڵی ١٩٧١دا یەکەمین کتێبی خۆی لە بواری ڕەخنەی ئەدەبیدا بڵاودەکاتەوە، ئەم بەرهەمە تەواوکەری دکتۆرانامەکەیەتی بەناوی "گارسیا مارکیز: مێژووی یەك خودا کوژی،" .
*- لەساڵی ١٩٧٣دا ڕۆمانی (سەروان پانتوخاو خزمەتی تایبەتی) بڵا و دەکاتەوە، ئەمە یەکێکە لەو ڕۆمانە سەرکەوتوە کەمانەی لە جیهانی چیرۆکڤانی ئەمریکای ئەسپانی زماندا بڵا و بووەتەوە.
*- لەساڵی ١٩٧٥دا لە زانستگەی کولومبیا دادەمەزرێ.
*- لەساڵی ١٩٧٦دا دەبێ بە سەرۆکی ئەنجوومەنی قەڵەمی نێو نەتەوەییpen.
*- لەساڵی ١٩٧٧دا ڕۆمانی "پورەخولیا و نمایشنامەنووس" بڵاو دەکاتەوە. ئەمە ڕۆمانێکە دەربارەی ئەشقبازی لەگەڵ خولیا ئورکیدی و کاری نووسەری خۆی لە ئیستگەی ڕادیۆی لیما.
*- لەساڵانی ١٩٧٧-١٩٧٨دا لە زانستگەی کومبریج دا کورسییەکەی سیمون بولیڤاری لە بواری ڤەکولین لە ئەمریکای لاتین ی دەدرێتێ.
*- لەساڵی ١٩٨١دا ڕۆمانی (جەنگی ئاخر زەمان) بڵا و دەکاتەوە.
*- لەساڵی ١٩٨١دا یەکەم شانۆنامەی خۆی (تاکنای پیرەکیژ) بڵا و دەکاتەوە.
*- لەساڵی ١٩٨٤دا ڕۆمانی (ژیانی واقیعی ماتیا) بڵا و دەکاتەوە.
*- لەساڵ ١٩٨٦دا ڕۆمانی (کێ پالومینو مولرۆی کوشت؟) .
*- لەساڵی ١٩٨٨دا ڕۆمانی (حیکایەتخوان) بڵا و دەکاتەوە.
*- لەساڵی ١٩٨٨دا وەکو مامۆستای میوان لە کولیجی زانستە مرۆڤانی یەکانی زانستگەی سیراکۆز دادەنرێ.

***– لەساڵی ١٩٩٠دا بۆ هەڵبژاردنەکانی مانگی حوزەیران خۆی کاندید دەکات و بە ئالبرتو فوخی موری دەدۆڕێنێ.**

## ٧١- دەڤید هێربێرت لورانس

١٩٢٠-١٨٨٥

شۆرەت و ناوبانگی لورانس گەلەك هەوراز و نشێوی بە خۆوە دەیتووە، بەڵام لە دوا ئەنجامدا و لە ناو گەورە نووسەرانی ئینگلیزدا پایەیەکی شایستەی پەیداکرد، لۆرانس لە سەردەمی مارکس گەرایی دەیەی سی سەدەی بیستەمدا وەکو نووسەرێکی کۆنەپەرست باس دەکرا، کە لەساڵی ١٩١٣دا رۆمانی "کوڕان و ئاشقان"ی بلاّ و کردەوە، ئیدی دەرگای شۆرەتی لە رووداکرایەوە، ئەم رۆمانە باسی ئەوە دەکات کە چۆن دایکێك هەوڵدەدات ئاشقێنی لەگەڵ کوڕەکەی خۆیدا بکات و چۆن ئەم هەوڵە دەبێتە مایەی ئەوەی کە پەیوەندی سێکسی کوڕەکەی لەگەڵ ژنانی دیکەدا لەنێوبچیٚ، دوورنییە هەوێنی ئەم رۆمانە خودی خانەوادەی لورانس بیٚ، چونکە لورانس کوڕی خێزانێکی مەعدەنچی بوو، باوکی کەسێکی ڕدێن رەشی دژە ئاینی مەشروب خۆر بوو، بەشێوە زمانی ناهەمواری خەڵکی نانتینگم شر قسەی دەکرد، دایکی ئافرەتێکی شارستانی بوو، هاتووچۆی کلێسای دەکرد. بە ئینگلیزییەکی رەوان قسەی دەکرد، چەند ساڵێك مامۆستایەتی کردبوو. جا ئەم جووتە ململانیٚ و کێشمانەکێشێکی توندیان لەنێوان دا هەبوو، ئیدی رۆمانی نێو براو هونەراندنێکی سەرکەوتووی ئەم حاڵەتەیە و ئەوەتا لورانس پاش مردنی دایکی بە جسی چیمبرز کە پەیوەندی سۆزداری لەگەڵ پەیدا کردبوو، دەڵێت: "ئاشقی بووم وەکو ماشوقێك لەبەر ئەمەبوو کە هەرگیز نەمدەتوانی ئاشقی تۆ ببم." هەڵبەتە ئەم دیاردە ئۆدیپی یە لە رۆمانەکانی دواتری لورانسدا بە شێوەی جۆرا و جۆر رەنگی داوەتەوە.

لورانس، بەر لە کوڕان و ئاشقان دوو رۆمانی دیکەی بلاّو کردەوە بەناوی (تاووسی سپی ١٩١١) و (زێدەگاڤ ١٩١٢) تاووسی سپی بەرهەمێکی لاوازە کە تەنیا لەم رووەوە جێی بایەخە کە هەوێنی دوا رۆمانی ئەوە بەناوی (ماشوقی خاتوو چاترلی ١٩٢٨) ، زێدەگاف بەرهەمێکە کە بە شێوازی دۆستوفسکیانە کۆتایی هاتووە و زەینێکی هەستیار و هونەرمەندانە تانوو پۆی داوە.

دەڤید هێربێرت لورانس، لە هەمان کاتدا، شاعیرێکی فرەکار بوو، شیعرەکانی لە ژێر کاریگەری شاعیری بەناو بانگی ئەمریکایی والت ویتمن دا بوو. بەهۆی نویگەری لە وێنەو بزاڤی ناوەوەدا بوونە مایەی پەسند و ستایشی ئیزرا پاوەند، تاپێش کۆمەڵە هۆزانی کەشتی مەرگ ١٩١٣، تەنیا هۆزانی تایبەتی دەنووسی، بەڵام پاشان چەند

کۆمەڵە شیعرێکی دیکەی بەچاپ گەیاند، لورانس لەساڵی ١٩١٣دا خوشکان-ی بڵاو کردەوە، لەم رۆمانەدا وێنەی نەوە بە نەوەی یەك ماڵبات دەگرێت، لۆرانس لەبەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمەدا کە ناوی پەلکە رەنگینە بوو (هەر کە لەساڵی ١٩١٥دا بڵاو بووەوە یەکسەر و لەبەر کۆمەڵێك هۆی سێکسی و سیاسی بە بەرهەمێکی نا ئەخلاقی لەقەڵەم درا و راگیرا.) دەکەوێتە راڤەوشرۆڤەی سەردەمێکی مێژوویی کە ریتمی زننەگی خانەوادەیەکی جوتیار، لە ناو کۆمەڵگەی کۆندا، روو بەرووی گوشاری پیشەسازی دەبێتەوە و کاردانەوەی ئەو ماڵباتە لە هەمبەر ئەو گوشارە وێنە دەگیردرێ، لەم رۆمانەدا، لەهەمان کاتدا، بەیانێکی نوێ لەمەڕ مەیل و کەڵکەڵە سێکسی و گەڕان بەدووی ناسنامەی سێکسی دا لە شا قارەمانی رۆمانەکەدا، لە ئورسولادا، بەرجەستە دەبێ، پەسند کردنی ئەم رۆمانە لەلایەن یەکێك لە رەخنەگرەکانی ئەو زەمانەوە، ئەم کارەی خستە ریزی بەرهەمە کلاسیکەکانی جیهانی رۆمانی ئینگلیزییەوە، بەهەرحاڵ ئەم بەرهەمە دەبێ لەگەڵ رۆمانی "ژنانی ئاشق-١٩٢٠"دا کە پاشماوەی رۆمانی ناو براوە بخوێنرێتەوە و موتالابکرێ، "ماشوقی خاتوو چاترلی-١٩٢٨" یەکێکە لە رۆمانە بەناوبانگەکانی لورانس و هەرا و هەنگامەیەکی زۆری ناوەتەوە، بڵاوەخانەی پنگوین لەساڵی ١٩٦٠دا، ئەم رۆمانەی بێ هیچ سانسۆرێك بڵاوکردەوە، ئەوەبوو بەرپرسانی ئەم بڵاوەخانەیە دوای بڵاو کردنەوەی رۆمانەکە بۆ دادگا بانگ کران، وەکو ریسواییەکی نەتەوەیی ناوی ئەم دادگاییە براوە، بەهەرحاڵ چاپکرنی ئەم بەرهەمە وەکو رووداوێکی رۆشنبیری گەورە ژمێردراوە، بەرهەمەکانی دەیڤید هیربیرت لورانس، بەکورتە چیرۆك، رۆمان، سەفەرنامە، هۆزان، شانۆ، نیگارکێشی، و رەخنەوە وێڕای جۆراوجۆریان قەوارەیەکی شایستەیان پڕکردۆتەوە، کورتە چیرۆکەکانی بەتەنیا بەس بوون بۆ ئەوەی ئەو شۆرەتەی بدەنێ کە ئێستا لە ئەدەبیاتی جیهاندا هەیەتی، لەو ساڵانەی دواییدا بایەخێکی زیاتر بە بەرهەمەکانی دراوە، بەرهەمەکانی ئەو دەربارەی هونەر، نیگارکێشی یەکانی، شانۆنامەکانی (کە هەموویان سەرکەوتوون) شیعرەکان و رەخنەکانی، هەر هەموو بەشێك لەمۆدێرنیزم پێك دێنن، بەتایبەتی "ژنانی ئاشق"ەکەی کە لەرووی دەوڵەمەندی شێواز، ئاڵۆزی و رەوانییەوە بە هاوتای ئولیسی جیمز جۆیس دەژمێردرێ، لورانس ژیانێکی ئاڵۆز و قەرەجانەی هەبووە و لەگەڵ فەریدای هاوسەریدا گەشتی ئەوروپا و باشووری رۆژئاوای ئەمریکای

مـەكزیكی كـردووە، لەسـاڵی ١٩٣٠دا لـە باشـووری فەرەنسـادا بـە نەخۆشـی سـیل مردووە.

## ٧٢- بیرتولت بریشت

١٨٩٨-١٩٥٦

شانۆنامەنووسێکی ئەڵمانییە، بابی بەڕێوەبەری کارخانە بوو، لە زانکۆی میونیخ خوێندنی پزیشکی تەواو کردووە. لە ساڵی ١٩١٨دا کراوە بە سەرباز، هەرچەندە لە بواری کاری پزیشکیدا خزمەتی کردووە، بەڵام ئەنجامە ترسناکەکانی جەنگی چەشتووەو تاقی کردۆتەوە. هەر ئەمەش وایکرد ببێ بە یەکێك لە هەواداران و لایەنگرانی ئاشتی. لە شانۆنامەی "بال ١٩٢٢"و شانۆنامەی "دەهۆڵانی شەو ١٩٢٢" لە رێگەی فەلسەفەیەکی نەهلیستییەوە داوای گۆڕانی ریشەیی دەکات. بە هاوکاری لەگەڵ کورت نیل دا (ئۆپرای دەرۆزەکەران)، (ئۆپرای سێ قرۆشەکە)ی بەرهەم هێناوە کە هەردووکیان دوو رویی و ریاکاری کۆمەڵگەی پارە پەرست و دەسەڵات پەروەر ریسوا دەکەن.

کە نازییەکان هاتنە سەر حوکم. بە هۆی بیرو باوەڕی مارکسییەوە، کە لەو سەردەمەدا زیاترو روونتر لە شانۆنامەکانیدا رەنگی دابووەوە، لە ئەڵمانیا دەرکراو رەهەندەی ولاتان کرا. لە سالانی (١٩٣٣-١٩٤٨) لە ولاتانی ئەسکەندەنافی و لە بەریتانیادا ژیانی بەسەر برد. باشترین بەرهەمی خۆی لەو سەردەمەدا نووسی. لە شانۆنامەی گالیلۆدا ١٩٣٩ بەردەوام بوو لە سەر هێرش کردنە سەر خراپییەکانی کۆمەڵگەو مەحکوم کردنی توندڕەوی ئاینی. لە شانۆنامەی (بوتیلاو ماتیی خزمەتکاری ١٩٤١)دا سەرمایەداری مەحکووم کردووە، لە شانۆنامەی "دایکێکی ئازاو منداڵەکانی دا ١٩٣٩" وێنەی ئەو کوێرەوەری و گەوجێتییانەی گرتووە کە لە جەنگ دەکەونەوە. لە بواری شانۆی مەلحەمیدا دەیویست کارێکی وەها بکات کە تەمەشاڤان ئاوێتەی کەسایەتییەکان نەبێ و پەنا وەبەر ئەقڵ بەرێ نەك سۆز، بۆیە پەنای وەبەر بەکارهێنانی کاریگەری و روناکی شانۆیی غەریب و ناباو دەبرد. ئیدی بەردەوام بوو لە ئەزموونانددا، تەنانەت لە دوا شانۆنامەکانشیدا. ژنێکی باش لە سیتزاون ١٩٤٠) مەتەڵێکی مەغزداری بەڕاز و رەمزەو تەمەشاڤان دەبێ بەخۆی کەشفی بکات و هەڵی بێنێ. (بازنەی گەچینی قەوقازی ١٩٤٥)دوا بەرهەمێتی کە بریتییە لە رووبەرووبوونەوەی نێوان خێر و شەڕ لەسەر بنەمای ئەفسانەیەکی کۆنی چینی رۆنراوە. لە دوای جەنگی جیهانی دووەم گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیاو بوو بە سەرۆکی (ئەنجوومەنی بەرلین) لە بەرلینی رۆژهەلات و لەسەر ئەو کارە مایەوە تا لە ساڵی ١٩٥٦دا کۆچی دوایی کرد.

## ٧٣- بۆریس باسترناك

١٨٩٠-١٩٦٠

ڕۆژنامەنووس و شاعیرێکی لیریکی روسییە، خودان روانین و جیهانبینییەکی تیژە، رامان و وردبوونەوەیەکی فەلسەفی هەبووە. نووسەرێکی خودان سۆز و گوداز بووە. لە نێوان ساڵانی ١٩١٤-١٩٣٢دا شەش دیوانە شیعری هەرە نایابی بڵاو کردەوە. ئەم دیوانانە دوو چامەی داستانییان لەخۆ گرتووە کە ستایشی ئازادی و بزاڤی شۆڕشگێڕی دەکەن. ئەو گوشارانەی داوایان لێدەکرد کە پابەندی ئایدۆلۆجیا بێ، شیعریان لەلای بێدەنگ کرد.

هەندێك لە بەرهەمێن شەکسپیر، شیللی و گوتێی وەرگێڕاوە. لە ساڵانی ١٩٤٦-١٩٥٣دا، لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا رۆمانی دکتۆر زیڤاگۆ-ی تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٥٨دا خەڵاتی نۆبڵی درایێ بەڵام بەهۆی گۆشاری دەسەڵاتەوە رەفزی کرد. بەرهەمێکی دیکەی بریتییە لە گەشتی ژیانی. رۆمانی دکتۆر زیڤاگۆ باسی روسیای سەدەی بیستەمە. باسی جیهانە، باسی خۆشەویستییە باسی دژواری شۆڕشە کە دەوری ژیان بە مەرگ دەتەنێ، هەرچەندە ئەم رۆمانە هێرش ناکاتە سەر بەها سۆڤییەتییەکان، بەڵام جەخت لەسەر بەهایێن دی دەکات وەکو کەرامەتی تاك، بەزەیی و سۆز، لێکدی حاڵی بوونی رۆحی. دیارە ئەم هەستە سۆفیەت ئامێزە زاڵە بەسەر ئەو قەسیدانەشدا کە کراون بە پاشکۆی رۆمانەکە.

## ٧٤- ئەلكسەندەر پوشكین

١٧٩٩-١٨٣٧

شـاعیرێكی هـەرە نـاوداری روسـییە، هـەروەها شانۆنامەنووسـێكی دیـاریش بـووە. یەكەمین نووسـەری نـاوداری روسییە كە لـە دەرێـی وڵاتـی خۆیـدا ناوبانگێكی فرەی دەركـرد. كارەكـانی بـە هـەوێن و روحـی نەتـەوەیی دەژمێـردرێن، روسـەكان زۆریـان خـۆش دەویٚ. لـە بنەماڵەیـەكی ئوروسـتوكراتی خانەدانـە. یەكـەم كـاری لـە بـواری پەخشاندا رۆمـانێكی مێژوویـیە دەربـارەی باپیری (بـابی دایكـی) كـە سـەركردەیەكی زەنگی حەبەشی بوو. پاشان ماوەیەكی كورتی تەمەنی بە رابواردن و شیعرەوە بردە سـەر. قەسـیدە لیریكییـەكانی زیـاتر ستایشـی ئـازادی و بـە گـڕا چـوونەوەی دكتاتۆرییەتیان لەخۆ گرتووە. بەهۆی بیروبۆچوونە ئازادیخوازییەكانەوە ماوەیـەك لـە نووسینگەی وەزارەتی دەرەوە دەست بەسەر كراو، پاشان وەكو جۆرە نـەفی كردنێك، لـە نێـوان سـاڵانی ١٨٢٠-١٨٢٤دا هەواڵـەی باشـوور كـرا. و لەئەنجامـدا لـە وەزیفـە دەركرا. قەسیدە درێژەكانی: بەندی قۆقاز، قەرەج، دزانی بـرا، باسـی كیرمیـاو قۆقـاز دەكەن كە شاعیر بۆ ئەوێنـدەر نـەفی كرابـوو. جا ئـەم قەسـیدانە شـۆرەتێكی گـەورەیان دایێ و بە (بایرونی روسیا) ناودەبرا. زەوجینی لەگەڵ ئافرەتێكی بەنازی زۆر جوان دا (كە ئەمە بە پێـی قسـەی خـۆی سـەدو سیازدەمین ئافرەتی ژیـانی بـوو) ئارامی بۆ هیچیان دابین نەكرد. پاش شەش ساڵان، و لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا لـە دوئێلێك دا كـە زادەی خیانەتەكانی ژنەكەی بوو هاتە كوشتن.

لە ماوەی ئـەو ساڵانەدا كە لـە باشـووری روسـیادا بەسـەری بـرد، رۆمـانێكی شـیعری رەخنە ئامێزی رۆمانسیانەی درێژی، لە ساڵی ١٩٣٣دا بـەناوی (ئـوجین ئـونیجین) وە نووسی ئەم رۆمانـە لەسـەر شێوەی (دون جوان) و (بیبـو)ی بایرونـە. لـە پێنـاوی ئـەم چامەیەدا كۆپلـە شـیعرییەكی چواردە بـەیتی داهێنـا كـە یـەك ریتمـی و یـەك نـەوایی دەپـارێزیٚ. ئـەم رۆمانـەی لەبـەر تۆكمـەیی، بەتایبـەتی لـە رووی كاراكتەرسـازی و وێنەگرتنی واقیعیانەی دیمەنەكان چ لە سەرانسەری وڵاتداو چ لە شاری بترسبورگ دا، بـە یەكـەمین رۆمـانی روسـی لـە قەڵـەم درا. لـە سـاڵی ١٨٢٥بوریس غودونـوف-ی نووسـی كـە تراژیدیایـەكی مێژوویـیە بـە شـیعر، ئـەم بەرهەمـەی لـە ژیـانی تـزارەوە لـە سەدەی شازدەدا هەڵینجاوەو لەسەر شێوەی شانۆنامە مێژووییەكانی شەكسپیرە.

گەورەیی پوشکین لە بەهرە لیریکییەکانیدایە، چایکوفسکی لەم بارەیەوە دەڵێت چامە لیریکییەکانی (خۆیان دەسترن) زمانە لیریکییە پڕ گوزارشتەکەی گوزارشت لە تەوژم و گوڕی شیعرییەتی شتە باوکان دەکات، مانا رەمزییە هەرە قوڵەکانی دەنوێنێ. بە هەر حاڵ پوشکین یەکێکە لە نووسەرە هەرە مەزن و گرنگەکانی میللەتی روس.

## ٧٥- هنريك ئه‌پسن

١٨٢٨-١٩٠٦

شانۆنامه‌نووسێکی نه‌رویجییه‌، وه‌ختێ ئه‌پسن خووی دایه‌ دنیای شانۆو، شانۆگه‌ری له‌ نه‌رویجدا له‌ ئه‌وپه‌ڕی قات و قڕی دا بوو. شانۆیی نه‌رویجی له‌سه‌ر ده‌ستی ئه‌و په‌ره‌ی سه‌ندو هاته‌ دامه‌زراند و به‌مه‌ش شۆره‌تی جیهانی وه‌رگرت، ئیدی به‌ره‌ به‌ره‌ بوو به‌ که‌سایه‌تییه‌کی ئه‌وروپایی هه‌ره‌ کاریگه‌ر چ وه‌کو شانۆنامه‌نووس و چ وه‌کو پێشڕه‌وێکی بواری رۆشنبیری.

ئه‌پسن له‌ شارۆچکه‌ی سکین-ی باشووری نه‌رویج له‌دایك بووه‌. سه‌رده‌می لاوی به‌ گۆشه‌گیری بردۆته‌سه‌ر. له‌ ته‌مه‌نی ١٦ ساڵیدا له‌ شارۆچکه‌ی گریم ستادا بوو به‌ شاگرد له‌ ده‌رمانخانه‌یه‌کدا و شه‌ش ساڵان له‌وێنده‌ر مایه‌وه‌. گه‌لێك له‌ خووخده‌و عاده‌ته‌کانی سه‌رده‌می منداڵی و لاوی ئه‌پسن له‌ کاراکته‌ره‌کانی شانۆنامه‌کانیدا ره‌نگیان داوه‌ته‌وه‌. که‌سێکی سه‌ختگیرو سه‌رسه‌خت بوو، حه‌زی ده‌کرد که‌سایه‌تی خۆی بسه‌لمێنێ. که‌سێکی یاخی و دووره‌ په‌رێز بوو. هه‌میشه‌ دژی ته‌سکبیری سه‌رده‌می خۆی بوو. شۆڕشه‌کانی ئه‌وروپا له‌ ساڵی ١٨٤٨دا هێنده‌ی دیکه‌ ئه‌پسنی هاندا. ماوه‌یه‌ك و به‌ شێوه‌یه‌کی ره‌وته‌نی رووی کرده‌ سیاسه‌ت، ئه‌مه‌ش له‌ شانۆنامه‌ مێژووییه‌که‌یدا (کاتیلین-١٨٥٠) ره‌نگی داوه‌ته‌وه‌ بیرۆکه‌ی ئه‌م شانۆنامه‌یه‌ی له‌ زۆر کاری دیکه‌دا دیاره‌: شایستی یاخیبوونی راستگۆی په‌یامداره‌. ئه‌م شانۆنامه‌یه‌ له‌و کاتانه‌دا گه‌ڵاڵه‌ بوو که‌ خۆی ئاماده‌ ده‌کرد بۆ تاقی کردنه‌وه‌ی وه‌رگرتن له‌ زانکۆ بۆ خوێندنی پزیشکی، ده‌بوایه‌ وه‌کو زۆربه‌ی لاوان و خوێندکارانی دیکه‌ گوتاره‌کانی شیشیر و دژی کاتیلین بخوێنێ، به‌ڵام سه‌یری کرد یاخی پێ په‌سنتره‌ له‌ سیاسه‌توان. ئیدی به‌ره‌ به‌ره‌ له‌ پزیشکی ته‌وه‌لا بوو و خوی دایه‌ فه‌لسه‌فه‌و ئه‌ده‌ب، به‌تایبه‌تی شانۆ بۆ ماوه‌ی ١١ ساڵ به‌ڕێوه‌به‌ری شانۆی بیرگن بوو، له‌ ساڵانی ١٨٥٧ تا ١٨٦٢ ده‌رهێنه‌ری شانۆیی بوو له‌ ئۆسلۆ. که‌ بینی وولاته‌که‌ی زۆر پاشکه‌وتووه‌و به‌که‌ڵکی کاری داهێنه‌رانه‌ی ئازاد نایه‌ت له‌ ساڵی ١٨٦٤دا رووی کرده‌ رۆما. له‌ ساڵی ١٨٦٦دا یه‌که‌مین شانۆنامه‌ی له‌ تاراوگه‌دا به‌ناوی (براند)وه‌ نووسی. ئه‌م شانۆنامه‌یه‌ ئه‌سکه‌نده‌ناڤییه‌کانی به‌ ته‌واوه‌تی هه‌ژاند. له‌ ساڵی ١٨٦٧ شانۆنامه‌ی (بیرگنت)ی نووسی که‌ له‌ رووی نێوه‌رۆك و کاراکته‌ره‌کانییه‌وه‌ کارێکی ته‌واو نه‌رویجییه‌. ئه‌پسن له‌ که‌سایه‌تی (براند)دا وه‌عزداده‌رێکی خوڵقاندووه‌ که‌ کاره‌ساتی ئه‌م واعیزه‌ له‌وه‌دایه‌ پابه‌ندی به‌هایه‌کی باڵایه‌و هیچ سازشێك قه‌بوڵ ناکات، کوێرانه‌

ئەرك و پەیامی خۆی ئەنجام دەدات. بابایەکی دەمارگیرە، خێزانەکەی لەدەست دەدات، لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی غوربەت و لە خۆبێگانە بوونی پەیڕەو و موریدەکانی خۆی، دەمارگیری ئایینی و سەرسەختی خۆی دەیخەنە داوەوەو دایدەڕوخێنن.

شانۆنامەی (بیرگنت) کارێکی گەش و روون و شادی ئامێزە، دەوڵەمەندی هونەری میللی ئەسکەندیناڤی لەخۆی گرتووە. بە زەبری دەوڵەمەندی شیعری،و دەوڵەمەندی وێنەکانی و قوڵی جیهانبینییەکانی، لەلای ئەسکەندیناڤییەکان بووە بە هاوتای فاوست لەلای ئەڵمانەکان و دۆنکیشوت لەلای ئەسپانەکان، ئەو بەرهەمانە ئاوێنەی ژیان و کەسایەتی ئەو گەلانەن.

دیارە ئەپسن زیاتر لە رێگەی شانۆنامە واقیعییەکانییەوە کە بە پەخشان و نەفەسی پەخشانییەوە نووسراون بەناوبانگە. پاش ئەوەی دەستبەرداری ئەو فۆرمە شیعرییە بوو کە لە برانت و بیرگنیتدا بەکاری هێنابوو، ئیدی پێی نایە قۆناغێکی تازەی کاری شانۆیی و لە ساڵی ١٨٧٧دا شانۆنامەی (دەمڕاستانی کۆمەڵگە)ی نووسی ئەم شانۆنامەیە پەردە لە رووی دەمراست و سەرکردەکانی کۆمەڵگە لادەبات، پەردەی ریاو ریاکاری، گەندەڵی و بۆگەنی بنەڕەتییان دەخاتە روو. شانۆنامەکە بەوە کۆتایی دێت کە کۆڵەکە راستەقینەکانی کۆمەڵگە ئەو کەسانە نین کە خۆیان کردووە بە خەڵکی بەرزو دەمڕاستی خەڵکی، بەڵکو کۆڵەکەی راستەقینەی هەر کۆمەڵگەیەك ئازادی و راستگۆییە. دەتوانرێ بگوترێ کە ئەم شانۆنامەیە بیرۆکەی گەلێك لە کارەکانی دواتری ئەپسنی دیاری کرد. زۆر جاران دەگەڕێتەوە بۆ هەمان بیرۆکە و جیهانبینی کە کۆمەڵگەکەمان لە بنج و بناوانەوە گەندەڵە، لەسەر کۆمەڵێك درۆی تەقلیدی دەژی، ئەو زمانانە لە گۆ دەخات کە پەردە لە سەر ساختەکاری و قەڵبییەکانی لادەبەن. کۆمەڵگەیەکە هیچ پرەنسیپ و بەهایەکی راستەقینەی تێدا نییە تەنیا رواڵەت و رواڵەتبازی ساختە نەبێ کە دەبێ بە هەر نرخێ بووە لابرێ.

شانۆنامەی (خانەی گەمان ١٨٧٩) دەربارەی ئافرەتێکە دەیەوێ بە جیابوونەوە لە مێردەکەی سەربەخۆیی خۆی وەدی بێنێ. ئەم شانۆنامەیە مشت و مڕێکی زۆر گەورەی نایەوە و نووسەر هاتە سەر ئەو قەناعەتەی کە دەبێ کۆتاییەکەی بگۆڕێ. ئەپسن لە شانۆنامەی (تاپۆیان — ١٨٨١)دا ئافرەتێك دەخاتە روو کە مانەوەی لەگەڵ مێردەکەیدا بە هەڵە لە قەڵەم دراوەو باجی قەراری مانەوەکەی کە یەکپارچە کلۆڵی و داماوییە دەدات. ئەم شانۆنامەیە بووە مایەی توڕەیی لە هەموو ئەوروپادا بەهۆی

مالیجەی ڕاشکاوی بۆ نەخۆشییەکی سێکسی. توڕەیی لە نەرویجدا گەییە ڕادەیەك کە هەم لیبراڵەکان و هەم موحافەزەکارەکان دژی وەستانەوە. لە ساڵی ١٨٨٢دا (دژمنی گەل)ی نووسی وەکو بەر پەرچدانەوەیەك بۆ ئەوانەی رەخنەیان لێگرت، هێرشی سەرەکی کردە سەر (ئەو زۆربەیەی دژی وەستانەوە، ئەو زۆربەیەی بیر ناکەنەوە).

ئەپسن لە پاش شانۆنامەی (سۆنەی کێوی ١٨٨٤) گەڕایەوە بۆ تاکایەتی ژنان لە شانۆنامەی (روکمر شولم-١٨٨٦و هیدا گابلر- ١٨٨٩)دا.. هیداو رابیکاویست دوو نموونەی ئەو ژنانەن کە کێشەو ململانێیەکانیان، لە نەسەلماندنی سروشتیاندا بەهۆی ئارەزووەکانیانەوە، دەست پێدەکات. واتە بەهۆی ئارەزووەکانیانەوە ناتوانن تەبیعەتی خۆ بسەلمێنن.

ڕەمز و ڕەمزکاری و ڕەمزییەت بەرادەیەك لای ئەپسن زاڵە کە بە دەگمەن شانۆنامەیەکی دەبینریٚ هەندیٚ رەگەزی ڕەمزی نەگرێتە خۆ. جەخت کردن لەسەر ڕەمزییەت لە شانۆنامە شیعرییەکانی سەرەتایدا روون و ئاشکرایە. هەڵبەتە شانۆنامەکانی دواتریشی لە ڕەمزییەت بەدەر نین وەکو بەکارهێنانی سۆنەی کێوی لە شانۆنامەی (سۆنەی کێو)دا، هەسپی سپی لە (روکمر شولم)، دەریا لە (خانمێك لە دەریاوە).

هەڵبەتە لە دوا شانۆنامەکانیدا ڕەمزییەت زۆر بە چڕی بەکار هاتووە و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش ژیننامەی خۆی بەکار هێناوە.

ئەپسن، بەشداری خۆی لە بواری شانۆدا، بە شێوازێکی تازە کردووە. بە جورئەتەوە شێوازە کۆنەکانی فەرامۆش کردووە، بیرو گیروگرفتی ئەوتۆی خستۆتە روو کە پێشتر تەختەی شانۆ بەخۆیەوە نەبینیوە.

ئەپسن بە شێوەیەکی قەناعەت بەخش هەڵس و کەوت لەگەڵ هزرە زیندووە جیهانییەکان دەکات وەك: کێشەی نێوان تاك و کۆمەڵگە، نێوان واقیع و خەیاڵ، نێوان ئایدیالی حەقیقی و ئایدیالی ساختەو قەڵب.

## ٧٦- ڤیکتور هوگۆ

١٨٨٥-١٨٠٢

شاعیر و شانۆنامەنووس و رۆماننووسێکی فەرەنسییە، بابی فەرماندە بوو لە سوپای ناپلیۆن دا. هوگۆ لە سەرەتادا دڵبەندی ناپلیۆن و شالویس فلیپ بوو، پاشان دەستبەرداری ئەو دڵبەندییە بوو و شەیدای دیموکراتییەت بوو. لە ساڵی ١٨٥١دا بەهۆی بەربەرەکانی کردنی توندی ناپلیونی سییەم وولاَت بەدەر کراو دوور خرایەوە، بەڵام کە لە ساڵی ١٨٧٠دا بۆ پاریس گەڕایەوە وەکو قارەمان و پەیامبەر پێشوازی لێکرا. دوا ساڵەکانی تەمەنی لەم کەش و هەوا پڕ لە ڕێز و قەدرەدا گوزەراند. هۆگۆ بابایەکی مەغرور و خۆپەسند بوو، دیارە هیچ بیانوویەك بۆ ئەو خۆ پەسندییە نەبوو، چونکە لە نێو هەر پەنجا بەرهەمەکەیدا تەنیا چەند شاکارێك هەبوو. "باوەڕی وابوو کە دەبوایە شاری پاریس بەناوی ئەوەوە بنرێ وەکو ڕێز و قەدرزانییەك بۆ ئەو"

ئەو پێشەکییەی بۆ شانۆنامەی (کروموێل- ١٨٢٧)ی نووسی بوو، بوو بە پرەنسیپی شانۆ لە بزاڤی رۆمانسی فەرەنسیدا، و پایەی هۆگۆی وەکو کەسایەتییەکی ئەدەبی گەورە چەسپاند. باوەڕی بە ئازادی هەبوو لە هەڵبژاردنی بابەت و لە هۆنینەوەی هۆزاندا. ڕێساکانی کلاسیکیەتی تازەی رەفز کرد و پێی وابوو یەکێتی راستەقینەو بنەڕەتی، یەکێتی هونەری کارەکەیە. بەرەڤانی لە هاوشانی جوانی و ناشیرینی کردووە، ستایشی شەکسپیری دەکرد چونکە دیمەنی تراژیدی و کۆمیدی ئاوێتە دەکرد. ئەم بۆچوونانەی لە شانۆنامەی (هیرنانی-١٨٣٠)دا بەرجەستە کردووە. لەم شانۆنامەیەدا واقیعی رۆژانەو وێنەیێن بەلاغی ئاوێتە کراوە. هەرچەندە ئەم شانۆنامەیە بە میلودراما حەساو دەکرێ و کاراکتەرەکانی ناواقیعن، بەڵام گیانی لیریکی لێوە هەڵدەقوڵێ.

رۆمانەکانی پڕن لە قارەمانی خەیاڵی و دیمەنێن لە رادەبەدەر سۆزاوی. (نوتەردامی قەمور ١٨٣١) وێنەی گۆڕ و تەوژمی ژیان لە سەدەی پازدەدا دەگرێ، قەموور و زەنگەوانی کڵێسا رەمز و نیشانەی تەوژمی مرۆڤانین، (بێنەوابان-١٨٦٢) ئەویش سۆزداری و میلۆدرامییە، هەراو هەنگامەو ئاژاوەو پاشاگەردانییەکە ئەوسەری دیار نییە، ئیدی لە شەڕەوە بیگرە تا بانکەکانی پاریس. دەفری هەزرو بیرە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیەتی، خەڵکی لە بنەڕەتدا یەکسانن، هەژاران بەشێوەیەکی سیستماتیك لەلایەن کۆمەڵگەوە دەچەوسێنەوە، ئەو کلۆڵییە مرۆڤانییەی کە جان

فالجان–ی تاوانبار پیادەی دەکات باجی کۆمەڵە ئەم کارە هەرچەندە کەسایەتی و قارەمانەکانی سەرڤەسەرڤەن و رووداوەکانی مەحاڵ دێنە بەرچاو بەڵام هەستی مرۆڤ دەهاڕوژێنیٚ، خۆشەویستی باوکانە، تۆڵە، ئەمەکداری و بەزەیی تێدا دەبینریٚ.

هۆگـۆ هەرچـەندە وەکـو رۆمـاننووس و شـانۆنامەنووس یـەجگار مەنشـورە، بـەڵام شـورەتی راستەقینەی ئەو بە شیعرەکانییەوە بووە. شاعیرێکی لیریکی زاڵ بەسەر ریتم و کێشدا، دەوڵەمەند لە زماندا، ساماوەر لە وێنەدا، خودان شێوازێکی ئەوتۆ کە لـە تـۆ وایـە لـە دوو تـوێی کارەکانییـەوە قوڵـە قـوڵ هەڵـدەقوڵیٚ.. زێـدەڕۆیی لـە رۆمانەکانیدا زۆر زەقە بەڵام دەسەڵاتە هونەرییەکەی و دەوڵەمەندییە زمانەوانییەکەی سەرچاوەی ئیلهامی زۆر نووسەری دواتری فەرەنسی بوون وەکو: مالارمیە، وزولا، بەڵام لەگەڵ زێدەڕۆییـە رۆمانتیکییەکانیدا نەبوون. شیعرە لیریکییـەکانی خـۆی لـەم دیوانانـەدا بـڵاو کـردەوە: (چـەند گۆرانییـەك لـە رۆژهەڵاتـەوە ١٨٢٩، پـەلکێن پـاییز ١٨٣١، سـترانێن سـپێدە ١٨٣٥، دەنگـێن دەروون ١٨٣٧، تـیرۆژی هـەتاوو سـێبەر ١٨٤٠) لەم دیوانانەدا بە خۆیایی سۆزە مرۆڤانییەکانی دەردەکەون و پێوەی دیارە کە دەیەویٚ بەهایەکی ئەخلاقی بە سروشت بدات. (العقاب ١٨٥٣) رەخنەیەکی توندە لـە ناپلیون و لـە قەسیدە هـەرە گرنگەکانیـەتی (ئەفسانەی سـەردەمان ١٨٥٩) وەکـو داستانێکی مێژوویی باس دەکرێت. هەمەجۆری بابەت و شێوازی نووسینی هوگۆ لە سـەردەمی خۆیـدا بـیٚ وێنـە بـووەو کـەس شـانی لـە شـانی نـەداوەو کاریگـەری بەرهەمـەکانی تـەنیا لـە چوارچـێوەی فەرەنسـادا قـەتیس نـەماوە، بـەڵکو پـەلوپۆی هاویشتووەو شاعیرانی ئینگلیزیشی گرتۆتەوە بەتایبەتی تینیسون و سوین بیرن.

## ٧٧- كاوابـاتـا ياسۆنـاری

١٨٩٩-١٩٧٢

رۆماننووسـێکی هـەرە بـەناوبانگی ژاپۆنییـە، لـە سـاڵی ١٩٦٨دا خـەڵاتی نـۆبڵی وەرگرت. خودانی زنجیرەیەك رۆمانی شیعرییە کە پتر بایـەخ بە کەشفکردنی ڤیان و غوربەت دەدەن لە لای مرۆڤ. لە ساڵی ١٩٢٥دا بەرهەمی (ئیزۆی سەماکار)ی بڵاو کردەوەو ئەم کارە بووە مایەی سەرنجی ئەدیب و ئەدەبدۆستان. بەناوبانگترین رۆمانی (وڵاتی بەفران ١٩٤٧)ە کە سۆزو گودازی کیژە گوندییەك و حاڵەتی غوربەتی یەکێك لە دڵدارەکانی دەهونەرێنێ. رۆمانی (هەزار گەردن ١٩٤٩) بریتییە لە ئاهەنگێکی چا خواردنەوەو کاریگەری رابردوو لەسەر ژیانی مرۆڤانی. (دەنگی چیا ١٩٥٤) لە ساڵی ١٩٧٠دا کراوە بە ئینگلیزی ئەم رۆمانە بۆشایی نێوان نەوەکان بەرجەستە دەکات.

کاواباتا کاریگەرییەکی زۆری بزاڤی رەمزی هاوچەرخی فەرەنسا بوو. کاواباتا سەفەری زۆری کردووە، کۆڕی ئەدەبی و رۆشنبیری زۆری لە رۆژاوادا گێڕاوە. لە ساڵی ١٩٦٩دا لە زانکۆی هاوایدا دەرسبێژ بووە. لە ساڵی ١٩٧٢دا خۆی کوشتووەو بەمەش خەسارەتێکی زۆر بەئەدەبیات گەییشت

## ٧٨- مەكسیم گۆركی

١٩٣٦-١٨٦٨

مەكسیم گۆركی ناوی ئەدەبی ئەلیسكی بیشكۆفە. گوركی رۆماننووس و شانۆنامەنووسێكی رووسییە. لێكۆڵینەوە لە ژیان و بەرهەمی گۆركی خۆی لە خۆیدا لێكۆڵینەوەیە لە كاروباری سیاسی و كۆمەڵایەتی روسیا لە سەروبەندی داروخانی تزاریسم و هەنگاونان بەرەو كۆمۆنیزم. گۆركی سەر بە بنەماڵەیەكی گوندی هەژارە. هەر لە منداڵی ڕا دژواری ژیانی جەرباندووە. لە حەوت ساڵیدا هەتیو كەوت و ئیدی لە نۆ ساڵییەوە كەوتە گێژاوی خۆ ژیاندنەوە. لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا كەسوكارو خزمە دڵڕەقەكانی بەجێهێشت و سەری خۆی هەڵگرت و سەراپای روسیای دایە ژێر پێوەو بەردەم كارو كرێكارییەوە زروڤ هەمەجۆرو خەڵكانی هەمەجۆر تری بینی و جەڕباند كە پاشان بوون بە هەوێنی چیرۆك و شانۆنامەكانی. بەشداری بزاڤی رادیكالیزمی كرد، هەمیشە لە سەنگەری ئۆپوزیستونیستاندا بووە، بەخۆی جارێك گوتویەتی:"بۆ ئەوە هاتوومەتە ئەم دنیایە تا بەرهەڵستكاری بكەم". لە شۆڕشی ناكامی ١٩٠٥دا بەشداری كرد و ناچار بوو هەڵێت و خۆی بگەیەنێتە ئەوروپای رۆژاواو تا ساڵی ١٩١٣ لەوێندەر مایەوە. یەكێك بوو لە هەوادار و لایەنگرانی شۆڕشی ١٩١٧و بەمەش پایەكی ئەدەبی بەرزی لە رووسیای سۆڤیەتی دا بەدەست هێنا.

بەرهەمەكانی زادەی سێ قۆناغن: قۆناغی یەكەم دەكەوێتە پێش تەمەنی سی ساڵییەوە، لەم قۆناغەدا بە چەند كورتە چیرۆكێك، كە پتر زادەی دەربەدەری خۆی بوون لە روسیادا، سەرنجی ئەدیب و ئەدەبدۆستانی راكێشا. لەم چیرۆانەدا هاوسۆزییەكی قوڵ لەگەڵ كلۆڵی و كوێرەوەری جەماوەری روسیادا دەكات. لەودیوی پەردەی كلۆڵیانەوە كۆمەڵێك بەهاو روانگەی مرۆڤانی كەشف دەكات كە پێی وایە ئەو بەهاو روانینانە رۆژێ لە رۆژان دەبێ بە چەكی رزگاربوونیان. لەو چیرۆكانە: (شیلكاش ١٨٩٤، شەوێكی پایزی ١٨٩٤، ئیتزراگیل ١٨٩٨).

قۆناغی دووەم بریتییە لەو رۆمان و شانۆنامانەی كە پۆخڵەوات و بەدڕەوشتییەكانی ناو جەماوەری روسی هونەریانە بەرجەستە دەكات. ئەم بەرهەمانە تاڵ و لێڵ و رەش و واقیعین. قارەمانانی ئەم بەرهەمانە هەوڵ دەدەن كاروباران بفەلسەفێنن و بكەونە رێ تا دەگەنە "مانای ژیان". سۆزداری لەگەڵ ئەو خەڵكەدا دەكات وەكو لە (زەلكاو ١٩٠٢)دا دیارە، بەڵام لە (هاووڵاتیانی خومار ١٩٠٢)دا و لە (گەلی هاوینە ١٩٠٥)دا رەخنەیان لێ دەگرێت و و تەوسیان پێدەكات.

رەخنەگران پێیان وایە کە باشترین بەرهەمێن گۆرکی لە قۆناغی سێیەمی دایە کە لە باری میزاجەوە هێدی تر بووە. نووسینەوەی ژینامەی خۆی و بیرەوەرییەکانی لەمەڕ نووسەرانی دی نیشانەی خەملێنی فیکرییەکی ئەوتۆیە کە لە بەرهەمەکانی سەرەتایدا بەدی ناکرێ. لەو بەرهەمانەی: (مندالێتیم ١٩١٣، بیرەوەریم لەگەڵ تولستۆی دا ١٩١٩، بیرەوەرێتی لاوێتیم ١٩٢٣، بیرەوەریان ١٩٢٥.)

شانۆنامەی (زەلکاو) باشترین بەرهەمێتی بەتایبەتی لە دەرێی روسیا. ئەمە نموونەی نووسینەکانی و بیروبۆچوونەکانێتی، ئەم کارە لەسەر شانۆی هونەری مۆسکۆ نمایش کرا. ئەو بیرو بەها مرۆڤانیانەی گۆرکی لەم شانۆنامەیەدا هونەراندوونی، کارێکی وایکردووە کە ئەم بەرهەمە ببێ بە کارێکی زۆر جوان و ئایندەیەکی گەش بخاتە بەردەم مرۆڤ.

## ٧٩- فرانز كافكا

١٨٨٣-١٩٢٤

رۆماننووسێکی ئەڵمانییە لە سەردەی ئیمپراتۆریەتی نەمساوی هەنگاریدا ژیاوە. لە ساڵی ١٩٠٦دا پلەی دکتۆرای لە فەلسەفەی قانوون دا وەرگرت، بەڵام مومارەسەی پیشەی قانونی نەکرد و لە ساڵی ١٩٠٨دا لە دایەرەی بیمەی کرێکاراندا بە فەرمانبەر دامەزرا. لە میانەی ئەو کارەوە توانی زۆر بە قوڵی لە بیرۆکراتییەت تێبگات. هەر لەو سەروبەندەدا پتر لە خەڵوەتدا نووسین و قەڵەمی دەجەڕباند. هەرچەندە کارەکەی ئەو لە دایەرەدا قورس و تاقەتپروکێن نەبوو بەڵام زۆر لێی بێزار بوو، بێزاری و نەفرەتی کافکا لە فەرمان و بیروکراتیەتی دام و دەزگاێن فەرمی بوو بوو بە جۆرە ترسێك و لە چیرۆکەکانیدا رەنگی دابووەوە. بە هەرحاڵ کافکا یەکێك بووە لەو کەسانەی ترسێکی گەورەی لە دڵ و ڕۆح دا هەبووەو نەیتوانیوە لەم دنیایەدا بوونی خۆی بسەلمێنێ و ئەمە بووە بە مۆرکی هەموو کارەکانی . نووسینی زۆر بووە بەڵام ویڕای ئەوەی بەدڵی ئەو هاوڕێیانەی بوون کە بۆی دەخوێندنەوە، بڵاوی نەدەکردنەوە. هەرچەندە چەند جارێك داخوازی ژنی کردووە بەڵام نەیتوانیوە ژن بهێنێ. لە ساڵی ١٩١٧دا و بە گەنجی تووشی نەخۆشی سیل بووەو دەستی لە کارەکەی هەڵگرتووەو وەکو ئەوەی هەستی بە نزیکبوونەوەی مەرگی خۆی کردبێ وەسێتی بۆ ماکس برود کردووە کە هەموو بەرهەمەکانی بسووتێنێ و لە نێویان ببات. هەڵبەتە ماکس برود بە وەسێتەکەی کافکای نەکرد و بەرهەمە بڵاوکراوەکانی کە زۆربەی بەرهەمەکانی کافکا بوون، بڵاو کردەوە لەوانە: دادگا-١٩٢٥، قەڵا-١٩٢٦، ئەمریکا ئەم کارانە جیهان و دەسەڵاتێکی خەیاڵییان گرتۆتە خۆ کە قارەمان لەوێندەردا بە هەزارو یەك کۆت و زنجیر گیرۆدەیەو چ ئومێدێکی نییە، بۆیە لەو بەرهەمانەدا ئومێد و گەشبینی بەلای مرۆڤەوە چ مانایەکیان نییە. بۆیە لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا، بێ دەسەڵاتی، هەست کردن بە گوناح، و بەزین زاڵە، لە چیرۆکی (پزیشکی گوند)دا خوێنەر وا هەست دەکات بەنێو چڕە خەونێکدا رەتدەبێ، چونکە تەنیا لێرەو لەوێ وێنەو گۆڕانی خەونەکە بواری دۆزینەوەی مانایەکی بابەتی بۆ رووداوەکان فەراهەم دەکات. کەسایەتی و حاڵەت و هەڵس و کەوت و کارو کردەوەکان بە ئەندازەیەك رەمزین کە هێڵی جیاکەرەوە یان سنوورێك لە نێوان دەق و رەمزدا نامێنێ. ئەم چیرۆکە گێڕانەوەی رەمزیانەی بارودۆخی ئەگزیستانسیالیستی کلاسیکە. پزیشکەکە هاوار

دەكات: "هیچ رێگەیەك نابینم" ئەم قسەیەی ئەو دەنگدانەوەی قسەی فەیلەسوفانی قەیرانە لە كیرككگاردەوە تا سارتەر.

كافكا وێنەیەكی زیندووی ترسی دەروونی خۆی لە نامە بەناوبانگەكەیدا ١٩٤٩ بۆ بابی دەربڕیوە. ئەم نامەیە بەڵگەیەكە بۆ ئەو نائەقڵانیەتە باوەی ماڵی بابی كە دەبوایە تەحەمولی بكات. هەر بۆیە رەمزییەت كە ئاماژەیە بۆ كول و كۆڤان و جەخاری مرۆڤ لە جیهانی نائەقلانی دەوڵەتانی پۆلیسی و سەركوتكاردا، بووە بە چەكی هونەری دەستی كافكا بۆ بەرەڤانی لە مرۆڤ و دۆزی مرۆڤ و ئازادی مرۆڤ كە پێم وایە بابەتی هەرە سەرەكی ئەدەب و دەقی ئەدەبییە.

## ٨٠- سیرڤانتس

١٥٤٧-١٦١٦

(میگل دو سیرڤانتس)ی شاعیر و نمایشنامەنووسی ئەسپانیایی لە ساڵی ١٥٤٧دا لەو وڵاتە هاتۆتە دنیا. بابی دکتۆرێکی گەڕۆك بوو هەمیشە دەگەڵ میگلی چکۆلەدا بەدوای کارو کاسبی دا ئەم شار و ئەو شاری دەکرد. دوور نییە ئەم سەفەر و گەڕانانە پاشان زەینیان پڕ کردبێ و تەیاریان کردبێ بۆ نووسینی بەرهەمە هەرە بەناوبانگەکەی (دونکیشوت).

میگل قوتابخانەی تەواو نەکرد، لە لاویدا بوو بە سەربازو لە هێزی دەریاییدا کەوتە کار. تا لە سەفەرێکی دا کەوتە کەمینی دزانی دەریایی عەرەبەوەو بە دیلی گیرا و وەکو کۆیلەیەك فرۆشتیان. ماوەیەکی زۆر بە یەخسیری مایەوەو چەند جارێك هەوڵی هەڵاتنی دا بەڵام بێهودە بوو ئەوەبوو خانەوادەکەی بە پارە کڕییانەوەو ئازادیان کرد.

میگل دووبارە درێژەی بە خزمەتی سەربازی دایەوەو بەدەم خزمەتی سەربازییەوە کەوتە شیعر هەڵبەستن، بەڵام شیعرەکانی باش نەبوون، بە کورتی هەوڵە ئەدەبییەکانی چ وەکو شیعر و چ وەکو نمایشنامە سەرکەوتوو نەبوون.

میگل کەسێکی هەژارو دەستکورت و قەرزار بوو. بەهۆی قەرزارییەوە خرایە زندانەوەو لە ساڵی ١٦٠٣دا لە زیندان دەرچوو، بەشی یەکەمی رۆمانە بەنێوبانگەکەی لە زیندانندا نووسی و لە ساڵی ١٦٠٥دا بڵاوی کردەوە. هەر لەو ساڵەدا، واتە لە ساڵی چاپ و بڵاو بوونەوەی رۆمانەکەیدا، جارێکی دیکە گیرایەوە. (دونکیشۆت) زۆر بە زوویی لە ئەسپانیادا شۆرەتی پەیدا کرد، پاشان لە ساڵی ١٦١٥دا بەشی دووەمی بڵاو کردەوە.

بە هەرحاڵ بڵاو بوونەوەی دوو بەرگەکەی دونکیشۆت شۆرەت و خۆشەویستییەکی یەجگار زۆری بۆ ئەم پیرە سەربازە پەیدا کرد، و تا سەر مۆخ لەزەتی شۆرەتی چەشت و ئیدی بە هەژاری و دەستکورتی لە ١٦١٦/٤/٢٣ کۆچی دوایی کرد.

دونکیشۆت یەکێکە لە رۆمانە بەناوبانگەکانی رۆمانێن کلاسیکی جیهان کە بۆ پتر لە (سی ٣٠) زمانی زندووی دنیا بەرچڤە کراو زۆر کەڕەت کراوە بە فیلمی سینەمایی و بە ئەڵقەو زنجیرە لە تەلەفزیۆنان دا پێشکەش کراوەو تەنانەت زۆر فیلمی کارتۆنی لێ ئامادە کراوە.

ئەمە جگە لەوەی کراوە بە نمایشنامەو هونەرمەندانی ناوداری جیهانی بەشدارییان تێدا کردووە. دەربارەی دونکیشۆت گوتراوە: "منداڵان حەزی لێدەکەن، لاوان دەیخوێننەوە، پیاوان تێیدەگەن، و پیران ستایشی دەکەن.".

## ٨١- هانس كريستين ئاندرسۆن

١٨٠٥-١٨٧٥

ئاندرسۆن یەكێك بوو لەو گەورە چیرۆكنووسانەی كە لە نێوان ساڵانی ١٨٣٥-١٨٧٢ جوانترین چیرۆكی بۆ منداڵان و بۆ لاوان نووسیوە. لە ساڵی ١٨٠٥دا لە دانیمارك لەدایك بووە. باوكی پێڵاوسازێكی هەژار بوو، تەنیا نەداری و كڵۆڵی و كوێرەوەری بۆ كوڕەكەی بەجێهێشت. پاش مەرگی زووەكی بابی، ئاندرسون دەستی لە خوێندن هەڵگرت و لە كۆبنهاگن دا كەوتە گەڕان بەدووی كاردا.

ئاندرسون لە پاڵ ئەو كارە بیٚ بایەخەدا كە لە یەكێك لە تیاترۆكانی ئەو شارەدا بەدەستی هێنابوو كەوتە خوێندن لە زانكۆدا و پاش ماوەیەك یەكەمین كۆمەڵە هۆنراوەی خۆی بڵاو كردەوە. دوای ئەوە كەوتە سەفەر و گەڕان بە وڵاتانی ئەوروپادا و ئەنجام یەكەمین كۆمەڵە چیرۆكی خۆی بە نێوی حیكایەتی پەرییان بڵاو كردەوە. ئاندرسون لەم حیكایەتانەدا، كە زیاتر زادەو هەڵقوڵاوی كوێرەوەرییەكانی خودی خۆی بوون، ئەو حەقیقەتانەی خستە روو كە بوونە مایەی سەرنجی هەموو منداڵانی جیهان. ئاندرسون، لە چیرۆكی (بێچوە مراوی كرێت)دا هەندیٚ گۆشەو كەناری ژیانی خۆی وێنە گرتووەو خۆی كە هەمان بێچوە مراوییە كرێتەكە بوو، بە خەڵكی جیهاند ناساند. ئەم چیرۆكە رەمزی واقیعی منداڵیی ئەو بوو كە لە ماوەیەكی كەمدا شۆرەتی جیهانی پەیدا كرد.

ئاندرسون بە زەبری گێڕانەوەی هونەریانەی حیكایەتێن میللی پیٚ لەسەر مانا ئەخلاقی و رەمزی و تراجیدییەكان دادەگریٚ.

ئاندرسون لە چیرۆكی (پینەدۆز و جنیان)دا یادی سەربوری بابە بەلەنگازەكەی دەكاتەوە كە خۆزیاری دەخواست جنیان بێنە كۆمەكی و پێڵاوی بۆ دروست بكەن تا ئەو لە كوێرەوەری و بەدبەختی رزگار بیٚ و تامی خۆشی و ئاسایش و ئاسودەیی بچەژیٚ.

هانس كریستین ئاندرسون، ئەمڕۆكە لە سەرانسەری دنیادا مەنشورەو كتێبەكانی بۆ هەموو زمانە زندووەكانی جیهان وەرگێڕدراون، زۆرجاران فیلمی سینەمایی و نمایشی تەلەفزیۆنیان لیٚ ئامادە كراوە. ئاندرسون لە ساڵی ١٨٧٥دا و لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا لە دانیمارك كۆچی دوایی كرد.

## ٨٢- دۆرۆتی پارکەر

## ١٨٩٣-١٩٦٧

ئەدیبێکی ئەمریکی یە لە بوارەکانی شیعر، و چیرۆکی کورت، و رەخنەی ئەدەبی و هونەری، و شانۆنامەدا خۆی تاقیکردۆتەوەو قەڵەمی تاوداوە. باوەڕی وابوو کە تەنز و سەتیر کاریگەرترین چەکی دەستی ئەدیبە بۆ راست کردنەوەی ئەو کەچڕەوی و لادانانەی هزرو بیری مرۆڤانی تووشی دەبێت. هەرچەندە باوەڕی وابوو کە ریفۆرمی کۆمەڵایەتی تەقلیدی ئەرکی هونەر نییە. بەڵام بەربەرەکانی بیر تەنگی و زوڵم و زۆری بە ئەرکێکی گرنگی سەرشانی هونەرمەند دەزانی. لەم رووەوە درێغی نەکردوەو چاوپۆشی لە هیچ غەفڵەتێکی فیکری یان هونەری ئەدیبان نەکردوەو زۆر جاران هێندە بە توندی رەخنەی گرتووە کە ناکۆکی و دژمنایەتی بۆخۆی ناوەتەوە، بەتایبەتی لەو ماوەیەدا کە لە گۆڤاری (بازاڕی غرور)دا، لە ساڵانی ١٩١٧-١٩٢٠دا وەکو نووسەر (محرر) کاری کردووە. پارکەر بەتایبەتی لە واری رەخنەدا خاتری کەسی نەگرتووە، هەمیشە لە روانگەی خۆیەوە روانیویەتیٚ کۆمەڵگە نەك لە روانگەی خەڵکانی دیکەوە.

دۆرۆپی پارکەر لە نیوجیرسی لەدایك بووە، پاش ئەوەی چەند قۆناغێکی خوێندنی بڕیوە، ئیدی کەوتۆتە نووسینی هۆزانێن بۆنە. وەکو پیانۆژەن لە قوتابخانەیەکی فێرکردنی رەقس و سەمادا کاری کردووە، ئەوجا لە گۆڤارێکی جل و بەرگاندا بە نووسەر دامەزراوە، چونکە مانشێتی سەرنج راکێشی دەنووسی و تەعلیقاتی جوانی دەربارەی وێنەکان و دیمەنەکان دەنووسی. بەڵام ژیانی ئەدەبی راستەقینەی ئەم ئافرەتە لە ساڵی ١٩١٧وە دەستی پێکرد، لەو ساڵەدا وەکو رەخنەگری شانۆیی لە گۆڤاری (بازاڕی غروردا) دەست بەکار بوو، بەڵام گۆڤاری نێوبراو لە ساڵی ١٩٢٠دا جوابی کرد، چونکە زۆر بە توندی هێرشی دەکردە سەر ئەو شانۆنامە بازاڕیانەی کە لەو سەردەمەدا نمایش دەکران. جاکە خاوەنانی گۆڤارەکە دیتیان رێبەرانی بزاڤی شانۆیی دژایەتی دەکەن و ئەمە کار لە بڵاوکردنەوەی گۆڤارەکە دەکات، هیچ چارێکیان نەما جگە لە جواو کردنی دۆرۆپی پارکەر.

پارکەر، چووە گۆڤاری (نیویورکر) و سەرپەرشتیاری کاروباری شانۆیی و عەرزی کتێبانی تازەی لە ئەستۆ گرت. هەڵبەتە پارکەر دەستبەرداری نەفسی هێرشکارانەی خۆی نەبوو، لە مەسەلەی هەق دا نە خاتری کەسی نەدەگرت و نە لە لۆمەو گازاندەی

کەس دەترسا. بە تێپەڕبوونی ڕۆژان شۆرەتێکی زۆری لە نێو جەماوەری خوێنەراندا پەیدا کرد و خوێنەران گەیینە ئەو قەناعەتەی کە پارکەر گوزارشت لەوان دەکات و هەمان هەڵوێستی ئەوان دەربارەی کارە ئەدەبییە توڕەهاتەکان دەنوێنێ. ئەم ئافرەتە زۆر دلێرانە بەرگری لەو دۆزە فیکریانە دەکرد کە باوەڕی پێیان هەبوو، ئەو جورئەتەی لەودا هەبوو لە کەم پیاوی سەردەمی ئەودا بەدی دەکرا. بۆیە خەڵکی بەتاسەوە گوتارە ڕەخنەوانییەکانیان دەقۆستەوە، هەر ئەمەش کردیە کارێك کە هەم شیعرەکانی و هەم کورتە چیرۆکەکانی شۆرەت پەیدا بکەن و خوێنەر تاقیبیان بکات.

دۆرۆپی پارکەر بەرهەمی زۆرە، یەکێك لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی دیوانە شیعرییەکەیەتی بەنێوی (کندرێکی درێژ-١٩٢٦)، دیوانی دووەمی بەناوی (تۆپی ئێواری-١٩٢٨)، کۆمەڵە چیرۆکێکی کورت بەنێوی (شیوەنی زیندوان-١٩٣٠)، دیوانی (دیوانی مەرگ و باجان-١٩٣١) و کۆمەڵە چیرۆکێکی دیکە بەناوی (ئەودیوی لەزەتان-١٩٣٣). لە ساڵی ١٩٣٦دا هەموو شیعرەکانی لە یەك دیواندا کۆکردەوە بەناوی (نەقووڵ وەکوبیر). هەروەها لە ساڵی ١٩٣٩دا هەموو چیرۆکەکانی لە کتێبێکدا چاپ کرد بە ناوی (ئەم درۆیانە).

بەهەرحاڵ ئەم ئافرەتە بەوپەڕی بوێرییەوە خۆی بە دنیای هونەردا کرد و کەرەستە هونەرییەکانی خۆی لە قەبێڵی جیهانێکی باشتر و ئایندەیەکی جوانتر کرد.

## ٨٣- ئەمیل زولا

١٨٤٠-١٩٠٢

ناوی ئەم رۆماننووسە فەرەنسییە بەندە بە قوتابخانەی سروشتییەوە لە بواری ئەدەب دا. لە ساڵی ١٨٤٠دا لە پاریس لەدایك بووە، باوکی ئیتاڵی و دایکی فەرەنسی بوو. زۆربەی تەمەنی منداڵی خۆی لە ئەپکس-ی نزیکی مەرسیلیا، کە مەیدانی چیرۆکەکانیەتی، بەسەر بردووە. نەیتوانی تاقیکردنەوەکانی دواناوەندی تەواو بکات و دوو ساڵی پڕ لە کلۆڵی لە گەڕەکی لاتینی دا بێ ئەوەی بایی پولێك کار بکات، بەسەر برد. پاشان لە رێگەی هاوڕێیەکییەوە چووە لای بلاَوکەرەوەیەك- ئامادەکردنی کتێبان بۆ بارکردن و هەناردن.

لە رووی زەوقی ئەدەبییەوە لە رۆمانسییەکانی وەك روسۆ، هوگۆ، موسی، لامارتین-ەوە نزیك بوو.

هەوەڵجار بە شیعری رۆمانسی دەستی پێکرد. بەڵام شیعرەکانی لاواز بوون. پاشان ئاشنایەتی لەگەڵ بەلزاك و فلوبیردا پەیدا کرد. لە ساڵی ١٨٦٤دا (کۆمەڵە حیکایەتێك بۆ فینون)ی بلاَو کردەوەو سەرنجی رەخنەگرانی راکێشا. ئیدی دەستی کرایەوەو کەوتە نووسینی ووتاران و پێداچوونەوەی کتێبان. بەرە بەرە قەناعەتی بە ریالزم هێنا، وادیارە ریالزم وەکو پێویست تینوێتی ئەوەی نەدەشکاند، بۆیە رووی کردە رێباز و قوتابخانەی تەبیعی و راوبۆچوونەکانی خۆی دەربارەی قوتابخانەی نێوبراو لە پێشەکی کتێبی (میراتی روگونز-١٨٧١) و لە (رۆمانی ئەزموونگەری-١٨٧٠)دا نووسیوەو تۆمار کردووە. بەلای زولاوە رۆمان دەبێ رەنگدانەوەی رێچکەی باس و سەرنجان بێ وەکو چۆن لە تاقیگەدا ئەمە ئەنجام دەدرێ. کاراکتەران دەبێ بە جۆرێ دروست بکرێن کە لەگەڵ زانستێن دەرونزانی و کۆمەڵناسی و یاساکانی ویراسەدا بگونجێن. قارەمان و کاراکتەرەکان دەبێ لە ژینگەیەکی بەرجەستەداو زۆر بە وردی دابنرێن، لە ژینگەیەك دا کە سەرەتای کات و شوێن دیار بێ، رەفتاری قارەمانان بەرجەستە بێ. واتە قارەمان و ژینگە بە شێوەیەکی سرووشتی ئاوێتەی یەکتر بن. رۆمان راڤەو لێکدانەوەی سەرچاوەو پەرەسەندنی فاکتەرە ماددی و دەرونییەکانە، شیکردنەوەی کۆمەڵگەی هاوچەرخی فەرەنسایە. بەلا زولاوە جیهانی رۆمانی تەبیعی جیهانێکی میکانیکی و ماددییە، دەبێ خەیاڵ و خودگەرایی و ناسازی شەخسی لە پرۆسەی داهێنان وەدەر بنرێ. هەڵبەتە تێۆرییەکانی

قوتابخانەی تەبیعی وەکو تیۆریانی هەر قوتابخانەیەکی دیکەی ئەدەبی زیاتر فاکتەر و پێشنیازن تا پرەنسیپانی رەها.
بەهەرحاڵ با واز لە بۆچوونە تیۆرییەکانی بێنین و بێینە سەر رۆمانەکانی. لە سالانی ١٨٥٢-١٨٧٠دا زنجیرە رۆمانێکی نووسی کە بریتییە لە پەیگیری و بەدووداچوونی "مێژووی کۆمەڵایەتی و سروشتی ماڵباتێك لە قۆناغی ئیمپراتۆریەتی دووەم دا" هەر بەشێك لەم زنجیرەیە تایبەتە بە چەند کەسێکی ئەو ماڵباتەوە. جا ئەم زنجیرەیە کاریگەری ویراسەی لەسەر ئەو قارەمانانەو هەروەها مێژووی سایکولوژی و سوسیولۆجی سەردەمێکی تەواوی کەشف کردووە. ئەم زنجیرەیە، زنجیرەی (روگون ماکوار)ی بەناوبانگەو گەییە بیست بەشێك و زۆر نموونەی لەخۆ گرتووە لەوانە: وەرزێر، کرێکاری کانان، کرێکاری شاری، زانا، سۆزانی، هونەرمەند، دەوڵەتمەدار و جل شۆری مالان..هتد یانی هەموو ئاست و توێژە کۆمەلایەتییەکانی ناو پاریس و دەڤەرەکانی دەورو بەری.
خوێنەر دەکارێت لە رێگەی خوێندنەوەی بەشی یەکەم و بەشی کۆتاییەوە بیرۆکەیەکی تەواو دەربارەی رەگەزی ویراسەی سایکۆلۆژی هەڵێنجێ. (سامانی روگون-١٨٧١)، (باسکالی پزیشك-١٨٩٣). بەشی یەکەم بناغە بۆ هەموو بەشەکانی دیکە دادەنێ. (باسکالی پزیشك) زاناو کەسایەتییەکی سەرەکییە لە کاری دووەمدا و مێژووی دۆزێکی پزیشکەوانی ئەندامانی ماڵباتێکی ناودار دەخاتە روو. جا ئەگەر خوێنەرێك بیەوێ ئاشنایەتییەك لەمەڕ جیهانی سۆزانییەت پەیدا بکات ئەوا دەتوانێ (مەیخانە-١٨٧٧) و (نانا ١٨٨٠) بخوێنێتەوە. (مەیخانە) یەکەم سەرکەوتنی زولایە و لێکۆڵینەوەیەکی چاکە دەربارەی ئالودەبوون بەمەی. (نانا) بەسەرهاتی سوزانییەکی جوانی گەوجی خۆسەرە. (زەڕنگەر-١٨٨٥) گێروگرفتی کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگەی کرێکارانی کانانی لەخۆ گرتووە. (زەوی-١٨٨٧) وێنەیەکی تاڵی جوتیارانی پیسکەی فەرەنسی دەخاتە روو.
(هەرەس-١٨٩٢) کەشفکردنی، داڕوخانی خەڵکی و گەندەڵی حکوومەتە لەسەردەمی جەنگی فەرەنسی- بروسی دا.
زۆلا لە ساڵی ١٨٨٠دا بە شەریکی لەگەڵ موباسان و نووسەرانی دیکەی سەر بە قوتابخانەی تەبیعی کۆمەڵە چیرۆکێکی بەناوی (امسیات ڤی میدان)ی بلاوکردەوە. هەروەها دوو زنجیرەی دیکەی دەربارەی ئەم شارانە نووسی: (لوردیس-١٨٩٤.

رۆما-١٨٩٦، پاريس-١٨٩٨.) هەروەها زنجيرەيەكى چوار بەشى نووسى كە زنجيرەى چوارەمى تەواو نەكرد.
دەورێكى يەجگار گەورەى لە (مەسەلەى دريفوس)دا دابينى و هێندە راستگۆيانە بەرەڤانى لە (دريفوس و عەدالەت) كردووە كە ئەناتول لەو رووەوە دەڵێت بەرگرى زۆلا "ساتێكە لە ويژدانى تيرەى بەشەردا". كە لە ساڵى ١٩٠٠دا دريفوس عەفوكرا، زۆلا تا رادەيەك بە قارەمانى نەتەوەيى دەژمێردرا. بەڵام فريا نەكەوت بە چاوى خۆى راگەياندنى فەرمى بێ تاوانى دريفوس بدينى و لەو خيانەتە تەبرێ بكرێ كە درابووە پاڵى "پاڵ دريفوس".
كاتێ لە رۆمانى تەبيعييەوە چووە سەر رۆمانى سايكولوژى، ئەمە بووە هۆى كەم بوونەوەى ناوبانگ و شۆرەتى. بەڵام وەكو خاوەن رێچكەى تايبەتى كارى كردۆتە سەر بەرهەمى گەلێك لە رۆماننووسە تەبيعييەكانى ئەمريكا، لەوانە: دريزر، و فرانك نوريس.

## ٨٤- گارسیا لۆرکا

١٨٩٩-١٩٣٦

لۆرکا شاعیر و شانۆنامەنووسێکی نێوداری ئەسپانییە. هەر بە گەنجی و لە قۆناغی خوێندنی زانکۆدا خۆی لە زۆر بواری ئەدەبی و هونەری داوە لەوانە: شیعر، مۆسیقا، وێنەو نیگارکێشی. لە ساڵی ١٩٢١دا یەکەم دیوانی بە ناوی (هۆزانان) چاپ و بڵاوکردەوە، لە ساڵی ١٩٢٧دا دیوانە شیعرێکی دیکەی بەناوی (سترانان) بڵاو کردەوەو ئیدی لە ڕێگەی ئەو دیوانانەوە شۆرەت و نێوبانگی پەیدا کرد. لە ساڵی ١٩٢٨دا هەندێ لە جوانترین شیعرەکانی خۆی بەناوی (سترانێن یەکەم قەرەج)وە چاپ و بڵاو کردەوە. لە ساڵانی ١٩٢٩-١٩٣٠دا چوو بۆ ئەمریکا و کەوتە ژێر کاریگەری نیگارکێشی سوریالی سلفادۆر دالی و قوتابخانەکەی دالییەوە. جا ئەم ئەزموونە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ لە ساڵی ١٩٤٠دا لە دیوانی (شاعیرێك لە نیویۆرك)ەوە تۆمار کراوە. دیارە شیعرەکانی ئەم سەردەمەی شیعری باش نین، چونکە دەکەونە دەرێی بازنەی جیهانی خۆیەوە. جیهانی ئەو زیاتر شیعی میللی ئەندەلوسی و مۆسیقاو ڕۆمانسییەتی ئەسپانی بوو، و گۆرانی قەرەجانە سەرچاوەی سروش و ئیلهام و فاکتەری سەرکەوتنی بوو. باشترین چامەی لورکا شیننامەیەکە بۆ برادەرێکی خۆی بەناوی (گابازێکی ناودار-١٩٣٥).

پاش گەڕانەوەی لە ئەمریکا، بوو بە یاریدەدەری بەڕێوەبەری تیپێکی شانۆیی ئەکادیمی گەرۆك لە ئەسپانیا، ئەم تیپە هەم شانۆنامەکانی ئەوو هەم شانۆنامەی خەڵکانی دی پێشکەش دەکرد. ئەم تیپە لە ساڵی ١٩٣٣دا زۆر بە گەرمی لە ئەمریکای باشووردا پێشوازی کرا. لورکا گەڕایەوە بۆ ئەسپانیاو لە مەدرید جێگیر بوو و خۆی بۆ شانۆ تەرخان کرد. بارودۆخ بەرەو گرژی و هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ دەچوو. لە ئابی ١٩٣٦دا لە غەرناتە گیرا، تاقمە فاشیستێك تەقەیان لێکرد، و لە ژێر پەردەی شەڕی ناوخۆداکوژرا.

شانۆنامەکانی سەرەتای زیاتر کۆمیدیای خەیاڵی بوون و بە شێوەیەکی سووك و ئاسان نووسرابوون و هەندێکیان لە کەلەپووری شانۆی بو کەڵەبازییەوە هەڵێنجرابوون و هەندێکی تریان لە هونەری کۆمیدییەوە وەرگیرابوون. باشترینیان بریتییە لە: (ژنە سەیرەکەی پینەدۆز) باسی ناکامی ئەشق و ئاشقێنی دەکات. (زەماوەندی خوێن-١٩٣٣)، (یرما-١٩٣٤)، (ماڵی برنار ئەلبا-١٩٣٥).

هونـەری لورکـا یـان سەرچـاوەی لورکـا پـتر فۆلکلۆرییـە و بەنەفـەس و هەناسـەیەکی تەژی راستگۆیی داڕێژراونەتەوەو شەقڵی خۆی پێ بەخشیوون. زۆربـەی چامەکانی بەر لـە بڵاوبوونـەوەیان بەسـەر زاری خەڵکییـەوە بوون و بـاوبوون. ئەگـەر چی ڕەگ و ریشەی شیعرەکانی دەچنەوە سـەر سەرچاوەی جیاواز و هەمـەجۆر، بـەڵام سـنووری تاکـە کەسـی و نەتـەوەییان بەزانـدووەو دەرگـای جیهانییـەتیان کردۆتـەوەو چوونەتە قوڵاییە پەنهانەکانی ژیانی مرۆڤەوە تا هونەریانە کەشفیان بکەن.

## ٨٥- میخائیل ئەلکساندار شولوخۆف

-١٩٠٥

شولوخۆف یەکێك بوو لە نووسەرە هاوچەرخەکانی یەکێتی سۆفیەت و ئەندامی کۆڕی زانیاری مۆسکۆ بوو. لە ١٩٠٥/٥/٢٤دا لە گوندی کروژ بلین، لە خانەوادەیەکی چینی وردە بورژوا لەدایك بووە.

میخائیل تا تەمەنی ١٣ ساڵی لە قوتابخانەی (ژیمنان) خوێندویەتی، لە ساڵی ١٩٢٠دا لە شەڕەکانی ناوخۆدا شان بەشانی سوپای سور جەنگاوە و ئەم شەڕانە تا ساڵی ١٩٢٢ خایاند، پاش ساڵێك میخائیل شولوخوف چوو بۆ مۆسکۆ. لەم قۆناغەدا گۆڕانێکی گەورە بەسەر ژیانیدا هات و یەکەم هەنگاوی لە بواری تاقیکردنەوەی بەهرەو زەوقی ئەدەبی خۆیدا نا.

یەکەمین کۆ کورتە چیرۆکی خۆی بەناونیشانی (چەند چیرۆکێك لە دن-ەوە) لە ساڵی ١٩٢٣دا بەچاپ گەیاند. ئەم چیرۆکانە بە شێوەیەکی شایستە رەنگدانەوەی پەیوەندییەکانی مرۆڤی بە سروشتەوە بەرجەستە کردووە. لە ساڵی ١٩٢٤دا چیرۆکی تاقی کردنەوەکانی ئەو چاپ و بڵاو بووەوە کە دەکرێ بگوترێ هەموو چالاکییەکانی ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٤ی میخائیل شولۆخۆڤ گرتبووە خۆ، بەڵام ئەم کارە شۆرەتێکی ئەوتۆی پێ نەبەخشی، و ناچار بوو بۆ قەتاندنی ژیان و گوزەران شان بداتە بەر کاری دژوارو قورس، واتە عەمەلەیی و حەماڵی، پاشان کاری ئەرشیفکاری بۆخۆی هەڵبژارد.

شولوخۆف عاشق و شەیدای کاری ئەدەبی بوو و هیچ کارێك لەگەڵ تەبع و زەوقی ئەدەبی ئەودا نەدەگونجاو ژیانی پڕ هەراو هەنگامەو قەرەباڵغی ئەو زەمانەی پایتەخت لەگەڵ کارەکەی ئەودا نەدەگونجا.

رۆمانی (دنی ئارام) شاکاری شولوخۆفە. بەڵکو بێ چەند و چون باشترین بەرهەمی ئەدەبیاتی ریالزمی سوسیالستییە. شولوخۆف باشترین قۆناغی ژیانی خۆی لەسەر ئەم رۆمانە دانا، لە لاویدا دەستی بە نووسینی کرد و لە ساڵی ١٩٢٧دا کە تەمەنی ٢٢ ساڵان بوو بەرگی یەکەمی تەواو کرد، لە ساڵی ١٩٢٩دا بەرگی دووەم و لە ساڵی ١٩٣١دا بەرگی سێیەم و ئەنجام لە ساڵی ١٩٤٠دا بەرگی چوارەمی رۆمانی نێوبراوی تەواو کرد، واتە یازدە ساڵی تەواو کاری تیا کردووە.

شولوخۆف جگە لە سەفەری ئەمریکا، سەفەری وولاتانی ئینگلیستان و دانیمارك و ئەڵمانیاو وولاتانی ئەسکەندەناڤی کردووە.

ناووناوبانگی شولوخۆف هەر زوو سنووری سۆڤیەتی بەزاندووەو بووە بە ناوێکی جیهانگیر. کۆی بەرهەمەکانی تا ساڵی ١٩٥٧ پێنج سەد و پەنجاوشەش کەڕەت بە ٧٣ زمانی میللەتانی سایەی سۆڤیەت و دەرێی سۆڤیەت چاپ و بڵاو بووەتەوە.

(چارەنووسی ئادەمیزادێك) کە چیرۆکێکی درێژە، یان رۆمانێکی کورتە، پاش چاپ و بڵاو بوونەوەی وەکو بەرهەمێکی شایستەو زیندووی جیهانی چیرۆکڤانی کە باسی مرۆڤدۆستی دەکات، پێشوازییەکی فرەو گەرمی لێکراو تەرجەمەی چەندین زمانی جیاواز کراو پاشان کرا بە فیلم و لە فستیڤاڵی مۆسکۆدا خەڵاتی یەکەمی بردەوە.

## ٨٦- چرنیشفسکی

١٨٢٨-١٨٨٩

نیکـۆلای گـاڤریلوڤیچ، لـه دوای بیلینسـکی بـه گـەورەترین رەخنـەگری روسـیا دەژمێردرێت، جگە لەوەی رۆماننووس بووه، دەستی باڵاشی لە فەلسەفەو ئابوریدا هەبووه، بە هۆی بۆچوون و هزرو بیره شۆڕشگێڕییەکانییەوه ناوی (روپسپیری روسیا)یان لێنابوو. چرنیشفسکی کوڕه کەشیش بوو لە سەرەتادا خوێندنگەی ئاینی ساراتوف-ی بڕی و دوای ئەوه خوێندنی لە کۆلیجی مێژوو و زمانناسی زانستگەی پترزبۆرگ تەواو کرد. یەکەم کارێ کە کردی ئەوه بوو کە لە ساڵی ١٨٥١-١٨٥٣ لە قوتابخانەی ئامادەیی ساراتۆف مامۆستایەتی کرد و دەرسی گوتەوه. پاشان نەقڵی پترزبۆرگ بوو و لە قۆناغی دووەمی خوێندنی فێرگەی سوپاییدا کەوتە دەرس گوتنەوه.

لەم قۆناغەدا چرنیشفسکی یەکەمجار لە گۆڤاری (یاداشتەکانی نیشتمان) و پاشان لە گۆڤاری (هاوچەرخ)دا کۆمەڵێك وتاری ئابوری و مێژوویی و ئەدەبی بڵاو کردەوه. پاش ماوەیەکی کورت و لە ساڵی ١٨٥٤دا بەڕێوەبردنی گۆڤاری (هاوچەرخ)ی لە ئەستۆ گرت. لەو سەروبەندەدا پیاوانی نوێخواز و پێشڕەوانی بیری روسی لەم گۆڤارەدا بەشدارییان دەکرد و وێڕای ئەوەی دەوڵەتی تزاری زۆر بە توندی نێوەرۆکی گۆڤاری نێوبراوی سانسۆر دەکرد بەڵام وتارێن توندی تێدا بڵاو دەبووەوەو هەندێ لە نووسەرانی گۆڤارەکە بانگەوازیان بۆ بنەماکانی سوسیالزم دەکرد و داوای ئازادی کۆیلە زێرخڕییەکانی لادێیان دەکرد.

لە ساڵی ١٨٤٨دا شۆڕشی فەرەنسا روویدا تۆزێ دوای ئەوه گوندییانی روسیا، بەر لە ریفۆرمەکانی ساڵی ١٨٦٠، جم و جۆڵێکیان کرد. ئەم روداوانە بە جۆرێ کاریان لە روح و گیانی چرنیشفسکی کرد کە لە بیرەوەرییە نهێنییەکانی خۆیدا ، ئەوانەی کە نەکەوتنە دەست مامورانی سانسۆر، نووسیویەتی: "عەیب لە شێوەی سیاسی رواڵەتی حکومەت نییە، بەڵکو عەیب لە بارودۆخی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندایە کە نابێ چینێك زوڵم و نەهەقی لە چینێکی دیکە بکات."

لە ساڵی ١٨٦٠دا راستەوخۆ بیروبۆچوونەکانی خۆی ئاشکرا کرد و هەواداری خۆی لە سوسیالزم نیشاندا. ریفۆرمەکانی ئەم ساڵە گۆڕانێکی ئەوتۆی لە حاڵی گوندییاندا دروست نەکرد. چرنیشفسکی لە ساڵی دواتردا بەیاننامەیەکی بێ ئیمزای بڵاو کردەوه و ئەوەی نیشاندا کە چۆن لەم کارەدا جوتیارانیان خاپاندووه.

دووزمان و ئاژاوەگێڕێك خەبەری دابوو كە چرنیشفسكی خودانی ئەو بەیاننامەیەیە، ئیدی رایانكێشایە دادگا، چونكە هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نەبوو ئیدی كۆمەڵێك بەڵگەی ساختەو شایەتی درۆیان بۆ داتاشی و لە ساڵی ١٨٦٤دا بە حەوت ساڵ نەفی و حەپس لەگەڵ كاری دژواردا حوكم دراو بۆ تاراوگەی سیبریا نێردرا.

پاش ئەوەی چرنیشفسكی قۆناغی نەفی كردنەكەی تەواو كرد ئەوجاش تا ساڵی ١٨٨٣ ڕێگەیان نەدایێ كە بگەڕێتەوە. دوای گەڕانەوە لە سیبریا، تا ماوەیەك لە حاجی تەرخان و پاشان لە ساراتۆف مایەوەو لەوێندەرەوە دەستی بە كارە هزرییەكانی خۆی كردەوەو تا ساڵی ١٨٨٩ كە مەرگ بەرۆكی گرت، لەسەر كاری خۆی بەردەوام بوو.

شاكارەكانی چرنیشفسكی بریتین لە: (بنەماكانی مرۆڤناسی لە فەلسەفە)دا، (دەربارەی سەردەمی گوگول) و (لسینگ) و (كێشمانەكێشەكانی حیزبەكانی فەرەنسا لە زەمانی لویسی هەژدەیەم و شارلی دەیەم)، (دەربارەی هۆیەكانی نەمانی ئیمپراتۆریەتی رۆم) و(دەسەڵاتی ژوئیە) كە مەبەستی حكومەتی لویس فلیپ–ە لە فەرەنسا.

یەكەمین بەرهەمی رەخنەوانی نایابی چرنیشفسكی كتێبێكە بە ناونیشانی (پەیوەندییەكانی ئەستاتیكی هونەر و حەقیقەت) چرنیشفسكی لەم بەرهەمەدا بنەماكانی هونەری شرۆڤە كردووەو پاشان ئەو بیروباوەڕە كۆنانەی كە لەو زەمانەدا باوی بووە، خستۆتە بەر رەخنەو هەر بەوەندەوە نەوەستاوە بەڵكو بنەماكانی مەتریالیزمی لەو باسانەدا بەكار بردووەو دەڵێت:"ریشەی دەرك كردنی جوانی لە واقیعی ژیاندایە". دەربارەی جوانیش دەڵێت "ئەوەی جوانە ژیانە".

لە واری رەخنەی ئەدەبی دا هەمان ڕێچكەی ریالیزمی بیلینسكی گرتۆتە بەرو بەرەو كەماڵی بردووە. چونكە سانسۆری تزاری بڵاو بوونەوەی بەرهەمە پڕ جورئەتەكانی قەدەغە دەكرد بۆیە كۆمەڵێك نامیلكەی بچووكی لە جنیف و سویسرا چاپ دەكرد و لەم نامیلكانەدا داوای هەڵوەشاندنەوەی نەمانی موڵكایەتی شەخسی و دام و دەزگای سوپایی و سیستەمی فیودالی دەكرد. دەربارەی دەسەڵاتی پاشایەتی باوەڕی وابوو كە دەكرێ بە شێوەیەكی كاتی بهێڵرێتەوە بەڵام دەبێ كاروباران بە دام و دەزگاێن دیموكراسی بسپێردرێن. ئەم نامیلكانە بوونە هۆی ئەوەی كە بۆ سیبریا نەفی بكرێت.

له تاراوگەدا رۆمانێکی بەناونیشانی (چ بکرێ؟) نووسی. ئەم بەرهەمە تا ماوەیەکی زۆر سەرمەشقی لاوانی شۆڕشگێڕ بووە. لایەنی ئەدەبی ئەم بەرهەمە بەهێز نییە بەڵام ئەو بیروبۆچوونانەی لەوێدا نیشاندراون ئەگەر لایەنی پراتیکیشی نەبێ ئەوا بەلای کەمەوە زۆر توند و دلێرانەیە. لەم کتێبەدا باوەڕی سوسیالستی و یەکسانیخوازی نووسەرانی فەرەنسا و ئاڵمان و ئینگلیستان شرۆڤە کراوەو بۆیە ئەگەر چرنیشفسکی بە دامەزرێنەری حاڵەتی روحی هزرڤانانی روسی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم نەزانرێ ئەوا بە بێگومان بە یەکێك لە بڵاوکەرانی ئەو باوەڕانە دەژمێردرێ.

رۆمانێکی تری هەیە بەناوی (پێشەکی) ئەم رۆمانە ئەو پێشەکییانەی لەخۆ گرتووە کە بەر لە ریفۆرمەکانی ساڵی ١٨٦٠دا روویداوە. لە چیرۆکەکانی چرنیشفسکی دا هەمیشە هەستی مرۆڤدۆستی خۆی دیارە. پاڵەوان یان قارەمانەکانی نموونەی بەرجەستەی ئاشقانی ئازادی و نیشتمانپەروەری و ئەمەکداری و خودان بەهای بەرزی مرۆڤانین. لە واری مەتریالیزم دا یەجگار شارەزا بوو، زۆر دژی پرەنسیپی (هونەر بۆ هونەر) بوو. ئەدەبیاتی بە جمکانەی ژیان دەزانی و باوەڕی وابوو کە نووسەر دەبێ مامۆستاو رێنوێنی کۆمەڵگە بێ، پێی وابوو کتێب کاتێ سودبەخش دەبێ کە کتێبی وانەی ژیان بێ. بە شێوەیەکی گشتی چرنیشفسکی لە ساڵی ١٨٥٠ بەم لاوە نەك هەر رێبەر و رێنوێنی فیکری ژینگەی خۆی بووە، بەڵکو گەلێك لە هزرڤانانی روسیا کە لە سەردەمانی دواتردا هاتوونەتە دنیاوەو بەرهەمیان لەپاش خۆ بەجێهێشتووە، پەروەردەی بیرو هەستەکانی ئەو بوونە.

## ٨٧- جۆرج برنادشۆ

١٨٥٦-١٩٥٠

یەکێك بوو لە نووسەرو رەخنەگرە دیارەکانی ئینگلیز، لە ساڵی ١٨٥٦دا، لە خێزانێکی پروتستانی مەزەبی بورژوازی لەدایك بووە. بەشدارییەکی زۆری لە بوژاندنەوەی ئەدەبی ئیرلەندیدا کردووە، پاشان چووە بۆ لەندەن، لەوێندەر شارەزایی لە لە بزاڤە ئەدەبی و کۆمەلایەتییەکانی بەریتانیا پەیدا کردووە ئاشنایەتی لەگەڵ پەیدا کردووە. لە لەندەن دا وەکو رەخنەگرێکی رۆژنامەوانی بوارێن مۆسیقا و شانۆ چالاکییەکی زۆری ئەنجام داوەو باشترین بەرهەمی نادرامی خۆی لەو ماوەیەدا نووسیوە. لەوانە: (جوهر الابسینیه ١٨٩١ و الفاغزیە الکاملە ١٨٩٨). بایەخێکی زۆری بە هزری جۆرج و کارمارکس و تێبوریزانانی دیکەی کۆمەلایەتی دەداو ئەمەش وایکرد پەیوەندی بە ریزی فابییەکانەوە. زۆر دڵبەندی ساموئیل بەتلەر و ئەپسن بوو.

لە شانۆنامەکانیدا زۆر بە راشکاوی و بێ گوێدان بە سەردەمەکەی رەخنەیەکی هزروانی پێشکەش دەکات، رەخنەکانی لە قاڵبێکی گاڵتەجاڕی خۆشدا دەردەبڕی. ئەم پیاوە بەتەبیعەت کەسێکی یاخی و درژ پەسند بوو، دژمنی سەرسەختی فیکری شێواو هەموو رواڵەتبازییەکی دەستکردبوو، چونکە دەیزانی چ ناکۆکییەك لە نێوان دابەباوەکانی ژیان و حەقیقەتە پەنهانەکانی پشت ئەو دابەباوانەوە هەیە. حەزیدەکرد رواڵەت و لاف و گەزافە بۆش و بەتاڵەکانی ئادەمیزاد کون بکات و دیواودەری بکات و ئازایەتی و بوێری و ئەقڵی بۆ ئادەمیزاد بگەڕێنێتەوە. بابەتی رەخنەکانی ئەم لایەنانەی لەخۆ گرتبوو: رواڵەتی ئاینی تەقلیدی و فەلسەفە لە (ئەندوکلیس و شێر ١٩١٢، گەڕانەوە بۆ میتوسیلا ١٩٢١) هەروەها هەڵوێستە کۆمەلایەتییەکان بەرامبەر بە پەیوەندییە سێکسییەکان لە (پیشەی خاتوو ڤارین ١٨٩٤، و کاندیدا ١٨٩٥، مرۆڤ و مرۆڤی نائاسایی ١٩٠٣). هەروەها قارەمانێتی سوپایی لە "مرۆڤ و چەك دا ١٨٩٤، قوتابی ئەهریمەن ١٨٩٧" هەروەها رەخنە لەکۆمەڵگەی پێشکەوتوو بیرۆکەی سەندریلا گرتووە لە "پیگمالیون دا ١٩١٢، لە (میجۆر باربەرەدا ١٩٠٥) رەخنە لە خێر و سەدەقە وەکو پیشەو خوو دەگرێت. بە هەرحاڵ برنادشۆ پیاوێکی درژ پەسند بوو، لە رێگەی بەرهەمەکانییەوە رەخنەی توندی دەگرت لە دیالۆگدا زۆر بەدەسەلات بوو، هەردوو رەگەزی درامی و کۆمیدی

ئاوێتــە دەکـرد.. دەبـیّ ئـەوەش بگـوتریّ کـە جـۆرە درێـژدادڕی و زۆر وێژییـەك لـە شـانۆنامەکانیدا بـەدی دەکـرا. لـە بـواری رەخنـەی کۆمەڵایـەتی و ئەدەبیـدا یـەجگار بەناوبانگ بوو. لە ساڵی ١٩٢٦دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت.

## ٨٨- تیوفیل گوتیه

١٨٧٢-١٨١١

شـاعیر و رۆژنامــەنووس و رۆماننووسـێکی فەرەنسـییە، مەشـقێکی زۆری کـرد بـۆ ئەوەی ببێ بە نیگارکێش. ئەم مەشقە کارێکی زۆری کردە سەر بەهرەی وەسف و وەسفکاری لەلای نێوبراو، کە وەسف زۆر بە دەوڵەمەندی لە نووسینەکانیدا دیارە. سەرەتای ژیانی ئەدەبی بە دوو دیوانە شیعر دەست پێکردووە کە بە شێوازێکی رۆمانسیانەی هێندە چڕ و توند نووسراون و مەگەر هەر لورد بایرون ئەمەی کردبێ. دوو دیوانەکەی لە ساڵانی ١٨٣٠و١٨٣٢دا بڵاو کردەوە، هیچیان تایبەتمەندییەکی زەقیان پێوە دیار نییە. یەکەم رۆمانی کە بەناوی (خامویین-١٨٣٥)ـە تا رۆژگاری ئێستاش دەخوێندرێتەوە چونکە کتێبەکە هەموو لایەنەکانی ئارەزووی سێکسی دەخاتە روو. لە پێشەکی ئەم رۆمانەدا هێرشێکی توند کراوەتە سەر نەزانی رۆژنامەنووسان و پێوەرە ئەخلاقییەکانی چینی بورژاوو پێوەرە هونەرییەکانی نەوکلاسیزم، و رەخنەگرەکان، هەر ئەمەش وایکرد کە ببێ بە شاکارێکی کلاسیکی سەردەمی خۆی.

گوتیە لە ماڵێکی خێزاندار بوو بۆیە دەبوایە ئەم رەشەخێزانە لە رێگەی رۆژنامەوانییەوە بژێنێ، هەر بۆیەش زۆربەی ژیانی لە بواری رۆژنامەوانی دا هەم وەکو نووسەر و هەم وەکو رەخنەگری بواری هونەرو شانۆ بەسەر برد. لە بواری چیرۆکێن سەفەرنامەدا کارێکی یەجگار زۆری سادەو ساکاری کردووە، کە بە مەزەندە سێ سەد بەرگ دەبێ. هەندێ لە کارە هەرە باشەکانی بواری رۆژنامەنووسی خۆی بە کتێب چاپ کردووە، بتایبەتی سەفەری ئەسپانیا ١٨٤٠، ئیتالیا ١٨٥٢، رۆژهەڵاتی نزیك ١٨٥٤ و روسیا ١٨٦٦.

بایەخی ئەدەبی ئەم نووسەرە، بەندە بە شیعرەکانییەوە، بەتایبەتی لە ئاخر و ئۆخری ژیانیدا، ئەو شیعرانەی تەنیا لە پێناوی هونەردا نووسیوەو تێکەڵ بە کارە رۆژنامەوانییەکەی نەکردووە، ئەم شیعرانەی لە دیوانێکی بچکۆلانەدا بەناوی (ئینمال و کامو-١٨٥٢) بڵاو کردۆتەوە. لەم دیوانەدا تێوری هونەر بۆ هونەری جەڕباندووە. لە جووتە دیوانەکەیدا بایەخێکی زۆر کەمی بە بیرو سۆز داوەو، تایبەتمەندییەکی شیعری پرشنگداریان لەخۆ گرتووەو بەرەو کەماڵ دەچن. هەندێ هەوڵ بەدی دەکرێ کە بریتییە لە تێکەڵکردنی کۆمەڵە هونەرێك لە یەك هونەردا وەکو (سەمفونیا..) رێبازی شیعری خۆی لە قەسیدەیەکدا بەناوی (هونەر) بەرجەستە

کردووە. هونەرمەند باشترین کاری خۆی ئەو کاتە بەرهەم هێناوە کە بە گژ فۆرمە یاخییەکاندا چووەتەوەو خۆی لەو بابەتانە داوە کە رام نابن، و دەستەمۆ نابن.
هونەر تاقە بیانووی دەستی نییە، بەڵکو هونەر لە هەموو بەرهەمێکی بەشەری نەمرترە، و هەر هونەر دەمێنێ. چەمك و بۆچوون و کارە شیعرییەکانی بە درێژایی سەدەی رابردوو کاریگەرییان بەسەر رەوتە شیعرییەکانەوە هەبووەو بە شێوەیەکی هەرە تایبەتی کاریان لە بۆدلێر کردووە.

## ٨٩- نیکوس کازانتزاکیس

١٩٥٧-١٨٨٥

نووسـەرو هزرڤـانێکی یۆنـانی هاوچـەرخە. هـەروەها لوتکەیـەکی زۆر بـەرزە لـە نێـو ئەدیبـە جیهانییەکانـدا و وەکـو رۆمـاننووس خـودانی شـۆرەتێکی بـێ وێنـە بـوو. لـە دورگـەی گریـت دا، لـە ٨/دیسـامبەری/١٨٨٥دا لـەدایك بـووە. یاسـای لـە زانکـۆی ئەسـینا خوێنـدووە و پاشـان چـووەتە پـاریس و فەلسـەفەی خوێنـدووە. پاشـان گەڕایـەوە بـۆ یۆنـان و بـۆ مـاوەی دوو سـاڵان لـە دێرێکـی رەبـەنان دا لەسـەر چیای ئاتوس، کە زۆر جار لە رۆمانەکانیدا ناوی هێنـاوە، دەچێتە خەڵوەتـەوەو گۆشـەگیری هەڵدەبـژێرێ. ئـەم گۆشـەگیرییە وەکـو ماوەیـەك بـۆ رامـان و تێفکـرین و ورد بوونـەوە، گـەلێك لـە بیرو بۆچوونە تەقلیدییـەکانی گـۆڕی و روانینی بـۆ ژیـان بـەرنیتر و روونـتر کرد. پاشان روویکردە ناو جەرگەی ژیان تا لەوێندەرەوە کارە هونەرییـەکانی بەرهـەم بهـێنێ. کەسـێکی فـرە بەرهـەمی دەسـت رەنگـین بـوو لـە داهێنانیـا، کـراوە بـوو لـە بیرکردنەوەدا و تا بڵێی ئازاد و چالاك بوو. زۆر وتار و تۆژینـەوەی لـە وارێـن رەخنـەو فەلسەفەدا بڵاو کردوەتەوە، شانۆنامەی تراجیدی نووسیوە، لەوانە: (تیوس، ئوتـەیل دەگەڕێتەوە، مەسیح و بوزاو پرومیسیوس). هەروەها لە بواری گەشت و سـەفەران دا قەڵەمی تاو داوە و کاری کردووە لەوانە:(سەفەرانی نێوان چین و یابان). هـەروەها لـە بواری هۆزانێن لیریکی و مەلحەمی دا کـاری کـردووە. نـاودارترین کـاری شیعری ئـەو مەلحەمەیـە کـە بـە نێـوی (ئۆدیسـا) کـە ٣٣,٣٣٣ نیـوە بەیتـە، ئـەم کـارە وێنەیـەکی مەلحـەمی هـەرە جوانـەو رەوت و ێچـکەی فیکـری کـازانتزاکیس لـە سـەرێگەی ژیـان نیشـان دەدات. لـەم کـارەدا و لـە هۆنینـەوەی ئـەم کـارەدا چـاوی لـە مەلحەمەکـەی هۆمیرۆسـی شـاعیری کـۆنی یۆنـان و خـودانی هـەردوو شـاکاری ئـەلیازەو ئۆدیسـا کـردووە. لـە پـاڵ پـڕ بەهرەیی خۆیدا ئاوڕی لـە وەرگێڕانـی کلاسیکیاتی ئـەورووپاش داوەتـەوە بـۆ سـەر زمـانی یۆنـانی وەکـو (کۆمیـدیای یـەزدانی)ی دانـتی و (ڤـاوسـت)ی جیتـە و (وەهـای گـوت زەردەشـت)ی نیتشـە. لـە تەمـەنی پیریـدا هاتـە سـەر نووسـینی رۆمان و شۆرەتێکی جیهانی لەو بوارەدا بەدەست هێنا. گرنگترین رۆمانی بریتین لـە: (زۆربای یۆنانی، مەسیح لە سێدارە دەدرێتەوە، براکوژی، ئازادی یان مەرگ)

کازانتزاکیس، نیشانەیەکی یەجگار گرنگە لـە مێـژووی ئـەدەبی یۆنانیـدا، ئەڵقەیـەکی بەهێزە لە نێو زنجیرەیەکی بەردەوامی ئەدیبان و شـاعیران و رۆماننووسـانی یۆنانیـدا بـە درێـژایی پـتر لـە سـەدەیەك. ئەمـەش بـە قۆنـاغی بوژانـەوەی یۆنـانی لـە سـەردەمی

تازەدا تێتە ژماردن، سەیر دەکەی یۆنان لە خۆی دەگەڕێ، لە نێو رابردوو و ئێستادا بۆخۆی دەگەڕێ بەداوێکی بەتین رابردوو بە ئێستاوە گرێ دەدات و عەودالّی ئێستاو ئایندەیە بە هەموو تازەییەکیەوە. ئەم قۆناغە لە مێژووی یۆناندا زۆر گرنگە، ئەدیبانی یۆنان کاریان بۆ قولّقاندنەوەی یۆنانێکی تازە لە رووی زمان و ئەدەبەوە کرد یۆنانیان کرد بە خاوەن ئەدەبێك کە شان لە شانی ئەدیبانی جیهان بدات.
یۆنان بەر لەوەی لە لایەن تورکەوە داگیر بکرێ و لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا لە واری زماندا گرفتاری خۆی هەبوو، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان زمانی نووسین و زمانی قسە کردندا هەبوو، ئەمەش کارێکی نێگەتیفی کردبووە سەر ژیانی ئەدەبی و چالاکی ئەدەبی تەواو کوێر کردبووەوە. پاشان کە داگیرکەی تورکی هات قوڕەکەی هێندەی دی خەست کردەوەو چی وای نەما ئەو کەلەپورەی کە مابووش هەمووی بسڕێتەوە، ئیدی ئەدەب تووشی نەخۆشی ئیفلیجی هات و قەدەر و چارەنووسی نووسەران ئەدیبان بوو بە راوەدوونان و وەدەرنان و نەفی کردن. یۆنان جگە لە هەندێ شیعری فۆلکلۆری و سترانێن خۆشەویستی و مەرگ چیتری بۆ نەمایەوە. لەگەلّ دەسپێکی بزاڤی رزگاریخوازیدا بزاڤی ئەدەبیش سەری لەگۆڕ دەرهێناو ژیایەوەو یۆنان کەوتە گەڕان بەدووی رێگەی دروستی خۆیدا. ئەوجا ئەدیبان لە ئەنجامی رزگارییەوە روویانکردە رۆژئاواو دڵبەندی ناودارانی ئەدەبی ئەو سەردەمەی رۆژئاوا بوون، وەکو والتەر سکۆت و ئەلکسەندەر دۆماس و خوویان دایە وەرگێڕانی شاکارەکانی ئەدەبی جیهانی. جا لە میانەی ئەم کارەوە ئەدەبی یونانی چەکەرەی کردو بەرە بەرە خۆی بە پێوە گرت و توانی لە ماوەی سەدەیەکدا شیعرو پەخشانێکی وەها بەرهەم بهێنێ کە شان لە شانی ئەدەبی بەرزی ئەوروپا بدات. ئەم قۆناغە بە قۆناغی گوزارشتی نیشتمانی ناودەبرێ. چونکە بزاڤی ئەدەبی تەماحی ئەوەی هەبوو کە نەتەوەی هیلینی بونیات بنێتەوەو بەسەر ژان و کول و کۆڤانی رابردوودا زالّ بێ. هەڵبەتە نووسەرانی ئەم قۆناغە نە دەستبەرداری رابردوویان دەبوون و نە ئێستایان لەسەر جەساوی رابردوو فەرامۆش دەکرد. باوەڕیان وابوو کە ئێستا بایەخی خۆی هەیەو پێیان وابوو باشترین شت ئەوەیە کە رابردوو و ئێستا لە کەلەپورێکی بەردەوام دا پێکەوە گرێ بدەن. پێیان وابوو هەر قۆناغ و سەردەمێك گیروگرفتی خۆی هەیە و ئاوێتەی ئەو قۆناغەیەو دەبێ هەر نەوەیەك کار بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی سەردەمی خۆی بکات و هەموو توانایەکی بەردەستی خۆی لە ئێستادا بۆ ئەو مەسەلەیەدا بخاتە گەڕ نەك پاشەکشە بکات و خۆی لە واقیع

بدزێتەوەو گرفتەکانی خۆی بۆ نەوەکانی پاش خۆی بەجێ بێڵێ. ئەدەبیاتی ئەو قۆناغە ئەدەبیاتی رووبەروو بوونەوە بوو. رووبەڕوو بوونەوەی ئێستا بە هەموو شتە تازەکانیانەوە، هەروەها قەبوڵکردنی واقیع و گیرو گرفتەکانی و چارەسەر کردنیان بە پێی پێداویستییەکانی ئێستا. ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرە روانینێکە کە رابردوو فەرامۆش ناکات بەلاّم ژیان بە بەردەوامییەك دەزانێ کە رابردووی لە هەناودانی خۆیدا هەڵگرتوەو بەرەو ئایندەیەکی تازە دەچێت و لەگەڵ هەر قۆناغێکدا شێوەو فۆرمی تازە وەردەگرێ.

جا بەم لۆژیکە ئەدەبی یۆنانی رێچکەی دروستی خۆی دۆزییەوەو ئەدەبیاتی ئەم قۆناغە توانیان زمانی یۆنانی تازە بکەنەوەو لەگەڵ سەردەمی تازەدا بیگونجێنن. واتە زمان بە جۆرێ بووبوو بە خەمی ئەدیبان کە هیچی لە مەسەلەی رزگاری کەمتر نەبوو، ئەوەتا سولوموس دەڵێت: "خەمی من تەنیا رزگاری و زمانە".

دیارە لە سەرەتای ئەم قۆناغەدا دوو قوتابخانەی ئەدەبی سەریان هەڵدا، یەکەمیان کە لە دورگەکانی ئەیونییەوە سەری هەڵدابوو، بە قوتابخانەی ئەیونی ناسرا (١٨٢٠-١٨٨٨) ئەمەیان زیاتر قوتابخانەیەکی شیعری بوو، شیعری ئەو قۆناغە پتر گوزارشتی لە کول و کۆڤانی گەلی یۆنان و هیواو ئامانج و قارەمانییەکانی ئەو گەلە دەکرد. قوتابخانەی دووەم، قوتابخانەی ئەسینا بوو، پەخشان لەم سەردەمەدا تەواو بوژێنرایەوە ئەدیبان گەڕانەوە بۆ سەرچاوە شارستانی و مێژوویەکانی وولاّتی خۆیان، ئیدی بە زەبری رۆمان و کورتە چیرۆکان زمانی یۆنانی بوژایەوەو بوو بە زمانی ئەدەبیات و لەم قۆناغەدا نووسەرانی وەك: (ئەلکسەندەر بابادیامنتیس ١٨١٥-١٩١١، ئەندریا کارکافیتساس ١٨٦٦-١٩٢٣، ئیوتوکیس ١٨٧٢-١٩٢٣) هەڵکەوتن، هەڵبەتە شەقڵی شوانکاریی بەسەر بەرهەمەکانیاندا زاڵ بوو، چونکە گوند سەرچاوەی سروش و ئیلهامیان بوو.

پاش یەکەم جەنگی جیهان کۆمەڵێك نووسەری لاو دەرکەوتن، ئەوانە لە پێشڕەوانی قۆناغی تازە کردنەوەی تەکنیکی بوون، ئەمانە رێگەیان بۆ نەوەیەك خۆش کرد کە مەشخەڵی یۆنانیان هەڵگرت و درێژەیان بە رێگەکەدا، ئەویش نووسەرانی پاش ساڵی ١٩٣٠، ئەم نەوەیە ئەدەبێکی گەشەکردوو تریان پێشکەش کردوو هاتنە ناو ئەدەبی جیهانییەوە، هەندێك لەو ئەدیبانە ئەمانەن: سترافینس میریفیلس، دیورگوس شیوتوکاس. ئەم نەوەیە بوون بە پێشەنگی نووسەرانی پاش دووەم جەنگی جیهانی. یەکێك لەوانە نیکوس کازانتزاکیس بوو کە لە رۆمانەکانیدا

جیهانبینییەکی قوڵ و بەرین، توانایەکی پڕ لە داهێنان و شێوازێکی هەرە هونەری بەرجەستە کرد. توانی زمانی یۆنانی تازە خۆشە بکات و بەوپەڕی لێهاتووییەوە بیکات بە کەرەستەیەکی بەهێزی دەربڕین.

کازانتزاکیس لێهاتووانە گوزارشتی لە مرۆڤی هاوچەرخ کردووەو ناخ و دەروون و نیگەرانی و ململانێ و سەرکەوتن و ناکامی و خێرو شەڕەکانی مرۆڤی هاوچەرخی هونەراندووە. کازانتزاکیس لە قولآیی کەلەپورەوە دێ و گوزراشت لە تازە دەکات. ئەو کەسێکی یۆنانییە، قارەمانەکانی وەکو شەقڵ و سیماو ئەخلا قیات یۆنانین، بە کەرەستەی جیهانی مالیجەی قارەمانەکانی و ئەو دۆزانە دەکات کە لە کارە ئەدەبییەکانیدا دەیخاتە روو. ئەدەبی ئەم پیاوە هەم ناوچەییە و هەم جیهانییە. رابردوو و ئێستا، ناوچەیی و جیهانیەت پێکەوە گرێ دەدا. تەجرەبەیەکی قوڵی ئەوتۆیە هەر مرۆڤێکی هاوچەرخ، لە هەر تیرەو تایفەیەك بێ خۆی تێدا دەبینێتەوە. راستە رەشبینی بەسەر زۆربەی بەرهەمەکانی کازانتزاکیس دا زاڵە، بەڵام لە ئاسۆی ئەو نائومێدییە تارەدا هیواو ئومێدێکی دوورە دەست بەدی دەکرێ و ژیان تەنیا بێ ئومێدی نییە. خاچ باری قورسی ژیانەو دراوە بە کۆڵی مرۆڤدا، هەڵیدەگرێ و بە چیای سەختدا هەڵدەگەڕێ و بەتەمای رزگارییە، بەردەکەی سیزیفە، لەخاچدان سەرکەوتنی هێزی شەڕە، ژیانەوەی مەسیح هیواو ئومێدەکەیە، رەنگە دوورە دەست بێ، بەڵام هەیە. مرۆڤ دەبێ خاچەکەی خۆی بەشاندا بدات، ئازار بچەژێ و بخەبتێ، رێگەی سەخت بگرێتە بەر، رێگەی هەوراز، رێگەی رزگاری. رزگاری بەبێ خەبات نابێ، خەباتی مرۆڤی ئازادی یاخی، ئازاد بەرانبەر بەخۆی بەرانبەر بە گەردوون، یاخی لەخۆی، یاخی لە بوون و گەردوون.

وێڕای لایەنی رەشبینی نەهلیستیانە لە بیر کردنەوەی کازانتزاکیسدا، بەڵام نووسینەکانی بانگەوازا بۆ ژیان، چونکە ئەگەر ژیان نەگاتە هیچ ئەوا هیچ شتێکیش ناکاتە ژیان.

ژیان لەلای کازانتزاکیس سەرکەوتنە بەسەر مردندا، سەرکەوتنە بەسەر نائومێدیدا، خەباتی بەردەوامە، و شادییەکی تراجیدییە.. بەڕای کازانتزاکیس رزگاری هیوایەکە لەودیوی نائومێدییەوە، خەبات تاقە رێگەیە بۆ پێشکەوتن و پەڕینەوە لەو هەڵدێرە هەزار بەهەزارە، خۆشەویستی و کار کەرەستەی خەباتن و تویشوی کاروانی ژیانی و رێگەن بۆ سەرکەوتن بەسەر نائومێدی دا. خۆشەویستی و کار هی مرۆڤی ئازادن ئەو مرۆڤەی بەخۆی ژیانی خۆی هەڵدەبژێرێ و دەگەیەنێتە ئاستی داهێنان. مرۆڤی

ئازاد ئەو کەسەیە کە هەموو ساتەکانی ژیانی دەجەڕبێنێ بە هزرو بیری پێشوەختە و قالبی کۆن رازی نابێ.. بە هەرحاڵ مرۆڤ دەروخێنێ و بینا دەکاتەوەو تا رادەی داهێنان، ژیان دەجەڕبێنێ و خۆی بەسەر ژیاندا دەسەپێنێ و چەکی دەستیشی لەم بوارەدا کارو سەبر و خۆشەویستییە.. بەڵێ بەم جۆرە ژیان هیوایەکە نائومێدی دلیر رفیق عارف تێدەپەڕێ، ژیان هیوایەکە نائومێدی هەر چواردەوری تەنیوەو دەبێ دەبێ ئەزموونگەرییانە پێیدا تێپەڕی و ئەو هەڵدێری عەدەمەیڕی کە بەسەریدا دەپەڕییەوە. ژیان دڵێکی عاشقە جوانییەو قەترە قەترە لە سۆزدا دەتوێتەوە.

کازانتزاکیس بۆ یۆنان ژیاو خۆشەویستی یۆنان دڵی پڕ کردبوو.. خۆشەویستی یۆنان بە گەل و مێژوو و کەلەپورەوە. بۆ مرۆڤ ژیا، واتە بۆ خۆشەویستی و ژیان و سروشت و جوانی تا لە ١٩٥٧/١٠/١٨ ئەجەل ئامبازی بوو و دای بە عاردیدا.. بەمجۆرە کازانتزاکیس کۆچی دوایی کرد و خەرمانێکی بە پیت و بەرەکەتی لە ئەدەب و هزر بۆ بەجێهێشتین کە ناخمان دەدوێنێ و لە وەتەری بوونی مرۆڤانی نەنراو بە عەدەممان دەدات

## ٩٠- جان پۆل سارتەر

١٩٨٤-١٩٠٥

فەیلەسوف و رۆماننووس و شانۆنامەنووسێکی فەرەنسییە، لە پاریس لەدایك بووە، لە ساڵانی ١٩٢٤-١٩٢٩دا لە قوتابخانەی گشتیی ناوەندی خوێندوویەتی. لە ساڵی ١٩٣١دا فەلسەفەی لە هامز خوێندووە خوێندووە، لە ساڵی ١٩٣٢دا لە بەرلین خوێندویەتی. پاش گەڕانەوەی بۆ فەرەنسا، بۆ چەند ساڵێکی کەم لە قوتابخانەکانی فەرەنسادا دەرسی گوتووەتەوە. لە پاش دووەم جەنگی جیهانییەوە بە تەواوەتی خۆی بۆ نووسین تەرخان کرد. لە واری فەلسەفەدا قەرزارباری (هوسرەل و هایدگەرە). ئەنگزیستانیالیزم سیستەمێکی فەلسەفی رەسەن پێك دێنێ لەلای سارتەر. ئەم سیستەمە فەلسەفییە پشت بەو گریمانەیە دەبەستێت کە (خوا مردووە) بۆیە ئەگزیستانسیالیزم زەروریە وەکو بناغەو بنەمایەك بۆ ئەخلاق. لە روانگەی سارتەرەوە قەدەرو چارەنووسی مرۆۋ حەتمیەتێکی پێشوەختە نییە، و هیچ قانونێکی ئەخلاقی گەردونی لە گۆڕێ نییە.

وەکو هێزی ئەخلاقی مرۆۋ ئازادە بۆیە پابەندی مرۆۋ دەکاتە هەڵبژاردن و مەسئولیەتی خۆی. ناتوانێ وەکو تاك لە دەرێی هەڵسەنگاندنی کۆمەڵدا بۆی، بە تەنێ بژی.

لە ئەنجامی تەتبیق کردنی ئەو بیرانەی بەسەر پایەی نووسەردا لە کۆمەڵگەی هاوچەرخدا گەییە ئەو ئەنجامگیرییەی کە داهێنانی هونەری دەبێ چالاکیەکی ئەخلاقی بێ، و ئەدەب کە پێویستی یەك بێ و دەبێ هەر ببێ، ئەوا دەبێ پەیامدارو مولتەزیم بێ.

وتارەکانی سەرەتای (کورتەی تیۆری سۆزان ١٩٣٩، و سایکولوژیەتی خەیاڵ ١٩٤٠ ) سەرنجی خەڵکیان رانەکێشا. یەکەم (هێڵنج ١٩٣٨و کۆمەڵە چیرۆکی خۆشەویستی ١٩٣٨) زوو دەنگیان دایەوەو بوونە مایەی ئەوەی زووبەزوو وەکوو نووسەرێك ئیعتراف پێ بکرێ. ئەم دوو بەرهەمە بیرو بۆچوونی ئەگزیستانسیالیستی لەمەڕ غوربەت و ئیلتزام و رزگاری لە رێگەی هونەرەوە بە شێوەیەکی درامی دەخەنە روو.

لە کتێبە فەلسەفیە گرینگەکەیدا (ئەگزیستانسیالیزم و نەبوون- بوون و نەبوون) ١٩٤٣، مەرجەکانی مرۆۋ سەبارەت بە خۆی و بە جیهان و بە تاکەکانی دی کەشف دەکات. ئیدی ئەم چەمکانەی ئەگزیستانسیالیزم ١٩٤٦دا چەسپاندووەو لە رۆمانە سێ بەرگییەکەیدا (رێگەی ئازادی ١٩٤٥-١٩٤٩دا روون کردووەتەوە).

بیرۆکەی بتەڕەتی خۆی سەبارەت بە نووسەری مولتەزیم لەو شانۆنامانەیدا روون کردۆتەوە کە مەسەلە ئەخلاقییەکان مالیجە دەکەن، لە (مێش دا ١٩٤٣) جوبیتەری بێ دەسەڵات سنوور بۆ ئازادی گەنجە بکوژەکە دادەنێ. سارتەر زۆر وتاری رەخنەوانی نووسیوە، لەناو ئەوانەدا دوو لێکۆڵینەوەی هەن دەربارەی (بودلێر ١٩٤٧ و جان جانیت ١٩٥٢). یەکەم ژیاننامەی لە کتێبێکدا بەناوی (پەیڤان ١٩٦٤) بڵاو بووەوە. لە ساڵی ١٩٤٦دا خەڵاتی نۆبڵی درایێ بەڵام رەفزی کرد.

## ٩١- فريدريك ويل هيل نيتشه

١٨٤٤-١٩٠٠

فەیلەسوف و شاعیرێکی ئەڵمانییە. لە تەمەنی پێنج ساڵیدا بابی مردو لەلای ژنێکی خواناسی خزمی خۆیان گەورە بوو. دەڵێن گوایە ئەمە هۆیەك بووە بۆ ئەو هێرشانەی دوایی نیشتە بۆ سەر ژنان و ئاین. گەنجێکی نموونەیی جوان بوو. لە ئەنجامدا وێڕای حەزی بۆ مۆسیقا و ئاین، بوو بە مامۆستای فەلسەفەی کلاسیکی لە هەردك زانکۆی بون و لایبزگ. بەرهەمەکانی لەو بوارەدا زۆر بوو بۆیە لە ساڵی ١٨٦٩دا بوو بە مامۆستای یۆنانی لە زانکۆی بالدا، دیارە ئەمە دەستکەوتێکی گەورە بوو بۆ لاوێکی سەر بە کۆمەڵگەیەکی هەرە موحافەزەکار. پاش دە ساڵان لەبەر نەخۆشی وازی لەو پایەیە هێنا، ئیدی لە دە ساڵی دواتر لە گۆشەگیری لە باشووری ئەڵمانیاو سویسراو ئیتالیادا ژیانی قەتاند، لە ساڵی ١٨٨٩دا تووشی داروخانێکی ئەقڵی بوو و تا مردنیش ئەو نەخۆشییە یەخەی بەرنەدا.

لە ساڵی ١٨٧٢ دوای ئەوەی کوردسی مامۆستایەتی بەدەست هێنا کتێبێکی بچکۆلەی یەجگار نایابی بەناوی (لەدایکبوونی تراجیدیایەك لە روحی مۆسیقا)وە. بڵاو کردەوە. ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی کۆنی میکانیکی نییە بەڵکو پشکنینێکی فەلسەفی مەزەندەییە بۆ پاشخانی روحی شانۆنامەی تراجیدی گریگی. پاش ئەم کتێبە لە ساڵانی ١٨٧٣-١٨٧٦دا کتێبی (ارا مجردە)ی نووسی دەربارەی زەرەر و زیانەکانی دەوڵەتی تازەی بیسمارکی. یەکێك لە کتێبە هەرە گرنگییەکانی ژیانی ئەدەبی نیشتە (وەهای گوت زەردەشت)ە کە لە ساڵانی ١٨٨٣-١٨٩٢دا نووسراوەو بریتییە لە زنجیرە وەعزێکی هەڵبژاردە بەناوی پەیامبەرێکی خەیاڵییەوە، ئەم کتێبە بە پەخشانێکی شیعرئامێزی لە بابەتی ئەو پەخشانەی لە ئینجیل دا هەیە، نووسراوە. لە ساڵی ١٩٠٨دا کتێبێکی بەناوی (ئادەمیزاد) بڵاو کردەوە کە پتر گەشتنامەی ژیانە. هەروەها هەندێ شیعری زۆر چاکیشی نووسیوە.

کەسایەتییەکی یەجگار ئاڵۆزو پڕ گرێ و گۆڵ بوو، زۆر بە توندی هێرشی کردۆتە سەر هەموو هزرو بیرو بەهاکانی سەردەمی خۆی لەوانە: مەسیحیەت، ئەخلاقی تەقلیدی، هاوسۆزی دەگەڵ بێنەواو بێ دەسەلاتان، و ئەقلانییەت. بە یەکێك لە هاورێکانی گوتووە کە نەك هەر زەروری نییە بەڵکو پەسندش نییە لەگەڵ خوێنەرەکانیدا رێك بێ یان رێك بکەوێ. باشترین هەڵوێست بۆ خوێنەر بریتییە لە

تێکەڵەیەك لە فزولْ و بەرهەڵستکاری توند. لە هەندێ خاڵاندا مەزەبەکەی بە فاشی لە قەڵەم دەدرێ، پەیڕەوانی هیتلەر ئامادە بوون بە پێغەمبەرو ئیلهام بەخش بانگی بکەن، جا لەم بارەیەوە تەنیا ئەوەندە دەگوترێ کە نیشتە دژی کەڵکەڵەی ناسیونالستی بوو، دژی سوپاو سوپاکاری و ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی و دژی نەژاد پەروەری و دەسەڵاتی سیاسی بوو. نیشتە بە حەماسێکی زۆر بەرز و بە عەقڵیەتێکی لۆژیکییەوە گوزارشتی لە هزرو بیری خۆی کردووە، هزرو بیری ئەم گەورە فەیلەسووفە هەمیشەو رۆژێنەر و بگرە خەتەریش بووە. لەوەیە ئەو موبالەغەکاری و توندڕەوییەی ئەنجامی میزاجی توندی خۆی و بەرەنجامی ئەو قۆناغە مێژووییە بووبێ کە تیایدا ژیاوە. کۆمەڵەی ئەو سەردەم تا ڕادەی غرورو نێرگزیەت توند و تیژ بوو. نیشتە وەکو ئەپسن سوور بوو لەسەرئەوەی بە کۆمەڵگەی بسەلمێنێ و کەشفی بکات کە چۆن گەورە پیاوان، ئەوانەی دەپەرستران، خەڵکانێکی پوچ و بەتاڵ و بێ ناوەڕۆك بوون.

## ٩٢- جاك لۆندۆن

١٨٧٦-١٩١٦

جاك لۆندۆن، ناوی خوازراوی جان گریفیپ لۆندۆنە. نووسەری رۆمان و کورتە چیرۆك و وتارێن کۆمەلاْیەتی بوو. لە هەوەڵێن نووسەرانی کالیفۆرنیایە کە شۆرەتی جیهانی پەیدا کردووە. بە یەکەمین نووسەری رەنجبەران و زەحمەتکێشان لە ئەمریکادا دێتە ژماردن. منداڵیەتی بە هەژاری قەتاندووە. قۆناغی خوێندنی ئامادەیی لە کالیفۆرنیا تەواو کردووەو ماوەیەکی کەمیش لە زانستگەی کالیفۆرنیا خوێندوویەتی. قۆناغی هەرزەکاری لە دەورووبەری دەڤەری پڕ بەفر و بەستەڵەکی باکوورو دەوروبەری رووباری کلۆندیکدا بە دووی زێڕدا بەسەر بردووە. لە ساڵی ١٩٠٤دا بۆ ئامادە کردنی راپۆرێك لەمەڕ جەنگی نێوان روس و ژاپۆندا، چووە بۆ ژاپۆن.

لۆندۆن، زۆربەی بەرهەمەکانی لە دوای تەمەنی بیست و چوار ساڵییەوەنووسیوون. هەندێ لەو بەرهەمانە بریتین لە: دوو شانۆنامە بەناوی: (نازی ژن ١٩٠٦، دزی ١٩١٠) و چەند کتێبێك دەربارەی بابەتی گشتی لەوانە: شۆڕش ١٩١٠، سەربهوردی کەشتی سنارك ١٩١١، هەروەها ١٦ وتار دەربارەی دەریای باشوور، و چل رۆمان و کورتە چیرۆك، هەروەها کۆمەڵێك وتاران دەربارەی مەسەلە کۆمەلاْیەتییەکان. رۆمانەکان بریتین لە: کیژانی بەفر ١٩٠٢. ئەم رۆمانە دەربڕی مامەڵە کردنی لۆندۆنە لەگەڵ بابەتی بالاْدەستی نەژادی ئەنگلۆ-ساکسۆن و بێ توانایی ئەو لە بەرجەستە کردنی سیمای ژناندا نیشاندەدات. (هاواری هۆڤی ١٩٠٣) لە رۆمانە هەرە باشەکانی لۆندۆنەو سەرگوزەشتەی سەگێك نیشاندەدات کە بۆ راکێشانی عەرەبانە دەیبەن بۆ ئالاسکا. ئەم سەگە ئاخری لەدەست بێ بەزەیی بەشەر هەڵدێ و دەچێتە ریزی گورگانەوەو دەبێ بەسەر دەستەی ئەوان. (پێشبڕکێ ١٩٠٥) (ئەم چیرۆکە لە لایەن حەمە کەریم عارفەوە کراوە بە کوردی و لە کتێبی (ئەودیوی مەرگ)دا بلاْو بووەتەوە) ئەم چیرۆکە، کە زۆرجار بە رۆمانیش ناودەبرێ دەربارەی بازرگانییەکە لە رێگەی بۆکسێنەوەو کۆتاییەکەی زۆر خەمینە. (بەر لە ئادەم ١٩٠٦) رۆمانێکە دەربارەی پەرەسەندن و ژیانی مرۆڤانی بەر لە مێژوو. (کەڵبە چەرموو-١٩٠٦) پاشکۆی (هاواری هۆڤی)یە، ئەمە بەسەرهاتی سەگ گورگێکە کە بەرە بەرەماڵی دەبێ. (پاژنە ئاسنین-١٩٠٨) رۆمانێکە دەربارەی رووبەرووبوونەوەی سەرمایەداری لەگەڵ

هەڕەشەی سۆسیالزمدا، لۆندۆن لەم رۆمانەدا پێشبینی شۆڕشی فاشیستی ساڵی ١٩٣٢ کردووە.

(مارتین ئیدین -١٩٠٩) رۆمانێکە بەدەوری تەوەری ژیانی خودی نووسەردا دەسووڕێتەوە، قارەمانی چیرۆکەکەش وەکو لۆندۆن لە ئەنجامدا خۆی دەکوژێ. ئەم رۆمانە لە راستیدا مالیجەی بابەتی سوپەرمانیەتەکەی نیتشەیە. (جۆن بارلیکورن ١٩١٣) ئەم رۆمانە زیاتر ژیاننامەیەو باسی بادەنۆشی و بەرەڵڵاییەکانی خودی نووسەرە. هەروەها دوو-سێ رۆمانی دیکەشی هەن. لە بواری چیرۆکی کورتیش دا چەندین کۆمەڵە چیرۆکی هەیە لەوانە: (کوڕی گورگ ١٩٠٠) بریتییە لە نۆ چیرۆکی پڕ ڕووداوو کە لەوپەڕی ویلایەتەکانی باکووردا روو دەدەن. (خودای پێشینانی ئەو ١٩٠١) بریتییە لە یازدە چیرۆك و ژیانی دەورووبەری رووباری کلاندیك نیشان دەدەن. (منداڵانی جەنگەڵ ١٩٠٢) بریتییە لە دە چیرۆك دەربارەی سوور پێستانی ئالاسکا. (خۆشەویستی ژیان ١٩٠٧) کۆمەڵە چیرۆکێکە دەربارەی ئالاسکا. یەکێك لە بەرهەمە چیرۆکڤانییەکانی دیکەی لۆندۆن کتێبێکە کە نووسەر زۆری پێ پەسندە بەناوی (خەڵکانی دۆزەخ-١٩١٣) کە ژیانی کوختە نشینانی شاری لەندەنی وێنە گرتووە.

لۆندۆن لە ژێر کاریگەری مارکس، داروین و نیتشەدا بووە. لە بەرهەمەکانیدا لایەنگری لە سوسیالزم کردووە و تەنانەت بووە بە ئەندامی حیزبی سوسیالست. چەند بەرهەمێکیشی لەمەڕ سوسیالزم نووسیوە، لەوانە: جەنگی چینەکان ١٩٠٥) کە کۆمەڵە وتارێکە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بەرهەمەکانی، هاوسۆزی بووە لەگەڵ هەژاران و رەنجبەران دا، پێشبینی کردنی شۆڕشی جیهانی، و دامەزراندنی دەوڵەتی سوسیالستی بووە لە ئایندەدا

## ٩٣- هەریت بیچەر ستۆ

### ١٨١١-١٨٩٦

خانمی رۆمان نووس، لە ویلایەتی کونکتیکت لە دایك بووە، باوکی کەشیشێکی گەورە بووە، شەش برای هەبووە، پێنجیان بوون بە قەشە و هەموویان لە خەباتگێرانی شێلگیر بوون دژی کۆلایەتی، هەریت بە خۆیشی لە شەیدایانی کاروباری ئاینی و ریفۆرمی کۆمەلأیەتی بوو. لە سالّی ١٨٣٢دا لەگەلّ بابیدا چووە بۆ سین سنیاتی، کە مەیدانی خەباتی هەلّوەشاندنەوەی کۆیلایەتی بوو.

لەوێندەر لە نزیکەوە ئاشنای دەرد و رەنجی کۆیلەکان بووە، هەلّبەتە یاسا لە توانا بەدەرەکان، دەربارەی کۆیلانی هەلأتوو (١٨٥٠) زۆری رەنجان، بۆیە بە هاندانی مێردەکەی (کالڤین. ی. ستۆ) کە مامۆستای زانستگە بوو، دەستی دایە نووسین.

درەوشاوەترین بەرهەمی هەریت رۆمانی (کوخەکەی هاپۆ تۆم- ١٨٥٢) بوو کە پێشوازییەکی کەم وێنەی لێکرا. لە ماوەی یەك سالّدا (٣٠٠) هەزار دانەی لێفرۆشرا و بە لای کەمەوە بۆ ٢٧ زمان وەرگێڕدرا، ئەم رۆمانە لە سالأنی پێش شەڕەکانی جیابوونەوەدا، بە توندی هەستی باکوورییانی دژ بە کۆیلایەتی هاڕوژاند، دەربارەی کاریگەری ئەو رۆمانە، باوە کە (چارلز سومنیر ١٨١١-١٨٧٤)ی وتاربێژ و سیاسەتوانی ئەمریکایی گوتوویەتی کە ئەگەر ئەم کتێبە نەنووسرا بووایە، لینکولّن بۆ سەرکۆماری ئەمریکا هەلّنەدەبژێردرا، لینکولّن لە دیدارێکدا لەگەلّ خاتوو ستۆدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ستۆ (کتێبێکی نووسیوە کە ئەم جەنگە گەورەیەی بەرپا کرد).

شافارەمانی (کوخەکەی هاپۆ تۆم) کۆیلەی پیر و وەفادار هاپۆ تۆمە کە خاوەنە دلّڕەقەکەی زالّمانە رەفتاری لەگەلّدا کردووە و تا ڕادەی مەرگ جەلّدەی لێداوە، رۆمانەکە بەسەرهاتی ئەو کۆیلەیە نیشان دەدات.

خاتوو ستۆ، لە پێشەنگانی راپەڕینی دژایەتی کردنی رەنگ پەرستی بووە و ئەمەش بە جوانی لە بەرهەمەکانیدا رەنگی داوەتەوە و بەرهەمەکانی کاریگەری تەواویان لەو بوارەدا هەبووە، لەوانە (ئازار ١٨٥٦) رۆمانێکە دژی کۆیلایەتی، (خوازبێنی کەشیش ١٨٥٩) رۆمانێکە دەربارەی ئینگلستانی نویّ لە سەدەی هەژدەمدا، (مرواری دوڕگەی ئور ١٨٦٢)، و (خەلّکانی شاری کۆن ١٨٦٩) ئەم دوو رۆمانە هەردوکیان رابردووی ئەمریکا نیشان دەدەن.

## ٩٤- پیرل باك

١٨٩٢-١٩٧٣

ئەم ئافرەتە رۆماننووسە لە ڤیرجینیای رۆژئاوا هاتۆتە دنیاوە، بە منداڵی لەگەڵ بابیدا، کە مژدە دەرێکی مەزەبی بوو، چووە بۆ چین. لە شەنگەهای چووەتە قوتابخانە و لەوێندەر بە جۆری تێکەڵی چینییەکان بووە، کە خۆی بە کەسێکی چینی زانیوە، لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا بۆ ئەمریکا گەڕاوەتەوە و درێژەی بە خوێندن داوە، باك لە ساڵی ١٩١٧دا شووی کردووە و ئەمجارەیان بە هۆی کاری مێردەکەیەوە چووەتەوە بۆ چین، باك لە زانستگەکانی ئەوێندەر کەوتۆتە دەرسدانەوەی ئەدەبیاتی ئینگلیزی و کۆمەڵێك رۆمانی نووسیووە کە ناودارترینیان (خاکی چاك)ە و خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی ساڵیی ١٩٣٨ لەسەر وەرگرت و بەمەش ناوی کەوتە سەر زاران و ناو ناوان.

یەکەمین رۆمانی باك، (بای رۆژ هەڵاتی، بای رۆژ ئاوایی)یە کە لە ساڵی ١٩٢٨دا بڵاو بووەتەوە، رۆمانی دوای ئەوە (خاکی چاك-١٩٣١)ە کە لە ماوەیەکی کورتدا وەرگێڕدرایە سەر زۆر زمانان و کراش بە فیلم، ئەم رۆمانە چیرۆکی جووتیارێکی چینی دەگێڕێتەوە کە بە یارمەتی ژنە بە سەبرەکەی دەبێ موڵکدارێکی دەوڵەمەند. توانا بە سەبری، پایەداری و خۆشەویستی ئەم ژن و مێردە بۆ خاك، وەستایانە وێنە گیراوە.

رۆمانێکی باشی دیکەی باك بە ناوی (دایك ١٩٣٤)ە ئەمە سەر بووردەی دایکێکی دەستکورتی جووتیاری چینییە کە مێردەکەی بە ٥ مناڵەوە بەرەڵڵای کردووە.

خاتوو باك رۆمانانی دیکەی وەك (نەوەی ئەژدیها ١٩٤٢)شی نووسیوە کە دیمەنەکانی رۆژ هەڵاتی دوور دەنوێنێ و بەر جەستەدەکات. هەروەها ژیننامەی دایك و بابی خۆیشی لە قاڵبی دوو چیرۆکدا دارشتووە بە ناوی (فریشتەی شەڕخواز ١٩٣٦) و (زیندان-١٩٣٦) جگە لەمانە دوو رۆمانیشی هەیە دەربارەی وەزع و حاڵی خۆی بە ناوی: (دنیاکانی من-١٩٥٤) و (پردێك بۆ پەڕینەوە-١٩٦٢)، رۆمانانی: (پیاوانی خوا- ١٩٥١)، (نامەیەك لە پەکینەوە-١٩٥٧) و (وەرە، ئەی مەحبوبی من-١٩٥٣) لە جوملەی رۆمانە نیمچە ناودارەکانییەتی.

باك له دوا رۆماندا ئەو مەسەله ئەخلاقیانه تاوتویێ دەکات کە لە ئەنجامی تەقینـەوەی بۆمبای ئەتومیدا سەریان هەڵداوە، بەرهەمێکی کلاسیکی چینیشی بە ناوی (هەموو مرۆڤەکان بران– ١٩٣٣) کردووە بە ئینگلیزی.
باك، لە بەرهەمەکانیدا هەوڵدەدا کە چینییەکان بە ئەمریکاییەکان بناسێنێ و حاڵی بوونێك لە نێوان رۆژ هەڵات و رۆژئاوادا بێنێتە ئاراوە.

## ٩٥- برنارد مالامود

١٩١٤-١٩٩٤

نووسەرێکی یەهودی مەزەبە، لە بروکلین لە دایك بووە و هەر لەوێندەرش پەروەردە بووە، یەکەمین رۆمانی ناوی (شێتی زکماك-١٩٥٢)ە ئەمە حیکایەتێکی رەمزییە دەربارەی قارەمانێکی قاشوانیٚ، رۆمانی (یاریدەدەر-١٩٥٧)ەکەی مالامود باسی جولەکەیەکی دوکاندار و یاریدەدەرەکەیەتی، بابەتی رۆمانی (کارساز-١٩٦٦) کوشتنە لە پێناوی ئاییندا، شا قارەمانی رۆمانەکە لە ماوەی سیٚ سالٚ زیندانی و ئەشکەنجە و چاوەڕوانی دادگادا، لە باری رۆحییەوە لە جاران بە هێز تر دەبیٚ و مل بۆ ئیعترافی درۆ و خۆ کوژی و نا ئومێدی نادات.

دوو کۆمەڵە چیرۆکی هەیە بە ناوی (بۆشکەی جادو ئامێز ١٩٥٨) و ( گەوجان لە پێشەوەن-١٩٦٣) کە بە جوانی توانا و بە هرەی نووسەریی مالامود نیشان دەدەن.

## ٩٦- جۆن كيتس

١٧٩٥-١٨٢١

لە ریزی پێشەوەی شاعیرە رۆمانتیکەکانی ئینگلستانە، لە شاری لەندەن لە دایك بووە، لە هەشتساڵیدا باوکی کە کاروانسەرا دار بوو، لە دەست داوە و لە ١٤ ساڵیدا دایکیشی مردووە، کیتس لە پازدە ساڵیدا ئیدی لە خوێندن بێ بەش بوو و چووە لای جەڕاحێکی دەرمانساز بە شاگردی. لە ساڵی ١٨١٥دا وەکو خوێندکاری پزیشکی چووە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی لەندەن و سەرەنجام مۆڵەتی پزیشکی وەرگرت، بەڵام وازی لە کاری پزیشکی هێنا و یەکسەر کەوتە شیعر نووسین.

یەکەمین کۆمەڵە شیعری کیتس لە ساڵی ١٨١٧دا بەناوی (شیعرەکانی کیتس) بڵاو بووەوە. لە ساڵی ١٨١٨دا بەرهەمێکی تری بە ناوی (ئیندیمیون) چاپ و بڵاو بووەوە، ئیلهامی ئەم بەرهەمە لە ئەفسانەیەکی کۆنی یونانییەوە وەرگیراوە کە دەربارەی عەشقی خواوەندی هەیڤە بە شوانێکی لاو، (هیپریون ١٨١٨-١٩١٩) جوانترین شیعری کیتسە کە مەخابن تەواو نەکراوە.

(شەوی جەژنی سەن ئاگینس-١٨١٩) بەرهەمێکی جوانە کە لەسەر بنەمای ئەفسانەیەکی سەدەکانی ناڤین رۆنراوە، کە دەڵێت ئەگەر کیژێك لە شەوی جەژنی سن ئاگینسدا بە زمانی بەرۆژووەوە بچێتە ناو جێ، ئەوا لە خەونیدا مێردی ئایندەی دەبینێ.

کیتس چامەیەکی زۆر جووانی داناوە بە ناوی (خاتوونی جوانی بێ بەزەیی ١٨١٩) و باشترین چامەی ئینگلیزییە، چیرۆکی ئەم بەرهەمە دەربارەی سوار چاکێکە کە لە خەوندا خاتوونی جوانی خۆی دەبینێ، بەڵام کە بێدار دەبێتەوە خۆی لەسەر گردێکی سارد و سڕدا دەبینێتەوە، کیتس زۆر قەسیدەی جوانی نووسیوە کە نیشانەی باوەڕی ئەون بە جوانی، بە باوەڕی کیتس، کە ئەویان بە (پەیامبەری جوانی) لە قەڵەم داوە، جوانی و حەقیقەت تاقە سەر چاوەی شادییەکانە، هەندێ لە قەسیدە بەرزەکانی کیتس بریتین لە:

(قەسیدەیەك بۆ بولبول)، (قەسیدەیەك بۆ ماخولیا) و (قەسیدەیەك بۆ پاین).

نامەکانی کیتسش لە رووی روانینی شیعری و فەلسەفییەوە شایانی بایەخ و سەرنجن، بە کورتی شیعرەکانی کیتس لە بەرزترین چامە و غەزەلیاتەکانی زمانی ئینگلیزین، هەروەها نامەکانیشی کە هەوێنی قەسیدە و شیعرەکانی ئەویان تێدایە، لە بواری خۆیاندا بە شاکار دێنە ژماردن.

## ٩٧- وليام شكسپير

### ١٥٦٤-١٦١٦

سەرقافڵەی شاعیران و شانۆنامەنووسانی هەموو سەردەم و رۆژگاران، لە خێزانێکی بازرگان، لە شاری جوانی (سترانفورد ئۆن ئەڤۆن) هاتۆتە دنیاوە. زانیارییەکی ئەوتۆ دەربارەی ژیانی ئەو لەبەر دەستدا نییە. هەر لە زێدی خۆی چووەتە بەر خوێندن، لاتینی و کەمێك یۆنانی فێربووە. رەنگە بۆ ماوەیەکیش موعەلیمایەتی کردبێ.

شەکسپیر لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا (١٥٨٢) زەماوەندی لەگەڵ ژنێکدا کردووە کە هەشت ساڵ لەخۆی گەورەتر بووە، لە ساڵی (١٥٨٥)دا بە عەشقی شانۆوە رووی کردووەتە لەندەن. لە ساڵی ١٥٩٤دا پەیوەندی بە (گروپی ئەکتەرانی لۆرد چەمبرلین)ەوە کردووە، کە یەکێك بوو لە گروپە شانۆییە هەرە بەناوبانگەکان. لە ساڵی ١٥٩٧دا لە شاری ستراتفوردا موڵکێکی گەورەی کڕی. لە ساڵی ١٥٩٩دا بوو بە سەهمدارێکی تەمەشاخانەی تازە بونیادی گلوب، کە پێگەی گروپی لورد چەمبرلن بوو و بەرە بەرە بوو بە ناودارترین شانۆی سەردەم. ئیدی لەم شانۆیەدا ژمارەیەك لە نێودارترین دراماکانی شەکسپیر هاتە نمایش کردن و پیشاندان، ئیدی لەمەوە سەروەت و سامانێکی زۆری کۆکردەوە.

شەکسپیر لە ساڵی ١٥٩٢دا لە بواری درامانووسی و ئەکتەریدا تەواو بەنێوبانگ بوو. یەکەمین بەرهەمێن چاپکراوی شەکسپیر چیرۆکی شیعری (ڤینوس و ئەدۆنیس- ١٥٩٣) و (دەستدرێژی بۆ سەر لۆکریس-١٥٩٤)بوو. شەکسپیر لەو کاتەوە تا ساڵی ١٦١٣ کە لە ستراتفورد گیرسایەوە، زنجیرە شانۆنامەیەکی نووسی کە بە گەورەترین درامای جیهان دەژمێردرێن پێدەچێت یەکەمین بەرهەمێن شەکسپیر هەندێ لە شانۆنامە مێژوویەکانی بووبێ، وەکو (هنری شەشەم کە ٣ بەشە، ١٥٩٠-١٥٩٢) شەکسپیر لە شانۆنامە مێژووییەکانی دواتریدا، وەکو (ریچاردی سێیەم-١٥٩٣، و ریچاردی دووەم ١٥٩٥)، تەواو بەسەر هونەری خۆیدا زاڵ بووە. یەکەمین تراژیدی شەکسپیر، (تیتوس ئەندرونیکۆس. ١٥٩٠-١٥٩٢) بووە. (رۆمیۆ و ژولیێت-١٥٩٦) یەکەمین تراژیدی زنجیرە تراژیدییە گەورەکانی بووە. تیمەی ئەو چیرۆکە کە ئاشقێنییەکی نایاب و غەمئامێز دەگێڕێتەوە لە سەرانسەری جیهاندا مەنشوورە. لەم تراژیدییەدا، مەرگی دوو ئاشق، کە لە دووماڵباتی دژمنن، تاقە رێگەی هەڵاتنە لە

واقیعی پڕ نائومێدی ئەوان. یەکەمین کۆمیدی شەکسپیر (کومیدی هەڵەکانە- کە لە دەورووبەری ١٥٩٤) بڵاو بووەتەوە. بابەتی ئەم شانۆنامەیە بە دەوری لێکچوونی سەیری دوو کوڕی جمکانە بە دوو خزمەتکاری لفانەی ئەو دوو کوڕەو ئەو هەڵەو بەدحاڵی بوونانەی لەم لێکچوونەوە دروست بوون، بە دەوری ئەو هەموو باباتەدا دەسووڕێتەوە. دوو کۆمیدی باشتری شەکسپیر بریتین لە: "دوو جەنتڵمانی ڤیرۆنا-١٥٩٢ و رەنج بێوەری خۆشەویستی -١٥٩٤". شەکسپیر لە ساڵی ١٥٩٤وە تا کۆتایی ئەو سەدەیە درەخشانترین کۆمیدییەکانی دەنووسێت: "رامکردنی شنی سەرکێش-١٥٩٤، خەونی شەوی نیوەی هاوین-١٥٩٥، بازرگانی ڤینیس ١٥٩٦، هەرچۆنت بوێ-١٥٩٩، چەنەچەنێکی زۆر لە پێناوی هیچ دا-١٥٩٩، ژنانی سەرخۆشی و نیزۆر-١٥٩٧-١٦٠٠، شەوی دوازدەیەم-١٥٩٩) شەکسپیر، باشترین شانۆنامە مێژووییەکانی خۆی واتە: (هنری چوارەم کە دوو بەشە لە نێوان ساڵانی ١٥٩٧-١٥٩٨، هنری پێنجەم-١٥٩٨ و ریچاردی دووەم -١٥٩٥) لە ساڵانی ١٥٩٤وە تا کۆتایی ئەو سەدەیە نووسیوە، لە هنری چوارەمدا، کەسایەتی کۆمیدی دێوئاسا، واتە سێرجۆن فالستاف، بە خەڵکی دنیا دەناسێنێ. ئەم کەسایەتییە نە ماڵە فشەکەرە، کە لە کۆمیدیای ژنانی سەرخۆشی و نیزۆر)ش دا دەردەکەوێ بە نێودارترین سیمای کۆمێك لە ئەدەبیاتی دراماتیکدا دەژمێردرێ.

قۆناغی داهێنانی تراژیدیا گەورەکانی شەکسپیر بە (یولیوس قەیسەر-١٥٩٩-١٦٠٠) دەست پێدەکات. ئەم تراژیدیایە، کە یەکێکە لە باشترین شانۆنامەکانی شەکسپیر، پیلان دژی یولیوس قەیسەر و کوشتنی ئەوو، شکستی پیلانگێڕان لە لایەن مارك ئانتونی سەرداری رۆمییەوە وێنە دەگرێ و بەرجەستە دەکات. شاقارەمانی تراژیدیاکە بروتوس-ە کە لە پیلانی کوشتنی قەیسەردا پەیوەندی بە دەسیسەکارانەوە دەکات. بە هەرحاڵ، شەکسپیر لە نێوان ساڵانی ١٦٠٠-١٩٠٦دا بەناوبانگترین تراژیدییەکانی خۆی دەنووسێت.

هاملیت-١٦٠١ یەکێکە لە ناودارترین شانۆنامەکانی شەکسپیر و جوانترین درامای ئەدەبیاتی جیهانە. هاملیت، شازادەی دانیمارك، پاش مەرگی بابی تاجداری گیرۆدەی جۆرە ماخولیایەك دەبێ. بەگومانی ئەو، کلاودیوس-ی مامی کە دایکی مارە کردۆتەوەو بووە بە پاشا، بکوژی باوکیەتی. تاپۆی بابی هاملیت-ش دێتە بەرچاوی و پێی دەڵێت کە کلاودیوس بکوژییەتی. هاملیت دەکەوێتە بیری تۆڵە ئەستاندنەوە. بەڵام لە فکران رۆدەچێت و دەکەوێتە دوو دڵییەکی کوشندەوە. زۆر بیر

دەکاتــەوە بــەڵام ناتوانێــت دەســت بــە هــیچ کارێــك بکــات. رازو نهــێنی مەزنایــەتی شانۆنامەکەش لە سروشتی غەریب و هزرمەندانەی ئەودایە کە زیاتر خوو خەسڵەتی فەلسەفی و جەدەلیانەی هەیە تا هەڵچوون و جم و جۆڵ.

(ئۆتیللو-١٦٠٤). وەکو تراژیدیای هاملیت، پشکنینێکی قووڵی روحی مرۆڤانییە. ئەم شانۆنامەیە سەربوورى ئۆتیللوى زەنگی مەغریبی، فەرماندەی دلاوەری قۆشەنی ڤینـز لـە قـوبرس دا، و دیزدەمۆنـای هاوسـەری جـوانی دەگێڕێتـەوە. ئوتیللـو، پلـەی کاسیو، عەسکەری فلورەنسی بەرز دەکاتـەوەو بـەبێ ئـەوەی مەبەسـتی بێ یـان پـێ بزانێ دژمنایەتی و حەسوودی یاگۆی سەربازی پیر و شەڕانی دەورژێنێ. یاگۆ بە درۆوە خەبەر بە ئۆتیللو دەدات کە گوایە کاسیۆ و دیزدەموونا پەیوەندی ئاشقێنیان هەیـە. ئوتیللـو کـە گـوێی لـەم قسـەی دەبێـت بـاوەڕ دەکـات و دیزەموونـا دەکوژێـت. ئۆتیللو کاتێ پەی بە هەڵە سامناکەکەی خۆی دەبات، داوا دەکات کە وەکو پیاوێك کە "نەك ئاقڵ، بەڵکو زۆر ئاشق بوو" یادی بکەنەوەو خۆی دەکوژێت.

(شالیر-١٦٠١). شەکسپیر لـەم کـارەدا، کـە هەنـدێك بـە گـەورەترین تراژیـدیای ئـەوی دەزانن، دەچێتە قولایی روحی بەشەرەوە. شالیر، شـای پیر و مانـدووی بریتانیا کـە شـەیدای ریـایی و ماسـتاو ساردکردنەوەیە، قەڵـەمڕەوی حکومەتەکـەی بـە دوو کیـژە شـەڕانی و ماستاوچییەکەی خـۆی دەبەخشـێت، ئـەم دوو کیـژە لـە وەتـەن و مـاڵ و لانەی خۆی وەدەری دەنەن.

(مـاکبێس-١٦٠٦) کـورتترین شـانۆنامەی شەکسـپیرە، و خوێندنەوەیـەکی قـووڵی مەسەلەی ترسە. شاقارەمانی دراماکە، ماکبیسە کە سێ سیحرباز پێشبینی ئەوەیان بـۆ کـردووە کـە لـە ئاینـدەدا دەبێـت بـە شـای سـکۆتلەندا. مـاکبیس لێـدەبڕێ تـا بـە کۆمەکی چارەنووس و قەدەر بگاتـە پاشایەتی. بـە کۆمـەکی هاوسـەرەکەی نامەردانـە پاشا دەکوژێ. بەڵام رەنگی خوێن بە هیچ جۆرێ لە دەستی ئـەو و ژنەکـەی نابێتـەوە، سەرەنجام ئەو خوێنە یەخەی ئەو دووانە دەگرێت.

(ئـانتۆنی و کیلوپـاترا-١٦٠٧) تراژیدیایـەکی دیـاری دیکـەی شەکسـپیرە، دەربـارەی خۆشەویستی نێوان ئانتۆنی سەرداری رومی و کیلۆپاترای شابانۆی میسرە.

(کۆریولانوس-١٦٠٨) حیکایەتی ئەم تراژیدیایـە دەربارەی  ژیـان و مـەرگی کـایوس مـاریوس کۆریولانـوس-ی فەرمانـدەی لـەخۆبایی رومییـە کـە ئاقیبـەت بـە هـۆی ئـەو غرووورەوە دەکوژرێ..

کۆریولانوس و تیمون ئەسینی-١٦٠٨) بە دوا تراژیدیای شەکسپیر دێتە ژماردن.

هەندێ لە شانۆنامەکانی شەکسپیر کە لە نێوان سالآنی ١٦٠٠-١٦٠٩دا نووسراون بریتین لە : شانۆنامەی تەنزئامێز ترویلوس و کرسیدا -١٦٠١، دوو کۆمیدیای رەش بەناونیشانی: ئەو شتە خۆشە کە ئەنجامی خۆش بیّ- ١٦٠٢، پاداشتی بەردهاوێژ بەردە-١٦٠٤).

دوایەمین شانۆنامەکانی شەکسپیر بریتین لە دوو کۆمیدیای رۆمانسی و دڵگیری: چیرۆکی زستان- ١٦١١، و گەرداو ١٦١٢) کە گەرداو لە راستیدا دوا شانۆنامەی شەکسپیرە.

شەکسپیر بەو ٣٨شانۆنامەیەی کە لەبەر رۆشنایی بلیمەتی عەجیبی خۆیدا نووسیوونی، بۆ هەتا هەتایە پلەی گەورەترین درامانووسی جیهانی بەدەست هێناوە. ئەمە جگە لەوەی کە شیعرە گەرم و پڕ جۆشەکانی ناو دراماکانی لە ریزی جوانترین هۆنراوەێن زمانی ئینگلیزیدا دادەنرێن. لە راستیدا شەکسپیر یەکێکە لە گەورەترین شاعیرانی لیریکی. غەزەلیاتەکانی (سۆناتاکانی) کە هەمووی دەکاتە ١٥٤ غەزەل و لە سالآنی ١٥٩٣-١٦٠١دا نووسراون، لە بواری خۆیاندا، لە غەزەلیاتە هەرە جوانەکانی جیهانن. تایبەتمەندی ئەم غەزەلانە، کە دەربڕی زەوقی موعجیزە ئاسای مۆسیقایی شەکسپیرن، توانای دەربڕینی ئەندێشەی نایاب و هەستی ناسك و قووڵی هاوسۆزییە.

شەکپیر سیمای تەواوەتی مرۆڤپەروەری رینیسانسە. هاوسۆزیی قووڵی لەگەڵ مرۆڤایەتی دا، ئەوەی گەیاندووەتە ناخی روحی قارەمانانی دراماکانی، تواناو بەهرەی بیّ نەزیری لە شیعردا، نەمری بە ژنان و پیاوانی ناو شانۆنامەکانی بەخشیوە.

## ٩٨- شارلۆت برونته

**١٨١٦-١٨٥٥**

**برونتـه، نـاوی ماڵبـاتێکی ئینگلیـزی ئیرلەنـدی نـەژادە کـە لـە سـەدەی نـۆزدەدا سـێ ڕۆمـاننووس لـەو ماڵباتـەدا هەڵکـەوتوون ئـەم سیانە کـە ناویـان شـارلوت. ئیمیلـی و ئاتنە لە گوندی هاۆرت لە یورکشایر لە ژینگەیەکی ئایینی و هەژار گەورە بوون هـەر لــە منداڵییــەوە لــەناو خــەون و خەیاڵانــدا گــەورە بــوون. شــارلوت و ئیمیلــی لــە قوتابخانەیەکی ئایینی دەرسیان خوێندووە، بۆ ماوەیەك کاری مامۆستاییان کرد و لە ساڵی ١٨٤٢دا چوون بۆ برۆکسیل و درێژەیان بە خوێندنی خۆیان دا.**

**یەکەمین ڕۆمانی شارلۆت بەناوی (پرۆفیسۆر ١٨٥٧) بوو کە بە دەوری تەوری ژیـانی بەڕێوەبەرێکی قوتابخانە لە برۆکسیلدا دەسووڕێتەوە. شارلۆت پاش ئەم ڕۆمانـە، کـە بۆ چاپ و بڵاو کردنـەوەی لـە هـەموو دەرگایـەکی دا، (جین ئیر ١٨٤٧)ی نووسـی و شۆرەتێکی نەمری پێ وەرگرت. شارلۆت لەم ڕۆمانە دڵگیر و خەیاڵنەنگێزەدا کە سەر بهـوردی کچـۆڵەیەکی هـەتیو وێنـەی دەگـرێ، بـە شـێوەیەکی ڕۆمـانتیکی ئاوێتـە بـە واقیعگـەرایی ژنانــە، هەنــدێ لایــەنی تاریــك و غــەمباری دنیــای خــودی خۆیشــی گێڕاوەتەوە. سێیەم ڕۆمانی شارلۆت (شیرلی-١٨٤٩)یـە کـە ڕووداوەکـانی دەربـارەی یورکشـایری دوا سـاڵانی سـەردەمی شـەڕەکانی نـاپلیۆن و دەربـارەی سـەنعەتی کـە سـادی خورییــە. دوا ڕۆمــانی شــارلۆت (ڤیلیــت-١٨٥٣)یــە، باســی ئەزموونــەکانی خۆیەتی لە برۆکسیل.**

## ٩٩- ئیمیلی برۆنته

### ١٨١٨-١٨٤٨

خوێنەران و شارەزایان ئیمیلی ئیمیلی بە بەهرەمەندتر دەزانن لە خوشکەکانی دیکە. دەگەڕێتەوە بە رۆمانە درەخشانەکەی و (بەرزاییە باگرەکان-١٨٤٧) کە تا رۆژگاری ئەمڕۆش لە بەرهەمە کلاسیکییە بازاڕ گەرمەکانی، بە شارێکی گەورە لە قەڵەم دەدرێ. بریتییە لە سەربهورد و چیرۆکی شەهوەتێکی دێوئاسا کە نەوەیەك هەڵدەوەشێت، چیرۆکی گوراوێکی ناحەزی ناقۆڵایە بە عەشقێکی شەهوانی سامناکەوە.

## ١٠٠- ئانن برونته

### ١٨٢٠-١٨٤٩

بچـووكترين كيــژی ماڵبــاتی بەدبــەختی برونتــە بــوو، كــە بەهرەيــەكی ئەوەنــدە درەخشانيشی نەبوو. دوو رۆمانی بە ناوێن (ئاگنيس گری-١٨٤٧) و (وايلدفل هالی كرێچـی-١٨٤٨) نووسـيوە كـە لـە رۆژگـاری ئـەمڕۆدا تەقريبـەن لـەبير چـوونەتەوە. رۆمانی يەكەم، حيكايەت و سەرگوزشتەی ژيانی ئافرەتێكی مامۆستای تەنيايە كە بە ياريـدەری كەشـيش ناوچـەيەك دەزەوجـێ، رۆمـانی دووەمـی دەربـارەی مێردێكـی دەست بڵاوی ئەهلی عەيش و نۆش و رابواردنە.

## ١٠١-ئۆسكار (فینگال ئۆفلا هیرتی ویلز) وایلد
## ١٨٥٤-١٩٠٠

رۆماننووس، شاعیر و درامانووسی ئیرلەندی، لە دوبلین لە خانەوادەی دکتۆرێکی بەناوبانگی چاو، هاتۆتە دنیاوە. ماوەیەك لە کۆلێژی ترینتی خوێندوویەتی، پاشان چووەتە ئۆکسفۆرد. لەو قۆناغەدا بەدیارترین خوێندکارانی ئەدەبیاتی کلاسیك دەژمێردرا، لەسەر شیعری "راڤیننا" خەلاتی ینیودیگەیت-ی ١٨٧٨) وەرگرت. لەم قۆناغەدا بوو بە یەکێك لە موریدانی والتەر پاتەری رەخنەگری ئینگلیزی و کەوتە بانگەشە بۆ فەلسەفەی جوانیناسی ئەو (کە باوەڕی وابوو هونەر و جوانیناسی یەکێکە لە ئامانجەکانی ژیان"، وایلد پاش تەواوکردنی خوێندن چوو بۆ لەندەن و لەبەر رۆشنایی رۆحی یاخی، تەبیعەتی هەستیار، دەربڕینی دڵگیر، زەوقی ناسك و شەیدایی خۆی بۆ هونەر و جوانیناسی زۆر زۆر شۆرەتی بەدەست هێناو وەکو پەیامبەری جوانی و پەرستی و رێبەری راپەڕینی جوانیناسی کە لایەنداری لە تیۆری هونەر بۆ هونەر دەکرد، هاتە ناسین. بە تیۆری جوانیناسی خۆی لە ئەدەبیات و هونەردا، شۆرەتێکی بەرپا کرد. تەنانەت لە ژیانی تایبەتی خۆی و جل لە بەر کردنیشدا شۆڕشێکی بەرپا کرد. قژی درێژ و شانە کراو، جلی سەیر و نائاسایی لەبەر دەکرد، هەمیشە لە دووی مۆدەی جوانی و پچڕینی زنجیری داب و نەریتیانی باو بوو.

وایلد لە ساڵی ١٨٨١دا شیعرەکانی کۆ کردنەوە بەناوی (شیعران) و لە بەرگێکی یەجگار جواندا بلاوی کردەوە. ساڵی دواتر لەلایەن ئەمریکاییەکانەوە دەعوەت کرا بۆ کۆڕێك و چوو بۆ ئەمریکا. ئەم سەفەرە هێندەی دیکە شۆرەتی بە وایلد بەخشی. پاش گەڕانەوەی بۆ ئینگلستان بە جۆش و خرۆشەوە کەوتە وتار نووسین و چیرۆك بلاو کردنەوە. لە ساڵی ١٨٨٤دا کۆمەڵە حیکایەتێکی بەناوی (شازادەی خۆشحاڵ) و لە ساڵی ١٨٩١دا کۆمەڵێکی دیکەی بەناوی (عەماری هەنار) بلاو کردەوە. لە هەمان ساڵدا زنجیرە وتارێکی رەخنەیی جوانی بەناوی (تەسەورات-وێناکان) و شاکارە نەمرەکەی خۆی (وێنەی دووریان گری) چاپ و بلاو کردەوە وایلد لە پێشەکی ئەو رۆمانە گەورەیەدا، بیروبۆچوونی خۆی لە مەڕ هونەر و هونەرمەندان و جوانی و بەرهەمێن ئەخلاقی بە راشکاوی و بێ گوێدان بە داب و نەریتی نەتەوەیی و گیانی موحافەزەکارانەی ئینگلیزییان دەردەبڕی:

- ئاشکراکردنی هونەر و پەنهان کردنی هونەرمەند، مەبەستی هونەرە.
- هونەرمەند ئافەرێنەری جوانییانە.
- بیرو زمان، بەلای هونەرمەندەوە ئەوزاری هونەرە.
- پیسی و پاکی، لای هونەرمەند بابەتی هونەرە.
- شتێك نییە بەناوی کتێبی ئەخلاقی و نووسینی پێچەوانەی ئەخلاق. کتێبان یا باش نووسراون یا خراپ. و تەواو بڕایەوە.

(وێنەی دووریان گری) بەو پێشەکییەوە بووە مایەی ڕەخنەو ناڕەزایی مامۆستایانی ئەخلاق و ووشکە دینداران، و بۆغز و کینەیەکی زۆری سەبارەت بە وایلد ورۆژاند، بەلام ئەو بیّ گوێدان بە هیچ شتێك سەرگەرمی کاری نووسینی خۆی بوو.

وایلد لە سالّی ١٨٩٢دا کۆمیدیای ڕەخنەیی کۆمەلایەتی (باوەشێنەکەی خانم و وێندەر میر)ی بلاو کردەوەو سەرکەوتنێکی سەیری بەدەست هێنا. لە سالّی ١٨٩٣دا دوو شانۆنامەی (ژنی بیّ بایەخ، و سالومە)ی بە فەرەنسی بلاو کردەوەو ئەوپەڕی وەستایی و ناسکی زەوقی خۆی ئاشکرا کرد. سەرەنجام، لە سالّی ١٨٩٥دا شانۆنامەی (مێردی دلّخواز، و بایەخی جددی بوون)ی بلاو کردەوەو بەم کارە تەنز و توانج پۆشی و شۆختەبعی و زیندوویەتی بۆ کۆمیدیای ئینگلیزی گێڕایەوەو دووبارە گەرمی بۆ ئەو شانۆیانە گێڕایەوەو کە سالانێکی دوور و درێژ بوو دامرکابوونەوە. (بایەخی جددی بوون) کە شاکاری وایلدە، بە نوکتە چزودارەکانی و تەنزە پڕ تەوسەکانی دەربارەی ئورستوکراتان و ڕۆحیانیانی ئینگلیزی، هەراو هەنگامەیەکی زۆری نایەوەو وایلدی گەیاندە ئەوپەڕی شۆرەت و خۆشەویستی.

بەلام سالّی لوتکەی سەرکەوتنی وایلد سالّی زەلیلی و هاتنە خوارەوەشی بوو. بە هۆی بلیمەتی درەخشانی خۆی، کە ئاوێتەیەك بوو لە زەوقی ناسك و شیرین زمانی و شۆخ تەبیعەتی و دەربڕینی و جوان و سروشتی هەستیار و هاڕوژاو، بوغز و کینەی حەسودانی لەخۆی وڕوژاندبوو. لە بەرهەمەکانیشیدا، کە پڕ بوون لە ڕاشکاوی و شۆخی چزودار و ڕەخنەی ڕاستەوخۆ و گالّتەجاڕی توند و تیژ، کۆمەلّێك دژمن و ناحەزی بۆخۆی پەیدا کردبوو. ئەمە جگە لەوەی کە بە پێچەوانە شەپۆلی ئاوەوە مەلەی دەکرد و داب و نەریت و کاروباری کۆمەلایەتی کۆن و کۆت و زنجیری دەورووبەر و ڕۆژگار و پەیوەندی ئەخلاقی نەتەوەیی

**دابووه بەر تەوس و توانج و گاڵتەی بە هەموو ئەو شتانە دەهات. بۆیە وایڵد بە هەتیوبازی تۆمەتبار کرا، لە لایەن دەزگای دادڤانییەوە راکێشرایە بەر دادگاو و بە دوو ساڵ حەپس و کاری دژوار (١٨٩٥-١٨٩٧) حوکمدرا. وایڵد لە زینداندا راستگۆیانەترین بەرهەمی خۆی (چامەی ریدینگ گول)ی نووسیوە کە یەکپارچە هەست و سۆز و مرۆڤپەروەری یە.**

**وایڵد پاش بەربوون لە زیندان، لە کاتێکدا لە باری جەستەیی و دەروونییەوە تەواو تێکشکابوو، بەناوی نهێنی (سباستیان ملموت) چوو بۆ پاریس و تا رۆژی مردنی بە هەژاری و نائومێدی و دەربەدەری.**

## ١٠٢- سۆلجنستین

-١٩١٨

رۆمـاننووس و شانۆنامەنووسـێکی نـاوداری روسـییە، لـە سـاڵی ١٩٦٢ رۆمـانی "رۆژێك لە ژیانی ئیڤان دینیوفیش"ی بڵاوکردەوە. ئەم رۆمانە دژی ستالینیەت بوو. هـەرزوو لـە سەرانسـەری یـەکێتیی سـۆڤیەتدا ناوبـانگ و شـۆرەتی پەیـدا کـرد. زۆر بەرهـەمی دیکـەی هەیە لەوانـە:"بازنـەی یەکـەم، ئـاب ١٩١٤" هـەموو بەرهـەمـەکانی لـە سـاڵی ١٩٦٦ بـەدواوە لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکادا بـڵاو بوونەتـەوەو لـە روسیادا بڵاو نەبوونەتەوە. هەڵبەتە بەرهەمـەکانی فرۆشی باشیان هـەبووە. رۆمانی (ئاب)کـەی لـە سـاڵی ١٩٧٢دا، لـە ئـەمریکا تەرجەمـە کـراوە، رۆمـانێکی گریمانەییـە دەربـارەی بەشـداری کردنـی روسـیا لـە یەکـەم جـەنگی جیهانیـدا. ئـەم رۆمانـە لـە ئاسـتێکی وەهـادا بـوو کـە لەگـەڵ شەکسـپیر و تۆلسـتویدا بـەراورد دەکـرا. لـە پـاش جـەنگ هاتـە حـەپس کـردن، چـونکە هێرشـی کردبـووە سـەر سـتالین. رۆمـاننووس تاکیدی لەسەر سیستەمی حەپسخانانی سۆڤیەتی کردووە، بە شێوازێکی کارامـەی دەوڵەمەند و قوڵییەکی مرۆڤدۆستانە دەربارەی نووسیوە. شێوازێکی ئـەوتۆ کـە زۆر کـەس بـە یـەکێك لـە نووسـەرە پێشـەنگەکانی سـەردەمی خـۆی بـزانن لـە یـەکێتیی سـۆڤیەتدا. لـە سـاڵی ١٩٦٩دا لـە یـەکێتیی نووسـەرانی سـۆڤیەت دەرکـرا، چـونکە بەرهەمەکانی لە هەندەران بڵاو کردبووەوە، هەروەها لەبەر ئـەو بیرو بـاوەڕ لیبرالییـەی کە لە بەرهەمەکانیدا رەنگی دابووەوە. لە ساڵی ١٩٧٠دا خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت، و لە ووتەیەکدا بەو بۆنەیەوە ئەوەی دووپات کردەوە کە :"حەقیقەت نایەتە پارچە پارچە کردن و چەمکی ئەدەبی جیهانی تاقە دڵێکی گەورەیە کە بۆ ئاوات و کارەساتەکانی ئەم جیهانە لێدەدا."

## ١٠٣- جۆزیف کونراد

١٨٥٧-١٩٢٤

ئەم پیاوە رۆماننووس و چیرۆکنووس بوو. لە ساڵی ١٨٥٧دا لە تیودری ئۆکرانیای روسیادا لەدایك بووە. داك و بابی لە ئەسلّا پۆڵەندین. لە ساڵی ١٨٧٤دا سواری کەشتییەکی فەرەنسی بوو و دەستی دایە کاری دەریاوانی و ئەم کارە بیست ساڵێکی خایاند. لە یەکەم دە ساڵی ئەو کارەیدا فێری زمانی ئینگلیزی بوو و ئەو زمانەی لە هەموو نووسین و بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا بە کارامەیی بەکار هێنا. لە ساڵی ١٨٨٤دا بۆ یەکەمجار وەکو کابتن بەناو دەریاو گەشتی دەریاوانی کەوت. پاش دە ساڵان خانەنشین بوو. یەکەم رۆمانی بەناوی (کەوجێتی مایر) لە ساڵی ١٨٩٥دا بلاو کردەوە پاش ئەوە زنجیرەیەك رۆمانی دی بلاوکردەوە لەوانە: (نەفیکراوانی دوڕگەکان-١٨٩٦، زەنگییەکانی نارسیسیون-١٨٩٨، لۆرد جیم-١٩٠٠، لاوان ١٩٠٢، گەرداو ١٩٠٣، کاری نهێنی-١٩٠٧، بەخت-١٩١٣، سەرکەوتن-١٩١٥، زێڕ-١٩١٩، دزانی دەریایی-١٩٢٣، ئەمە جگە لە چەندین کتێبی هەمەجۆری کورتە چیرۆك و ئۆتۆبیوگرافییەك کە لە ساڵی ١٩١٢دا لە شینگلتەرا بەناوی "هەندێ بیرەوەرییان" و لە ئەمریکادا بەناوی "تۆمارێکی تایبەتی" بلاو بووەوە.

چیرۆکەکانی رەنگدانەوەی ئەزموونە میلۆدرامییەکانی خۆیەتی لەناو دەریا، هەروەها رەنگدانەوەی گەشت و سەفەرەکانیەتی بۆ هەندەران و وولاتانی بیانی، هەڵبەتە لەم کار و بەرهەمانەیدا زۆر رۆمانسی دەنوێنێ. نووسەرێکی یەجگار بەتوانا بووە لە خوڵقاندن و ئەفراندنی هاماجی چیرۆکدا، ئیدی چ گەرداوی دەریا بووبێ یان تەم و مژی بێشەو دارستانان بووبێ، جا ئەو مەسەلەیەی زۆر بە تێر و تەسەلی و وردییەوە، وەکو هەر نووسەرێکی واقیعی، چارەسەر و مالیجە کردووە دیارە ئەم نووسەرە جۆرێك لە پەرش و بلاوی دەرونی هەبووەو هەموو رووداوەکانی لە میانی بارە دەرونییەکەی خۆیەوە دیتووە، ئەمەش جۆرە تەنیاییەکی لەلا دروست کردووە، هەر بۆیە دەبینین هەموو کاراکتەر و قارەمانەکانی دووچاری هەستکردن بە گۆشەگیری و تەنیایی بوون، و بە عەزرەتی هۆگری و دۆستایەتییەوە بوون و زیاتر خەڵکی نامراد بوون

## ١٠٤-ئالكسی تولستوی

١٨٧٥-١٨١٧

گراف ئالكسی كانستا نتینوفیچ تولستوی له شاری پوترزبۆرگ هاتۆته دنیاوه و خزمایەتییەكی دووری لەگەڵ لیوتولستۆی كەڵە نووسەردا هەبووە. لە پایتەخت خوێندوویەتی و پاشان له دەرباردا دامەزراو له دۆستانی تزار نیكۆلای دووەم بوو، له ساڵی ١٨٥٤دا یەكەمین شیعری خۆی بڵاو كردۆتەوە. شۆرەت و نێوبانگی ئالكسی تولستوی زیاتر بەو سێ درامایەوە بوو كە لە مێژووی روسیاوە هەڵیهێنجاون واتە: "مەرگی ئیڤانی سامناك" و "تزارفیودور ئیڤانوفیچ" و "تزار باریس" هەروەها نۆڤڵێكیشی دەربارەی سەردەم و قۆناغی ئیڤانی سامناك نووسیوە. هەروەها له غەزەل خوانی و شیعر گاڵتە ئامێزدا دەستی هەبوووەو لەو وارەدا وەستای تەواو بووە.

ئالكسی تولستۆی لە سێ دراماكەی خۆیدا بەتەواوەتی هەقیقەتی مێژووی روسیا ڕەچاو كردووە و هەموو دیمەنە رەشەكانی رۆژگاری دیكتاتۆریەتی روسیا بە جوانی نیشان دەدات بەڵام قارەمانەكانی، یان زۆربەی قارەمانەكانی خودانی خەسڵەتی بەرجەستە نین و درێژدادڕی دەقەكان زیاتر بینەر و گوێگران ماندوو دەكەن. یەكێك لە دراماكانی دیكەی ئالكسی تولستوی "دۆن جوان"ە كە بە یادی مۆزارتی مۆسیقاسازی بەناوبانگ و هوفمانی ئەڵمانی نوسراوەو لاسایی كردنەوەیەكی سادەی فاوستی گۆتەیە.

## ١٠٥- نیكولای ئەلكیسیفچ نیكراسۆف
### ١٨٧٧-١٨٢١

نیكولای ئەلكیسیفچ نیكراسۆف لە كەناری روباری فۆڵگا لە دەڤەری یارو سلاڤل، كە بابی لە سەربازگەكەی ئەوێندەر ماموریەتی سوپایی لە ئەستۆ بوو. لەدایك بووە. دایكی هۆڵەندی بوو، ناوی شۆرەت و خانەوادەیی زاكروسكا بوو. لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا چوو بۆ پترزبۆرگ و بابی نایە بەر قوتابخانەی سوپایی، بەڵام چونكە تەبیعەتی لەگەڵ ئەم كارەدا نەدەگونجا نەچوو بۆ قوتابخانەی ناوبراو. دەیویست بچێتە دانشگە. بابی بەم كارە رازی نەبوو، جا بۆ ئەوەی تەمێی بكات و سزای بدات، هەموو مەعاش و موچە و كۆمەكێكی لێبڕی و نیكراسۆف دووچاری دەستكورتییەكی دژوار هات. بەڵام چونكە لە مەسەلەی خۆیبوون و ئازاو سروشتیدا چوو بووەوە سەر دایكی لە ساڵی ١٨٣٨دا دەفتەری شیعرەكانی هەڵگرت و رێی پایتەختی گرتەبەر. ماوەیەك بەوپەڕی دژواری ژیانی گوزەراند و زۆربەی رۆژانی ژیانی بە برسێتی و سەرما لە ژێر زەمینێكی ساردا دەبردە سەر و تەنانەت بۆ نووسینی شیعریش لەسەر زەوی رادەكشا، چونكە مێز و كورسییەكی نەبوو ئەو كارەی لەسەر بكات. بۆ گوزەران و ژیانی خۆی رووی لە هەموو كەس و شوێنی دەناو دەكرد، شیعری بەم و بەودا هەڵدەگوت و تەنانەت شانۆنامەی شیعریشی رێكدەخست و كرێیەكی كەمی لەسەر وەردەگرت. ئەنجام یەكەمین كۆمەڵە شیعری، كە لە منداڵییەوە دەستی بە نووسینیان كردبوو، لە ساڵی ١٨٣٩دا بەناونیشانی "بانگ و ئارەزووان" بڵاو بووەوە. هەڵبەتە چ شاكارێك لەنێو ئەو كۆمەڵە شیعرەدا بەدی نەدەكرا، زیاتر لاسایی كردنەوەی هەندێ شاعیری رۆمانتیكی بوو كە پاشان لەم كارەی ژێوان بووەوەو لە بازاڕدا نوسخەكانی دەكڕییەوەو لەنێوی دەبرد.

بیلینسكی، لە ساڵی ١٨٤٢دا ڕێی دا كە هاتوچۆی ئەنجومەنە ئەدەبییەكەی ئەو بكات، ئەمە كاریگەرییەكی زۆری لەسەر نەش و نماو پەروەردەی بەهرەیی شاعیری نیكراسۆف هەبوو، و ژیانی مادديشی رۆژ بەرۆژ بەرەو باشتر دەچوو. هەرچەندە نیكراسۆف زۆری نەخوێندبوو بەڵام زەوقێكی پڕ و بەهرەیەكی بێداری هەبوو و زۆر ئاشنای بیر و بۆچوونەكانی بیلینسكی بوو و بەرە بەرە ئەو بیرە شۆڕشگێڕییانە

لەوێشدا ریشەی داکوتاو شیعرەکانی خۆی وەقفی ئەو بابەتە هەستیارانەی ئەو رۆژگارە کرد. لەو رۆژگارەدا پێی وابوو کە تا ئازادی گوندییانی کۆیلە دابین نەکرێ، دیموکراسی ناچەسپێ. بۆیە لە شیعرەکانی خۆیدا ئەوپەڕی دڵسۆزی و هاوخەمی دەربارەی ئەوان دەردەبڕی و زۆر شاکاری لەم رووەوە بەرهەم هێناوە، لەوانە: "لە رێگەدا، باخەوان، نیشتمان، راوبەتاژی، بادە، عەرەبانەچی." ئەم شیعرانە لەو زەمان و رۆژگارەدا دەوری گەورەیان لە بێدار کردنەوەی بیری روسی دیتووە، و بیلینسکی بەر لە هەموو کەسێك پیرۆزبایی ئەو شیعرانەی لێکردووە.

نیکراسۆف لە ساڵی ١٨٤٧دا بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی گۆڤاری "هاوچەرخ"ی لە ئەستۆ گرت و گروپێك لە باشترین نووسەرانی ئەو سەردەمەی لە دەور خڕکردەوە، لەوانە: بیلینسکی و تورگینیف و گرتسن و لیڤ تولستوی و گونجاروف و گریگوروڤیچ. تا ماوەیەکی زۆر شاکارەکانی ئەوان لەم گۆڤارەدا بڵاو دەبووەوە، بۆیە بڵاو بوونەوەی ئەم گۆڤارەش بە خزمەتێکی ئەدەبی گرینگی ئەو دێتە ژماردن.

ئاشکرایە نیکراسوف لەم گێروگازەدا دەبوایە دژی دەستەی سلاڤی دۆستان بێ و لایەنگیری پڕ جۆش و خرۆشی باشوور ناسان بێ. کاتێ کە ئەم دەستەیە بوون بە دوو باڵی راست و چەپ، ئەوجاش نیکراسۆف نەیتوانی قەناعەت بە بیری میانڕەوو خاوی راستڕەوەکان بکات و دەستبەرداری بیری توندی خۆی نەبوو و هەر بەوەندەوە نەوەستا بەڵکو لە ساڵی ١٨٥٤دا چرنیشفسکی و لە ساڵی ١٨٧٧دا دابرولیوبف-شی هێنایە ناو ئیدارەی گۆڤاری "چەرخ"ەوە.

لە ساڵی ١٨٦١دا کە ئازادی گوندییان راگەیەنراو دووبەرەکی کەوتە نێوان گروپی باشوورناسانەوە، و ناکۆکییەکی دژوار کەوتە نێوان تۆرگینیف و دابرالیوبف-وە، بێگومان ئەو بیروبۆچوونە توندەی کە نیکراسۆف هەیبوو سەرنجی دابرالیوف-ی راکێشا. هەڵبەتە ئەو نووسەرانەی کە لایەنگری بیروبۆچوونەکانی تورگینیف بوون دەبوایە لە دەستەی نووسەرانی گۆڤاری هاوچەرخ بچنە دەرێ، ئەوە بوو نیکراسوف چەند نووسەرێکی لاوی وەکو سالتیکوف شچدرین و پومیالوسکی و گلوپ ئۆسپنسکی و سلپیتسوڤ لە جێی ئەوان دانا.

لە ساڵی ١٨٦٦دا گۆڤاری هاوچەرخ لەبەر توندڕەوی خۆی داخراو نیکراسۆف هەر کۆڵی نەداو لە ساڵی ١٨٦٨دا گۆڤاری (یاداشتەکان نیشتمان)ی لە بری هاوچەرخ دەرکرد. لەم سەردەمەدا بەرە بەرە ناکۆکی توندی نێوان سەرمایەداران و زەحمەتکێشان دەرکەوت ولایەنگرانی هەردوو دەستەی نێوبراو سەنگەری خۆیان

قایم دەکرد، ئاشکرایە کە نیکراسوف دەبووایە لەریزی پیشەوەی زەحمەتکێشاندا بێ و ئەو رێیەی بەوپەڕی بێباکییەوە گرتبوویە بەر بگەیەنێتە سەرو تەنانەت گرتنی چرنیشفسکی ومردنی دابرالیوبف-ش، یانی لە دەستچوونی دووکەس لە نزیکترین یارانی، ساردیان نەکردەوە. ئەم کەڵە پیاوە هەر کوڵی نەداو بەوپەڕی ئازادی و بێباکییەوە درێژەی بەو ژیانە دژوارو سەختە دەدا کە لە دوو دوا ساڵی تەمەنیدا دووچاری نەخۆشی شێرپەنجەی ڕیخۆڵە هات و دوای دوو ساڵ دەردو ئازاری کوشندە لە مانگی سەپتەمبەری ١٨٧٧دا کۆچی دوایی کرد .

دوا شانازییەك کە ڎیی برا ئەوە بوو کە لە سەر مەرگ دا نامەیەکی چرنیشفسکی لە تاراوگەی سیبریاوە بۆ هاتبوو کەنیایدا گوتبووی: "گوتەکانی بەنەمری دەمێننەوە. ئەو لە هەموو شاعیرانی روسیا نەجیب ترو گەورەترەو نیشتمان هەمیشە بە میهرو سۆزەوە یادی دەکاتەوە. پیاوێکی بەورەو نەجیب و پڕ ئاوەزە. من بە شاعیرێکی قسە نەستەقی دەزانم و لەهەموو شاعیرانی روسیا بە گەورەتری دەژمێرم. "کە ئەو گوتانەیان بۆ نیکراسوف خوێندەوە گوتی :"ئێستا دڵم رەحەت بوو و بە ئارامی دەمرم". دوای چەند رۆژێك لەوە بەدواوە کۆچی دوایی کرد. ئەگەر چی سەرمایەکی زۆر تووش بوو بەڵام خەڵکانێکی زۆر لە ئازادیخوازانی ئەو زەمانەو زانایان و ئەدیبان لە بەڕێکردنی جەنازەکەیدا ئامادە بوون و دۆستۆفسکی وتەیەکی کاریگەری لەسەر گۆڕەگەی خوێندەوەو کاتێ دۆستۆفسکی ئەوی بەهاوتای پوشکین لەقەڵەم دا، یەکێك لەنێو قەرەباڵغی خەڵکەکەوە هاواری کرد :"بالأتر، بالأتر"ئەم هاوارە هی پلیخانۆڤ داناو هزرڤانی بەنێوبانگ بوو.

بەرهەمە شیعرییەکانی نیگراسوف لە شاکارە بێ چەندو چوونەکانی زمانی رووسین .لەساڵی ١٨٤٦دا کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی خۆی بڵاو کردۆتەوەو لەو کۆمەڵەیەدا خۆی بەنوێنەری ناتورالیزمی روسیا لەقەڵەم داوە. گەورەترین هونەری ئەو ئەمەیە کە ئەو پێشەنگ و داهێنەری شیعری کۆمەڵایەتی وسیاسی بووە لەروسیادا. گرنگترین بەرهەمی چامەیەکە بە ناوی"چۆن دەبێ لە روسیادا بەخۆشی بژیت" و لەدوای ساڵی ١٨٧٠دا ئەو بەرهەمەی هۆنیوەتەوە.

شیعرەکانی هەندێ جارووشکن بەڵام هەمیشە دڵگیرو پڕ جۆشن و هەندێ جار نەرم و نیانن. ئەویش یەکێك بووە لەریزی پێشەوەی ئەو کەسانەی کە خۆپەرستی و بێدادی و تەماعکاری و حەسودی سەرمایەداران ودەردورەنجی زەحمەتکێشان و گوندییانی بە چاکترین شێوە بەرجەستە کردووە و شاکاری وەکو: "بیر لەبەرانبەر

دەروازەی کۆشـک دا، سـووخۆر " و چـامەی تـری لـەو بابەتـەی هونیوەتـەوەو بـڵاو بوونەوەی زانست و ماریفەتی بە تاقە دەرمانی ئەو دەردانە زانیوە.

## ١٠٦- چارلز دیکنز

**١٨١٢-١٨٧٠**

**دیکنز بە دەربڕینی حەقیقەتەکانی ژیانی زەحمەتکێشان و هەژاران، کۆمەڵگەی خۆی گۆڕی.**

**چارلز دیکنزی کەڵەنووسەری ئینگلیزی لە ١٨١٢/٢/٧ لە پورتسموپی ئینگلستان هاتۆتە دنیاوە. دووەم کەسی خێزانێکی حەوت کەسی بوو کە بابی لەبەر خێزانداری و زۆری ئەندامانی خێزانەکەی نەیدەتوانی وەکو پێویست مەسرەفیان بکات و خەرجیان بکێشێت.**

**کاتێ کە چارلز هێشتا منداڵ بووە، بابی لەسەر گیروگرفتی دارایی کەوتە زیندان و چارلزی مێردمنداڵ ناچار بوو لە شوێنێك دا کارێك بۆخۆی بدۆزێتەوە. ئیدی کاری هەمەجۆری تاقی کردەوەو نەیتوانی درێژە بە خوێندنی خۆی بدات تا لە ئەنجامدا رۆژنامەوانی کرد بە پیشەی خۆی و لەم وارەدا سەرکەوتنی باشی بەدەست هێنا.**

**ئەنجام ئەو چارلز دیکنزەی کە ساڵانێك لەنێو نزمترین چینی کۆمەڵگەی ئینگلستان ژیابوو رووی کردە دنیای نووسەری و بێدادی و نایەکسانی کۆمەڵگەی خۆی هونەریانە بەرجەستە کرد و بەمەش شۆرەتی عالەمگیری پەیدا کرد. قسە کە لە دڵەوە دەربچێت، بە ئاسانی دەچێتەوە دڵ، چارلز کە ئەزموونی ژیانی ناو نزمترین چینی کۆمەڵگەی هەبوو، توانی ئەو چینە لە یەکەم رۆمانی خۆیدا "ئولیڤەر تویست" وێنە بگرێ و بەرجەستە بکات. دیکنز لە ساڵی ١٨٤٩دا رۆمانی "دیڤید کاپرفیلدی" بڵاو کردەوەو لەوێندەردا ئێش و ئازارە مرۆڤانییەکان بە جوانی وێنە کێشرابوون.**

**پاش ئەوە (چیرۆکی دوو شار)ی نووسی و مێژووی ئینگلستانی تۆمار کرد.**

**لە کاتێکدا کە سەرگەرمی نووسینی داو رۆمانی خۆی "ئەدڤین درود" بوو کە لە پڕ و لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا لە ساڵی ١٨٧٠دا کۆچی دوایی کرد. لە ژێر تاقی کلێسای "ویست منیستر"دا بەخاك سپێردرا. هیچ نووسەرێك تاکو ئێستا نەیتوانیوە وەکو ئەو خەوشە ئەخلاقی و لاوازییەکانی کۆمەڵگەی ئینگلستان بەم روونییە وێنە بکێشێت و هونەرییانە بەرجەستەی بکات.**

## ١٠٧- ویلیام وردز ورس

## ١٨٥٠-١٧٧٠

له ناوچەی لیك دیستریکت کمبرلاند چاوی به ژیاندا هەڵێناوه. له هەشت ساڵیدا دایکی و له سێزده ساڵیدا بابی مردن. پاش تەواو کردنی خوێندنی ناوەندی له کۆلێژی سەنت جان دا (١٧٨٧-١٧٩١) درێژەی به خوێندن دا. له ساڵی ١٧٩٠دا به پێیان سەفەری فەرەنسا، دۆڵی راین، سویسراو ئیتاڵیای باکوری کردووه. ساڵی پاشتریش چوو بۆ فەرەنساو تا ساڵی ١٧٩٢ له ئورلیان مایەوه. لەم ساڵەدا زۆر به گەرمی باسی شۆڕشی فەرەنسای دەکرد و به تەواوەتی کەوتبووه ژێر کاریگەری رۆسۆوه. بەڵام پاشان توندڕەوی و زێدەگاڤییەکانی شۆڕشی فەرەنسا بێتاقەتیان کرد. تا زیاتر دەچووه ناو ساڵەوه، زیاتر محافەزەکارتر دەبوو.

یەکەمین شیعرێن وردز ورس له دوو دەفتەردا بەناوی (شەوانه گەشت) و (سکێچێن وەسفی) له ساڵی ١٧٩٣دا بڵاو بووەوه. ئەم شیعرانه له قاڵب و کتێبی حەماسیدا داڕێژرابوون. وردزورس له ساڵی ١٧٩٩دا لەگەڵ دوروتی ی خوشکیدا که هاودەمی هەمیشەیی ئەو بوو، بۆ دەڤەری دەریاچەکان زڤڕییەوه. خەڵکی وردزورس و کولریج و ساوڵی-یان به شاعیرانی لیك دیستریکت له باکوری رۆژئاوای ئینگلستان گرنگترین بەرهەمی باشترین وردزورس، (چامەلیریکی یەکان- ١٧٩٨) بوو که یادگاری هاوکاری ئەوبوو لەگەڵ کولڕیج دا. وردز ورس لەم کتێبەدا که ژمارەیەك له جوانترین شیعرێن وی له خۆ گرتووه، هەوڵی داوه ئەو شتانەی که ئاسایی و سواو دەنوێنن، جادووییانەو سەیر بیانخاته روو، وەکو چۆن کولریج له هەوڵی ئەوەدا بووه که بابەتێن میتافیزیکی به شێوەی واقیعی پیشانبدات. وردزورس له ساڵی ١٨٠٠دا چاپی دووەمی (چامەلیریکییەکان)ی کردەوەو پێشەکییەکی درێژ و گرنگی بۆ نووسی که بریتییه له دید و بۆچوونەکانی خۆی لەمەڕ شیعر و یەکێکه له بەڵگەنامه رەخنەوانییه هەره گرینگەکانی ناو ئەدەبیاتی ئینگلیزی. (هێماکانی جاویدانی ١٨٠٧) یەکێکه له چامه هەره درێژ و دڵگیرەکانی وردزورس. شیعرێکی زۆر مەنشوری دیکەی هەیه بەناوی کورتەگەشتێك ١٨١٤- Excursion) ئەمه بەشێکه له بەرهەمێکی گەورەی فەلسەڤ که وردزورس بەتەما بوو بینووسێت، بەڵام بۆی تەواو نەکرا. شیعرێکی درێژی دیکەی هەیه بەناوی (دەرامەت-١٨٥٠) که له راستیدا ژیاننامەی خودی شاعیره، و ئەم شیعره گوزارشتێکی راستگۆیانەیه له ئەزموونه زەینی و سۆزدارییەکانی ئەو. وردزورس لێرەدا دەگەڕێتەوه بۆ ساڵانی

منداڵیەتی خۆی ، بۆ قۆناغی خوێندنی لە کامبریج، بۆ ئەو رۆژگارانەی کە لە سەردەمی شۆڕشدا لە فەرەنسا بوو، بە گوێرەی تێپەڕبوونی ژیانی نەشونمای زەینی خۆی وێنە دەگرێت.

وردزورس شاعیرێکی رەسەن و داهێنەر بوو. لە ناخی دڵەوە ستایشی سروشتی دەکرد، شاعیری تەبیعەت بوو، بەڵام تەنیا نیگارکێشی بە دەسەڵاتی دیمەنە سروشتییەکان نەبوو. بەلای ئەوەوە هەر شتێکی لە تەبیعەت دەژنەوت، و هەر شتێکی تەبیعەت ئیلهامی پێدەبەخشیٚ، گرنگ بوو. لە راستیدا ئەو شاعیرێکی ئەندێشمەند بوو، سەرچاوەی ئەندێشەو خەیاڵەکانی لە تەبیعەتدا دەبینییەوە، عەشقی تەبیعەت بە جۆریٚ بڕی کردبوو، کە دەیگوت دەبیٚ زمانی شیعر هەمان زمانی سادەی وەرزێرانی بیٚ ڕیا بیٚ، لیٚ خەیاڵی بەهێزی ئەوی بۆ قەڵەمڕەوی پشت ژیانی و ئەندێشەکانی مرۆڤی دێهاتی بکێش کرد. ئەو ووشەی قەبەو قەڵەوو بە بریق و باق و بیٚ ناوەڕۆکی وەلاوەناو شیعری تایبەتی خۆی بە زمانێکی سادەو ڕەوان ئەفراند.

## ١٠٨- سەمۆئیل تایلور کولریج

١٨٣٤-١٧٧٢

شاعیر و تیۆریین-ی پێشەنگی رابوونی رۆمانتیکی ئینگلستان، فەرزەنی سیازدەمینی کابرایەکی روحانی خەڵکی دونشایر بوو. هەوەڵجار لە لەندەن و لە قوتابخانەیەکی خێرخوازی خوێندوویەتی و پاشان لە ساڵی ١٧٩١دا چووەتە کامبریج، لێ لە ساڵی ١٧٩٣دا ئەوێندەری بەجێهێشت و رۆیی بۆ لەندەن. کولریج لە ئۆکسفۆرد رۆبرت ساوپی بینی و بە دوو قۆڵی کەوتنە بیری دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی ئایدیالی یان یۆتۆبیایە بە هۆی نەبوونی پشتیوانەی داراییەوە هەرگیز نەهاتە دی.

کولریج لە ساڵی ١٧٩٦دا یەکەمین دیوانە شیعری خۆی بڵاو کردەوە، و لە هەمان ساڵدا رۆژنامەی (واچمەن)ی دەرکرد کە رۆژنامەیەکی سیاسی ئازادیخواز بوو، بەڵام لە دە ژمارە تێنەپەڕی.

سەرەتای دۆستایەتی کۆلریج لەگەڵ وردزورس دا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٩٧، ئەم دۆستایەتییە کارێکی ئیجابی زۆری کرد، سەر کولریج و جوانترین شیعری خۆی لەو ماوەیەدا نووسیوە. باڵاترین بەرهەمی ئەم دۆستایەتییە کۆمەڵە چامەیەکی لیریکی بوو، کە بەیتی (دەریاوانی زۆرهان) یەکێکە لەو چامانە. ئەم بەیتە درێژە سەیرترین چیرۆکە شیعری رۆمانتیکییە لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا. سەرانسەری شیعرەکە جوانییەکی لیریکی لێ هەڵدەقوڵێ. چیرۆکی ئەم بەیتە لە زمانی دەریاوانێکی پیرەوە دەگێڕدرێتەوە کە لە بەستەڵەکە جەمسەرییەکاندا باڵندەیەك بە گوللە دەکوژێت و کەشتیەکەی دوچاری نەفرین دەبێ. بای پێچەوانە هەڵدەکات، زەخیرەیان نامێنێ، کەشتیوانەکان لە برساندا دەمرن، دەریاوانی زورهان و پیر بەتاقی تەنیا دەمێنێتەوە.

کولریج و ورز ورس لە ساڵی ١٧٩٧دا سەفەری ئەڵمانیایان کرد، کولریج لە زانستگەی گوتینگن دا فەلسەفەی خوێند و فێری ئەلچمانی بوو. کە بۆ ئینگلستان گەڕایەوە لە دەڤەری دەریاچەکاندا ئاکنجی بوو تا لە وردزورس-ەوە نزیك بێ، لێ ئاوا هەوای شێداری دەڤەرەکەی پێ نەدەکەوت، ئەو کە نەخۆش و پەرێشان بوو بوو، پەنای وەبەر تلیاك برد و زۆر زوو ئالوودەی تلیاك خۆری بوو. لە ساڵی ١٨٠٤دا بە ئومێدی چارەسەر چوو بۆ مالتا، بەڵام لە ١٨٠٦دا بە نائومێدی بۆ وولات گەڕایەوە.

لە ساڵانی ١٨٠٩-١٨١٠دا بڵاڤۆکێکی سیاسی -فەلسەڤی بەناوی دۆست بلاو کردەوە. لە ساڵی ١٨١٧دا گرنگترین بەرهەمی خۆی بەنێوی (بیوگرافیای ئەدەب)

بەچاپگەیاند، کە باشترین رەخنە ئەدەبییەکانی ئەوی لەخۆ گرتووە، هەر بەم کتێبە وەکو گەورەترین رەخنەگری ئەوروپا لە عەسری رۆمانتیکدا ناوو ناوبانگی دەرکرد.
دوو بەرهەمی بەناوبانگی دیکەی کولریج بریتین لە (کریستابل-١٨١٦) و (کوبلاخان-١٨١٦) کە هەردووکیان بە ناتەواوی ماونەتەوە. کریستابل یەکێکە لە شیعرە هەرە جوانەکانی ئینگلیزی کە لە رووی قاڵب و کێشەوە زۆر رەوان و بەناوبانگە. کوبلاخان شیعرێکی شاعیرانەی لێوان لێوی راز و رەمز و ماناو چەمکانە. کولریج بەخۆی ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە ئەم شیعرە جوانەی لە خەوێکی ئەفیونیدا گوتووەو لە جیهانی بێداریدا نووسیویەتییەوە.
کولریج بە یەکێك لە وتاربێژانی بەرجەستەی زەمانی خۆی و یەکێك لە سیما نەمرەکانی راپەڕینی رۆمانتیکی ئینگلستان دەژمێردرێ. فەلسەفەی رەسەنایەتی تەسەوری ئەڵمانی لەگەڵ خۆیدا بۆ ئینگلستان هێناو هاوڵاتیانی خۆی بە گەنجینەکانی ئەدەبیاتی ئەڵمانی ئاشنا کرد. خەیاڵێکی هێندە بەهێزی هەبوو، نەیدەهێشت تلیاکخۆری پێوە دیاربێ.

## ١٠٩- جۆرج گۆردۆن بـايرۆن
### ١٨٢٤-١٧٨٨

بەلۆرد بایرۆن بەنێوبانگ بوو، قارەمانی راپەڕینی رۆمانتیك بوو. لە سێ ساڵیدا بابە دەست بڵاوو سەرەرۆیەکەی لەدەست داو لەگەڵ دایکیدا لە ئوسکاتلەند ژیاو گەورە بوو. لە ساڵی ١٧٩٨دا بوو بە میراتگری ناوی شۆرەت و موڵك و ماڵی ماڵباتەکەی خۆیان، و لە ساڵی ١٨٠٨دا خوێندنی لە کامبریج تەواو کرد. لە ساڵی ١٨٠٩دا کورسی ئەنجوومەنی عەوامی بەدەست هێنا. بایرون لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا یەکەمین کۆمەڵە شیعری بەناوی (کاتەکانی دەستبەتاڵی-١٨٠٧) بڵاو کردەوە کە رووبەڕووی کۆمەڵە رەخنەیەکی توند بووەوە. لە هاوینی ساڵی ١٨٠٩دا رێی سەفەری گرتە بەر و سەردانی پرتوغال و ئەسپانیا و مدیترانە و قەستەنتەنییە و ئاسایی بچووك و یۆنانی کرد. ئەم سەفەرە تەبیعەتی رۆمانتیکانەی بایرونی گەشاندەوەو بوو بە سەرچاوەی ئیلهامی گەلێك لە شیعرەکانی.

بایرون لە ساڵی ١٨١١دا بۆ وڵات گەڕایەوەو دوو بەشی هەوەڵی (رەفتاری چایلد هارولد-١٨١٢)ی بڵاو کردەوە. ئەم چیرۆکە شیعرییە درێژە (بەشی سێیەم ١٨١٦، بەشی چوارەم -١٨١٨) کە بووە مایەی شۆرەتی بایرون، سەربۆری پیاوێکی دڵتۆراو لە لەزەتێن گەوجانەی ژیان (لە راستی خودی بایرون) دەگێڕێتەوە کە دەچێتە سەفەرێن دوور و درێژ، لە هەر قەڵەمڕەوێ لادەدات دەکەوێتە وەسفی رابردووی ئەو قەڵەمڕەوە.

شیعرێکی دیکەی بایرون (بووکی ئابیدوس-١٨١٣)ە، کە چیرۆکێکی ئاشقانەیە دەربارەی ڤیان و مەرگ بە ناوەڕۆکی رۆژهەڵاتی . (دزی دەریایی-١٨١٤) و (لارا-١٨١٤)ش دوو بەیتی دیکەن و بەکێشی رەزمی (حەماسی) و تانوپۆی رۆژهەڵاتی هۆنراونەتەوەو ناوەڕۆکیان بریتییە لە تێکەڵەیەك لە ڤیان و مەرگ. قارەمانی ئەم دوو بەیتە، واتە کونراد و لارا، خەڵکانێکی توندڕەو، رۆمانتیك و رازئامێزن، لە راستیدا نموونەی قارەمانی بایرۆنین.

باشترین بەرهەمی بایرۆن (دون جوانە-١٨١٨-١٨٢٤)، کە تەنزێکی حەماسی ناتەواوە و لێوانلێوە لە رۆحی پیاوەتی و مەردایەتی، دلاوەری ئاوێتە بەشۆخ تەبعی و جوانی پەیڤ. بایرۆن لەم شیعرە درێژ و گەورەیەدا ، بە گێڕانەوە سەربهوردی حیرەتئەنگێزی سەفەری عاشقانەی دون جوان، دەگاتە لوتکەی جۆش و خرۆش و

ئیلهامی شاعیرانەو بلیمەتی ئەو بەدیار دەکەوێ. لە میانەی رووداوو بەسەرهاتەکانی سەفەرەکەی دۆن جوانەوە لە ئەسپانیاوە بۆ ئینگلستان ل رێگەی یۆنان و تورکیاو روسییەوە، زۆرجار داوی سەفەرەکە دەپچڕێ، و بیروبۆچوونی خۆی لەمەڕ بابەتێن وەکو سەروەت و سامان، دەسەلات، کۆمەڵگە، داوێنپاکی، شاعیران، سیاسەتوانان، و ئینگلستان دەردەبڕێ.

بایرۆن، لە ساڵی ١٨١٢ بەدواوە قارەمانی رۆمانتیکی کۆڕ و ئەنجوومەنەکانی لەندەن بوو و پەیوەندی دەگەڵ ژمارەیەك ژنی ناوداردا هەبوو. ئەنجام، لە ساڵی ١٨١٥دا لەگەڵ ئان میلبەنگ دا زەماوەندی کرد، کە ساڵی دواتر لێکدی جیابوونەوە. چونکە بایرۆن پاش ژن هێنانیشی هەر خەریکی مێ بازی و ئاسقێنی بوو، لەسەر ئەم کارەو بەهۆی پەیوەندی ئیحتیمالییەوە لەگەڵ زڕ خوشکەکەی خۆیدا، کەوتە ناو بازنەی ریسواییەوە. ناچار لە ساڵی ١٨١٦دا سەری خۆی هەڵگرت و ماوەیەك لە سویسرا مایەوەو پاشان لە ئیتاڵیادا ئاکنجی بوو. لە ئیتاڵیادا هاوکاری نزیکی لەگەڵ راپەڕینی ولاتپارێزاندا هەبوو. لە ئیتاڵیادا هاوکاری نزیکی لەگەڵ راپەڕینی ولاتپارێزاندا هەبوو، بەلام لە دڵداری و مێبازی خۆیشی غافڵ نەبوو. بایرۆن سەرەنجام رۆیی بۆ یۆنان و بەشداری لە جەنگی خۆیبوونی ئەو ولاتەدا کرد. و لەم ولاتەدا نەخۆش کەوت و بە گرانەتێ مرد. بایرۆن لەو ماوەیەشدا کە لە ئیتاڵیا بوو چەند بەیتێکی هۆنیوەتەوە، یەکێك لەوانە (زندانی شیلان-١٨١٦)ە کە بەیتێکی بەناوبانگە.

بایرۆن شاعیرێکی بزێو و نەسرەوت، پڕ جۆش و خرۆش، رەند، عاشق، شەیدای جوانی سروشت و ژن، شیفتەی ئازادی مرۆڤ، و بابایەکی بە بەهرەو تەبیعەت ساغڵەم و بە کورتی و بە کوردی پیاوێکی پیاوانە بوو، ژیانی پەریشان و شیعری پڕ جۆش و خرۆشی ئاوێنەی بالانمای رۆمانتیزمی زەمانی ئەوە. ئەگەر رۆسۆ بە پەیامبەری راپەڕینی رۆمانتیك بزانین، ئەوا بایرۆن قارەمانی ئەو راپەڕینەیە.

## ١١٠- پرسی بیش شیللی
## ١٨٢٢-١٧٩٢

له خێزانێکی زەنگینی موحافەزەکار لەدایك بووە. له هەوڵی هەرزەکاریدا کەوتە ژێر کاریگەری بزاڤی رۆشنبیریی وەختەوە و بە جۆش و خرۆشەوە کەوتە بەرەڤانی لە ئازادی و خەبات دژی گیروگرفتە سیاسی و ئاینییەکان. لە ساڵی ١٨١٠دا بۆ خوێندن چووە ئۆکسفۆرد. لەوێندەر نامەیەکی بەناونیشانی (زەرورەتی نکۆڵی کردن لە خوا-١٨١١) بڵاو کردەوە. لەگەڵ بڵاو بوونەوەی نامەی ناوبراودا، بە تاوانی ئیلحاد و زەندەقە لە زانستگە دەرکرا. لەم سەروبەندەدا شیللی نۆزدە ساڵە، حەزی لە (هاریت ویستبرووك)ی کیژە خوێنەواری ١٦ساڵان کرد و پێکەوە بۆ ئۆسکوتلاند رەڤین. ئەم دووە لە ساڵی ١٨١١دا زەماوەندیان کردو لە ئینگلستان و ئیرلەندەدا کەوتنە بڵاو کردنەوەی نووسین و کتێبەکانی شیللی و وتاربێژی دژی بێدادی ساسی. بەرە بەرە ناکۆکی کەوتە نێوانیان و لە ساڵی ١٨١٤دا لێکدی جودا بوونەوە. لە هەمان ساڵدا هاریت خۆی کوشت، شیللی لەگەڵ ماری کیژی ویلیام گادوین دا، بۆ ئەوروپا هەڵات و پاش دوو ساڵ زەماوەندیان. تا ساڵی ١٨١٨ لە ئیتاڵیا نیشتەجێ بوون، و شیللی جوانترین بەرهەمی خۆی لەوێندەر نوسی. ئاقیبەت ئەم خۆشەویست ترین سیمایەی عەسری رۆمانتیك بە هۆی وەرگێڕانی بەلەمەکەیەوە لە دەریادا خنکاو کۆچی دوایی کرد.

یەکەمین شیعری کرنگی شیللی بەیتی (ئالاستۆر-١٨١٦) بوو. کە کاریگەری وردزورس-ی پێوە دیارە. شیعرێکی تری شیللی بەیتێکی حەماسییە بەناوی (سەرکێشی ئیسلام-١٨١٨) کە داد و بێدادە لەدەست ستەمکاری جیهان. نمایشنامەی لیریکی و رازداری (پرومیسۆسی لە بەندخەلەسیو-١٨٢٠) خەباتی مرۆڤ دژی دەسەڵاتی خۆیانی درۆیین وێنە دەگرێت. جوانترین شیعری شیللی بەیتی (ئادونابیس-١٨١٢)ە لاوانەوەیەکە بۆ مەرگی کیتس، و یەکێکە لە گەورەترین شیعری لاوانەوەی ئینگلیزی. شیعرە کورت و لیریکییەکانی شیللی لە رووی دڵگیری و جوانییەوە کەم وێنەن. بەناوبانگترین شیعری ئەو بوارەی قەسیدەیەکە بەناوی (بای خۆراوا-١٨٢٠) ئەمە یەکێکە لە پرشنگدارترین شیعری لیریکی ئینگلیزی و کەم وێنەیە. ئەم قەسیدەیە لە پێنج بەش پێکهاتووە، کە شاعیر لە بەشی یەکەمدا وەسفی بای نائارام و توند و مەغرووری پاییزی لە بێشەدا دەکات، لە بەشی دووەم و سێیەمدا باسی با لە ئاسمان و لە دەریادا دەکات، و لە بەشی چوارەمدا وێنەێن

بێشەو ئاسمان و دەریا ئاوێتەی یەكدی دەكات، لە بندێڕی بەشی كۆتاییدا پەیامی خۆی رادەگەیەنێت، قەسیدەیەكی جوانی دیكەی شیللی (هەور-١٨٢٠) ناوە كە شاعیر حیكایەتی ژیانی پەڵە هەورێك لەنێو باران و تەرزەو بروسكەو بلاْچەو بەفر و خۆرنشین و مانگەشەودا دەگێڕێتەوە. بەیتی (مەلیكە مەب-١٨٢١) شیعرێكی شۆڕشگێڕانەی بەناوبانگی دیكە شیللییە. كە هێرش دەباتە سەر بونیادی كۆمەڵایەتی و شاهان و كەشیشان و دەرمانی دەردە كۆمەڵایەتییەكان لە نەمانی ئەواندا دەبێتەوە.

یەكێك لە بەرهەمە پەخشانەكانی شیللی (بەرەڤانی لە شیعر-١٨٢١)ە كە لەوێدا خۆشەویستی و خەیاڵ بە كۆڵەكەی شیعر دادەنێ.

شیللی شاعیرێكی لاوی گەرم و گوڕ بوو. باوەڕی بەوە بوو كە عەشق و خۆشەویستی و مەحەبەت مرۆڤ دەگەیەنێتە كەماڵ، و خۆشەویستی و ڤیانی یوتوبیایی ناوەڕۆكی سەرەكی شیعرە سادەو ناسك و ڕەوانەكانی بوو.

## ١١١- وا ليتر سافيج لەندۆر

### ١٧٧٥-١٨٦٤

شاعیر، پەخشاننووس و رەخنەگری ئەدەبی یەکێك بووە لە سیما غەریبەکانی عەسری رۆمانتیك. لە بنەماڵەی پزیشکێکی مەنشوور هاتۆتە دنیا. لە کامبریج خوێندوویەتی، و لە کاریگەری هاماجی شۆڕشگێڕانەی زەمان بەدەر نەبووە. لە ساڵی ١٨٠٥دا بابی دەمرێ و میراتییەکی مۆڵی پێ دەبڕێ و ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنێ. پاش سێ ساڵ چوو بۆ ئەسپانیاو لە شەڕی ناپلیۆندا بەشداری کرد. پاش گەڕانەوە بۆ زێدی خۆی زەماوەندێکی ناکامی کرد، لە ساڵی ١٨١٤ بەدواوە لە ئیتاڵیا نیشتەجێ بوو.

یەکەمین کۆمەڵە شیعری لەندۆر لە ساڵی ١٧٩٥دا بڵاو بووەوە. لە ساڵی ١٨٩٨دا چیرۆکی رۆژهەڵاتی ئەو بەناوی (گیبیر) کە دەربارەی موسوڵمانانی ئەسپانیایە بڵاو بووەوە. بەرهەمەکانی دواتری لەندۆر بریتی بوون لە چەند کۆمەڵە شیعرێك بە لاتینی کە دڵبەندی قووڵی ئەو بە مێژوو و ئەدەبیاتی روم ئاشکرا دەکات.

(گفتوگۆین خەیاڵی) کە پێنج بەرگەو لە نێوان ساڵانی ١٨٢٤-١٨٥٣)دا بڵاو بووەتەوە، مەنشورترین بەرهەمی لەندورەو زادەی خوێندنەوەی زۆر و دڵبەندی ئەوە بە رابردووەوە. لەم کتێبەدا کە پەخشانێکی ریتمدار و ئاهەنگدارە زنجیرە گفتوگۆیەك لە نێوان کەسایەتییە مێژووییەکاندا دەربارەی بابەتێن جۆراوجۆر روودەدا، و لەندور لە پەنای گفتوگۆیەکانەوە، بێ پەروا شەرح و شرۆڤەی خۆی دەربارەی مێژوو لە زمانی کەسایەتییەکانەوە دەردەبڕێ. لەندور لە ساڵی ١٨٤٦دا (هیلینکا)-ی بەچاپ گەیاند کە تەرجەمەی ئینگلیزی یەکێك لە چامەکانی خۆی بوو.

لەندۆر، ئەگەرچی لەناو جەرگەی قۆناغی رۆمانتیکی دا دەژیا، بەڵام زیاتر پابەندی کلاسیزمی سەدەی هەژدەیەم بوو.

## ١١٢- لۆرد ئالفرید تینیسۆن
### ١٨٠٩-١٨٩٢

ئەم شاعیرە لە خانەوادەیەکی کەشیشی، لە لینکنشایر هاتۆتە دنیاوە. هەر لە منداڵییەوە ئاشنایەتی لەگەڵ شیعردا پەیدا کردووەو کەڵکەڵەی لاسایی کردنەوەی پۆپ، سکۆت، تۆماس مۆرو بایرون-ی کەوتە سەر. لە هەژدەساڵیدا بە شەریکی لەگەڵ چارلز-ی برایدا کۆمەڵە شیعرێکی بەناوی (کۆمەڵە شیعرێك لەلایەن دوو براوە-١٨٢٧) بڵاو کردەوە، و لە ساڵی ١٨٢٨دا چووە زانکۆی کەمبریج. لە ساڵی ١٨٣٠دا کۆمەڵە شیعرێکی بەناوی (شیعرێن پتر لیریکی) بەچاپ گەیاند. ساڵی دواتر خوێندنی تەرك کرد. تینیسۆن کە زۆر لە ژێر کاریگەری شاعیرانی رۆمانتیکی ئینگلیزیدا بوو، بەتایبەتی جۆن کیتس، لە ساڵی ١٨٣٢دا کۆمەڵە شیعرێکی دیکەی بەناوی (شیعرەکانی ئالفرید تینیسۆن) بڵاو کردەوە کە (کۆشکی هونەر) و (خەیاڵرێسانی بێ غەم) جوانترین شیعری ناو ئەو کۆشیعرەن. تینیسۆن لە ساڵی ١٨٣٣دا باشترین و عەزیزترین دۆستی خۆی (ئارتور هنری هەلەم ١٨١١-١٨٣٣)ی شاعیر و گوتارنووسی لەدەست داو زۆری لەبەر گران و ناخۆش بوو.

بۆیە لە شیوەنی ئەودا کتێبێکی نووسی بەناوی (بەیادی ئا...١٨٥٠) کە بالاترین شینانامەی (مرپیە)ی ئەدەبیاتی ئینگلیزی لەخۆ گرتووە. ئەم شینانامانە رەنگدانەوەو دەنگدانەوەی ئومێد و دوو دڵی تینیسۆن و هاوعەسرانی ئەون و دەربڕی ئارەزووەکانی روحی مرۆڤێکن کە جگە لە مەرگ چ چارەنووسێکی دیکەی نییە.

تینیسۆن پاش دە ساڵ بێدەنگی ، جارێکی دیکە لە ساڵی ١٨٤٢ بایدایەوە سەر شیعر هۆنینەوە و بڵاو کردنەوەی شیعرێن ئەندێشمەندانەو سفت و سۆڵ و زۆر بە زوویی وەکو شاعیرێکی بەتواناو ناسکخەیاڵ ناوبانگی دەرکرد. (ئۆلیس) یەکێکە لە شیعرە هەرە دڵگیرەکانی تینیسۆن و ئیلهامی ئەم شیعرەی لە بەسەرهاتی ئۆلیسی قارەمانی ئۆدیسەی هۆمەرەوە وەرگرتووە. لەم بەیتەدا قارەمانی پیر باسی کەڵکەڵەی سەفەرەکانی خۆی بۆ سەرزەمینانی دوور دەگێڕێتەوە. بەیتی (شازادە خانم ١٨٤٧) کە جوانترین شیعرێن تینیسۆنی لەخۆ گرتووە، لە راستیدا رۆمانێکە لە قاڵبی پەخشانە شیعردا: (قەسدەکانی شا-١٨٥٩) گەشتێکی دڵگیرە بە سەرزەمینی خەیاڵ ورۆژێنی ئارتۆرشادا.

تینیسۆن تراژیدیایەکی سێ بەشی مێژوویی لەپاش بەجێماوە کە بریتین لە (شابانۆماری ١٨٧٥، هارولد ١٨٧٧ و بیکیت- ١٨٨٤).

شیعرەکانی تینیسۆن لە رووی داهێنانی ووشەی ریتمدار و کێشی پوختەو وێنەی وردەوە یەجگار پرشنگدارن. بەراستی بە نوێنەری سەردەمی ڤیکتۆریا لە ئینگلستاندا دەژمێردرێ و شیعرەکانی رەنگدانەوەی هوشیاری و بایەخی فیکری و ئەخلاقی سەردەمی ڤیکتۆریا و چینی کۆمەلآیەتی دەسەلآتداری ئەو سەردەمەیە. تینیسۆن لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا کەوتە بەر هێرش و پەلاماری ئەو شاعیرە ئینگلیز و ئەمریکاییانەی کە دژی پێوەرەکانی سەردەمی ڤیکتۆریابوون، و ئیرادی ئەوەیان لێدەگرت کە کەسێکی بیروح و گیان، سست فیکر، و نەتەوە پەروەرێکی کورت بین بوو. بەلآم لە سالآنی دواتردا رەخنەگران بەردەوام ستایشی لێهاتوویی ئەوەیان لە بواری کێش و وێنە سازی بەرجەستەی هەندێ شیعری لیریکی دا دەکرد.

# ١١٣- رۆبیرت براونینگ

## ١٨١٢- ١٨٩٩

له دەوروبەری لەندەن هاتۆته دنیاوه. بابی فەرمانبەری بانقی ئینگلستان بوو و شێت و شەیدای ئەفسانەکانی سەدەکانی ناڤین بوو. دایکیشی له بواری مۆسیقادا یەجگار بەسەلیقەو بەهرەدار بوو. باب و دایکی براونینگ کەسیان ئەندامی کلێسای فەرمی ئینگلستان نەبوون، لەبەر ئەمە رۆبیرت له خوێندنی زانکۆ بێ بەش بوو. بەلام له ماڵەوه کتێبخانەیەکی گەورەو دەوڵەمەندیان هەبوو، پڕبوو له کتێبی جۆراوجۆر، ئەمە خۆی لەخۆیدا بۆ ئەو (رۆبیرت) زانکۆیەکی گەوره بوو. براونینگ له ماڵەوه زانیاریانی بەربلاوی کلاسیك، مۆسیقا، مێژوو و فەلسەفه فێر بوو. دلگیری و جوانی شیعرەکانی کیتس و شیللی وایان لێکرد بەرەو دنیای شیعر دابکشێ.

له ساڵی ١٨٣٣دا یەکەم کۆمەڵه شیعری بەناوی (pouline) بلاو کردەوه، که هیچ جۆره سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێناو نەفرۆشرا. شیعرەکانی ئەم کۆشیعره زیاتر رەنگدانەوەی تەسەوراتی براونینگه دەربارەی شاعیر وەکو مێژوونووسی روحی بەشەر. کۆشیعری دووەمی شاعیری نێوبراو له ساڵی ١٨٣٥دا بەناوی (پاراسلسوس)وه بلاو بووەوه که له کۆڕ و ئەنجومەنه ئەدەبییەکانی لەندەن دا دەنگی دایەوه. براونینگ به هاندانی (ولیام چارلز مکردی ١٧٩٣-١٨٧٣) ئەکتەر و شرۆڤەکاری تراژیدییەکانی شەکسپیر، چەند درامایەکی نووسی، بەلام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. تەنیا تراژیدیای (سترافورد ١٨٣٧) بۆ چەند شەوێك له لەندەن نمایش کرا. ئەوەی راستی بێ براونینگ وەکو پێویست دەرەقەتی رەگەزەکانی نمایش نەدەهات، بەلام له بواری دەربڕینی دراماتیك، و مەنەلۆگ و نووسینی دەقی نمایشی کورتدا بەتوانابوو. بەهەرحاڵ هەندێ له دراماکانی دواتری براونینگ بریتین له: (ڤیکتۆر شا و چارلز شا-١٨٤٢، گەڕانەوەی (روسس ١٨٤٣، نەنگییەکی خێزانی ١٨٤٣، لوریا ١٨٤٦ و تراژیدیای روح ١٨٤٦) براونینگ له ماوەی ساڵانی ١٨٤١-١٨٤٦دا زنجیرەیەك له شیعرەکانی خۆی بەنێوی (زەنگ و هەناران) بلاو کردەوه. براونینگ لەم زنجیره شیعرەدا که هەشت بەرهەمی له خۆ گرتبوو، هەوڵی دابوو گوتار دەگەڵ مۆسیقا، مانا دەگەڵ دەنگ و خەیاڵدا ئاوێتەی شیعر بکات، یان ئەو توخمانه بشیعرێنێ. له کۆمەڵەی یەکەمی (زەنگ و هەناران)دا سەرکەوتووترین

شیعری براونینگ (پیا تێدەپەڕێ) بڵاو بووەتەوە کە بەسەرهاتی کیژۆڵەیەکی هەژاری ئیتاڵیایی دەگێڕێتەوە کە لە ڕۆژی پشووی ساڵی نوێدا بەدەم گۆرانی گوتنەوە بە کوچەو کۆڵاناندا تێدەپەڕێ و کار دەکاتە سەر روحی ژمارەیەك لە خەڵکی. کۆمەڵەی سێیەمی (زەنگ و هەناران) ناوی (غەزەلە دراماتیکەکان ١٨٤٢)ە کە هەندێ شیعری وەکو پەیڤەکانی (رەبەنی ئەسپانیایی) لەخۆ گرتووە. لەم شیعرانەدا بوو کە براونینگ فۆرم و قاڵبێکی تەواوی دۆزییەوە بۆ نیشاندانی بەهرەو توانای خۆی لە بواری درامای سایکۆلۆژی دا، ئەم فۆرم و قاڵبە مەنەلۆگی نمایشی بوو. لە ساڵی ١٨٤٥ حەوتەمین ئەڵقەی کۆشیعری (زەنگ و هەناران) بەناوی (رۆمانس و غەزەلە دراماتیکەکان) بڵاو بووەو کە شیعری (رابەری گوم بوو) باشترین و گرنگترین شیعری ئەو ئەڵقەیە بوو. براونینگ لە ساڵی ١٨٤٦دا بە پەنهانی زەماوەندی دەگەڵ شاعیری بەناوبانگ خائیلزابت بیرت ١٨٠٦-١٨٦١) کرد و لە ئیتاڵیا ئاکنجی بوو. برت کە هەمیشە نەخۆش بوو لە ساڵی ١٨٦١دا کۆچی دوایی کردو، براونینگ بە کوڵێ خەم و پەژارەوە بۆ لەندەن گەڕایەوە. بەڵام دوای ماوەیەك بە گەرم و گوڕییەکی لە جاران زیاترەوە کەوتەوە کار.

یەکەم کتێبی براونینگ کە فرۆش و سەرکەوتنی تەواوی بەدەست هێنا کتێبی (کەسایەتیانی دراماتیك ١٨٦٤) بوو کە بەناوبانگترین شیعری ناو ئەم کتێبە (رابی بن ئیزرا) بوو. بەناوبانگترین بەرهەمی براونینگ (موستیلەو کتێب ١٨٦٨-١٨٦٩)ە. ئەمە بەیتێکی درێژە لە ١٢ بەرگدا و لەسەر بنەمای دادگاییەکی کوشتن لە ئیتاڵیادا ١٦٩٨) رۆنراوە. لەم کتێبەدا کە لە قاڵب و فۆرمی مەنەلۆگی درامی دا نووسراوە، ١٢ کەسایەتی هەن، هەر یەکێکیان بابەتی کوشتنەکە لە روانگەیەکی جیاوازەوە دەگێڕنەوە. براونینگ ئەم بەیتەی (چیرۆکی شیعری) لەسەر بنەمای کۆنە کتێبێکی زەرد (دەربارەی دادگاییەکی کوشتن) کە لە ساڵی ١٨٦٠دا لە فلورانسادا دۆزی بوویەوە، رۆنابوو. شۆرەتی براونینگ دەگەڕێتەوە بۆ روانینی سایکۆلۆژیانەی ئەو لە نیشاندانی کەڵکەڵەی کاراکتەرەکانیدا، بۆ توانای ئەو لە بواری فۆرمی مەنەلۆگی درامیدا، بۆ دەوڵەمەندی زانیارییەکانی، و بۆ کارکردنی بە ئاراستەی ناوەڕۆکی رینیسانسی ئیتالیایی و بۆ سوود وەرگرتنی ئەو لە زمانی دیالۆگی.

## ١١٤- ئیلیزابت بەریت براونینگ

## ١٨٠٦-١٨٦١

گەورەترین کیژی ماڵباتێکی ١١ سەرخێزانی بوو. ڕۆژانی خۆشی منداڵیەتی لە ناوچەی جوانی هرفورد شایر، لە سنووری ویلز بەسەر بردووە. بابی پیاوێکی باش بوو، بەڵام هەندێ ووشك و سەرسەخت بوو، ئەم پیاوە زۆر بەتوندی چاودێری هەڵس و کەوت و ڕەفتاری کیژەکەی دەکرد . لە ڕاستیشدا تا شووشی کرد هەر زیندانی بابی بوو، و کتێب هاوڕێی شەوو ڕۆژی بوو. لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا (داستانی نەبەردی ماراتون)ی نووسی و لەسەر حەساوی باوکی چاپ و بڵاوبووەوە. لە تەمەنی پازدەساڵیدا تووشی پشت یەشەبووە و تا کۆتایی تەمەن بەو ئازارەوە تلایەوە. هەروەها کە چوە لەندەن و لەوێندەر جێگیربوو، تووشی نەخۆشی سیل بوو، و هێندەی دی وەزعی خراپ بوو. ئیلزابت لە ساڵی ١٨٤٣ دا هەندێ لە شیعرەکانی بە ناوی (هاواری منداڵان) وە بڵاوکردەوە، کە هاودەردی قووڵی خۆی لەگەڵ ئەو منداڵانەدا، کە لە کانگەو کارخانەکاندا ڕەنجیان دەدا، دەربڕیوەو هێرش دەکاتە سەر چەوسێنەرانی مناڵان.

ئیلزابت لە ساڵی ١٨٤٦دا لە ئەنجامی دڵدارییەکی پڕ جۆش و خرۆشی نهێنیدا لەگەڵ ڕۆبیرت براونینگ دا زەماوەندی کرد. سەربوری ئەشق و دڵداری ئەم جووتە، توڕەبوونی بابە سەرسەختەکەی ئیلزابت لەم کارە، زەماوەندی شادی ئامێزی ئەم دووانە، هەڵاتنیان بۆ ئیتاڵیا و ڕۆژانی خۆشی هاوسەرییان، بە یەکێك لە ڕۆمانسە ئەدەبییە هەرە جوانەکان دەژمێردرێ. یادگاری ئەم زەماوەندە زنجیرە غەزەلیاتێکە کە ئیلزابت لە کۆمەڵە شیعرێك دا بەناوی (سۆناتای پورتوغالی) پێشکەش بە مێردەکەی کردووە. کۆمەڵە شیعرێکی دیکەی هەیە بەناوی (پەنجەرەکانی کازاگوئیدی ١٨٥١) کە شیعرێکی درێژە دەربارەی کەڵکەڵە میللییەکانی فلۆرانسییەکان، هەروەها (ئۆرورالی ١٨٥٦) کە بەیتێکە دەربارەی کیژۆڵەیەکی هەتیوو.

ڕاستە گوێنەدانی بەریت بەکێش و قافیە لە هەندێ رووەوە زیانی زۆری بە شیعرەکانی گەیاندووە. بەڵام جدییەت و هەستیاری ئەو سەبارەت بە زوڵمی کۆمەڵایەتی و تەبیعەت دۆستی ئەو، شیعرەکانی خستووەتە خانەی باشترین شیعری ڕۆژگاری ئەوەوە.

## ١١٥- ئیدوارد فیتزجراڵد

**١٨٠٩-١٨٨٣**

ئەدیب و وەرگێڕێکی گەورە بوو، بەتایبەتی لە بواری وەرگێڕانی شیعردا، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و پڕ ئیحتوباری کۆمەڵایەتی لەدایك بووە. لە ساڵی ١٨٣٠دا خوێندنی لە زانکۆی کمبریج تەواو کردووە. و خووی داوەتە زمانانی رۆژهەڵاتی، بەتایبەتی زمان و ئەدەبیاتی فارسی.

فیتزجراڵد لە ساڵی ١٨٥٣دا شەش درامای کالدیرونی وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی و چاپ و بڵاوی کردەوە. پاشان بە هاوکاری (ئی بی کۆول)ی رۆژهەڵاتناس بەیتێکی (جامی)ی بۆ ئینگلیزی گۆڕی و لە ساڵی ١٨٥٦دا چاپ و بڵاو بووەوە.

فیتزجراڵد کە لەم سەروبەندەدا زۆر دڵبەندی عومەری خەیام بوو بوو، دەستی دایە وەرگێڕانی چوارینەکانی ئەو. ئەو چوارینانەی بە شیعر وەرگێڕان و لە ساڵی ١٨٥٩دا بەبێ ناوی وەرگێڕ بڵاوی کردنەوە. هەرچەندە ئەم وەرگێڕانە ووشە بە ووشە نییە و وەرگێڕانێکی تەواو ئازادە، لێ فیتزجراڵد روحی بەرهەمەکەی پاراستووەو چەمکی گشتی چوارینەکان و فەلسەفەی خەیامی بەچاکی نیشانداوە.

## ١١٦- ئێرسکین کالدویل

(١٩٠٣-     )

خەڵکی باشووره، بابی کابرایەکی ئایینی بوو. لە زانکۆیانی ڤیرجینیا و پەنسیلڤانیا خوێندوویەتی، ماوەیەکی زۆر لە ئەمریکای ناوەندی دا وێڵ و سەرگەردان بوو. بۆ ماوەیەك خووی دایە وەرزشی فوتبۆڵ و بوو بە یاریزانێکی پیشەیی، بۆ ماوەیەکیش کاری پەیامنێری رۆژنامانی کرد. نزیکەی سەد کورتە چیرۆك و چەند رۆمانێکی لە پاش بەجێماوە کە زیاتر بە دەوری تەوەری ژیانی جوتیاران و رەشپێستانی گوندەکانی جۆرجیادا دەسوڕێنەوە. ئەم بەرهەمانە سەرەڕای بەرگری ناراستەوخۆیان لەدادی کۆمەڵایەتی، بە بەرهەمی غەیرە ئەخلاقیش ناوزەدکراون. بەشێوەیەکی گشتی بەرهەمەکانی کالدویل، کە لێوانلێوی تەنز و ریشخەنن، ئەمریکا بە رووت و قووتی وێنە دەگرێ.

(جادەی تووتن ١٩٣٢) رۆمانێکی واقیعیانەی کالدویلە و دەربارەی ژیانی خەڵکی ناوچە گوندنشینەکانی ئەمریکایە. کەسایەتی سەرەکی ئەم رۆمانە جووتیارێکی دەستکورتی جۆرجیاییە کە لەگەڵ خێزانە برسییەکەیدا لە جادەی تووتن دا دەژی. ئەو درامایەی کە لەم رۆمانەوە ئامادە کرا، لە ماوەی حەوت ساڵان دا (٣١٨٢) جار سەرکەوتووانە لە نیویورك نمایش کرا.

(بستێك خاکی خودا ١٩٣٣) رۆمانێکی دیکەی نووسەرە دەربارەی کوێستان نشینانی هەژار و نەداری جۆرجیا. شاقارەمانی رۆمانەکە دەرامەدی دەهەزار مەتر چوار گۆشەی زەوییەکەی خۆی بۆ کڵێسا تەرخان کردووە، بەڵام بەردەوام شوێنی ئەو دە هەزار مەترە بە گوێرەی مەرام و بەرنامەکانی خۆی دەگۆڕێ.

هەندێ لە رۆمانەکانی کالدویل، وەکو (زۆڵ-١٩٢٩) و (گەوجی داماو ١٩٣٠) لەسەر ژیانی چینی کرێکار نووسراوە. رۆمانانی (رێبوار-١٩٣٥) و (هەرای تەمووز-١٩٤٠) و (ئەم زەوییە-١٩٤٨) تایبەتن بە باشوور. (چرایەك بۆ شەوان) دەربارەی خەڵکی ویلایەتی مین-ەو (سەرانسەری شەو-١٩٤٢) دەربارەی جەنگاوەرانی میلیشایی روسیایە. (زەمینی خەمین ١٩٤٤) و دەستی دڵنیای خودا-١٩٤٧) دوو رۆمانی دیکە کالدویلن. کالدویل بە چەند کورتە چیرۆکێکی زۆر سەرکەوتوو هاتە مەیدان کە پاشان لە چەند کۆچیرۆکێك دا بڵاو بوونەتەوە

لەوانە: "کڕنۆش بەرانبەر بە خۆری پرشنگدار-١٩٣٥، خاکی ئەمریکا-١٩٥٠ و چیرۆکەکانی کەناری خەلیج-١٩٥٦". نێوەرۆکی سەرەکی بەرهەمەکانی کالدویل بریتییە لە دەستکورتی ئابوری. بێدادی کۆمەلاّیەتی و ئارەزوو مەیلی کەچڕەوی سێکسی. بە شێوەیەکی گشتی نووسەرێکی فرە بەرهەمی ئەوتۆ بوو کە لە ساڵی ١٩٤٩دا نزیکەی ٢٠ ملیۆن نوسخە لە بەرهەمەکانی لە بازاڕی کتێبباندا بوو.

## ١١٧- ساولْ بيلو

(١٩١٥-...)

له خێزانێكی جولەكه، له دەڤەری كێبێكی كانادا لەدايك بووە، بەڵام به منداڵی لـه شيكاگۆ ژياوە. له ساڵی ١٩٣٧دا لـه زانستگەی نورت و سترن بەكالۆريۆسی لـه واری كۆمەڵناسيدا وەرگرتووە و دەستی داوەته كاری دەرس وتنـەوە و هاوكاری دەگەڵ گۆڤاراندا. يەكەم رۆمانی ئەم نووسـەره ناوی "پياوی ئاوێزان-١٩٤٤"ـه ئەم رۆمانه لەشێوەی دەفتەری بيرەوەری پياوێك دا به نێوی جۆزيف نووسراوە كـه نيگـەرانی ئەوەيـه هـەر سـاتیٚ بيگـرن و بـۆ سـەربازی ببـەن. جۆزيـف لـەو ئاوێزانييه بیٚ تاقەت دەبیٚ و بەخۆی داوا دەكات كه بچیٚ بۆ خزمـەتی سـەربازی، هەڵبەته نەك له بەر بێزاری له فاشيستان، بەڵكو لەبەر ئەوەی كه دەيـەویٚ ژيانی بكەوێتـه سـەر سـكه و رەوتـی لـۆژيكی وەربگرێـت. دووەم رۆمـانی بلـو (قوربـانی ١٩٤٧)يـه كـه باسـی پەيوەنـدی نێـوان جولـەكان و غـەيره جولـەكان دەكـات. رۆمانێكی ديكەی هەيه بەناوی (سەركێشييەكانی ئوگی مارچ-١٩٥٣) ئەم رۆمانه قەڵـەمڕەوێكی كراوەتـر و گشـتی تـری هـەس. قارەمـانی سـەرەكی ئـەم رۆمانـه هـەرگيز لەگـەڵ ژينگـه جياوازەكانـدا ناسـازیٚ و بـه سـەلامەتی لـه هـەر قـەوماوێك دەرباز دەبیٚ. لـه رۆمـانی (هندرسنی پاشای باران-١٩٥٩)دا قارەمانی رۆمانەكه كه ئارەزووييەكی يەجگار زۆری وەدەست هێنانی ئەزموونانی هـەس، بۆ ئـەفريقيا دەچێت، ئەگـەر چـی زۆر وريـا دەبـیٚ و ئاگـاداری خۆيـەتی، بـەڵام تاسـەی ژيـان لەدەسـت نـادات. (هـيرزوگ-١٩٦٤) رۆمـانێكی ديكـەی نووسـەره دەربـارەی دەربارەی مامۆستايەكی مێژووە و زياتر دەربارەی ژيانی خودی نووسەره.

شـانۆنامەی (دوا شـيكاری-١٩٦٤) بلـۆ كـه لـه بـرادوی نيويـورك دا نمـايش كـرا، بەسەرهاتی پياوێكی دەروونناسه كه كەسايەتی خۆی لەسەر شاشەی تەلـەفزيۆن شی دەكاتەوە. بلو، شێوازێكی دەوڵەمەند، ئاڵۆز و بڕیٚ جار كۆميدی هەيـه. بـه پشتيوانی ئەزموونەكانی خۆی، وێنەی زۆر جوان و دەوڵەمەندی ژيان دەگرێت.

## ١١٨- شارل پیر بۆدلێر
(١٨٦٧-١٨٢١)

لە پاریس چاوی بە دنیادا هەڵێناوە، هەمیشە شاعیرێکی یاخی بووە، "یاخی لە کۆت و بەندی خێزانی، لە پرەنسیپانی قوتابخانەیی، یاخی لە هەر جۆرە هەڵسوکەوت و رەفتارێکی حورمەت ئامێز". هەرزوو ئەو تۆزە میراتییەی لە باببیەوە بۆی بەجێمابوو بەفیڕۆی داو گیرۆدەی قەرز و دەستکورتی و پەیوەندی ناشەرعی و ئاقیبەت شەڕ بوو. لەوە بەدواوە، لە رێگەی نووسینی رەخنەی هونەری، رۆژنامەنووسی و وەرگێڕانی کورتە چیرۆکەکانی ئیدگار ئالن پۆوە- کە لە سەرانسەری ئەوروپادا ناو و ناوبانگی بۆ پەیدا کرد بژێوی خۆی دابین دەکرد. بۆدلێر بە توندڕەوی لە بواری رابواردن و هەرزەکاریی دا، سەلامەتی خۆی خستە بەر مەترسی، و بۆ ژیان رووی کردە بەلجیك. لەوێندەر لە ئەنجامی شەپلەلێدانێکەوە، زمانی لەگۆ کەوت. پاشان بۆ پاریس گەڕایەوەو لەوێندەر مرد. بۆدلێر شاعیرانی پارناس بە سیمبولیستانەوە دەبەستێ. وەکو پارناسیان- کە بە "نەوگولانی شەڕ ١٨٦٦" لە بلاڤۆکەکەیاندا بەشداری کرد- زیاتر تاکید لەسەر حەقیقەتخوازی و فۆرم دەکاتەوە تا بابەت و ناوەرۆك. هەڵبەتە وەکو سیمبولیستەکان دەرونگەرا بوو و دەیویست پەیوەندی نێوان هۆکاری هەستە جۆراوجۆرەکان نیشان بدات، و مانای پەنهان و رەمزی لە پشت شتە بابەتیەکانەوە کە قاڵبی ئەو مانایانە بوون بدۆزێتەوە و کەشف بکات. لە خەمی شرۆڤەی ئەندێشەیەکی تایبەتی دا نییە، بەڵکو لە خەمی جولاندن و وروژاندنی زەین و هزری خوێنەر دایە.

کۆمەڵە شیعرەکەی بۆدلێر "گولانی شەڕ-١٨٥٨" ئالن پۆ و سوین برن دێنێتەوە یاد. شیعرەکانی ناو ئەو کۆشیعرە حاڵەتە روحییەکانی شاعیر پیشان دەدەن، دیارە شیعرەکان هەم جیاوازن و هەم لە یەك ئاستی هونەریدا نین، هەندێکیان زۆر بە بچووکییەوە پەشیمانی دەنوێنن، و هەندێکی تریان کفر و شەڕیان لێ دەبارێ. زۆر شیعریشی رەگی دەچێتەوە سەر بێزاری، مەرگ، هەرزەیی، گەندەڵی، دەروونگەرایی، توند و تیژی و هەستە تازە و سەیرەکانی شاعیر نیشان دەدەن.

شیعری بۆدلێر مۆسیقایەکی بەرزی تێدایەو لێوان لێوە لە وێنەی جوان و رەنگین و زەنگین. وێڕای شەقڵی هەستیاری دەروونگەرایی، یاسای کلاسیکی-شی

فەرامۆش نەکردووە لە واری فۆرمەوە لە لوتکەی کەماڵ دایە. وەکو باوە شیعری تازەی فەرەنسا لە بۆدلێرەوە دەست پێدەکات.

## ١١٩- ئارچیبالْد مكلیش

(١٨٩٢-١٩٨٢)

شـاعیر و نووسـەری كۆمەڵایـەتی بـاكووری ئەمریكایـە. پـاش بـڵاو كردنـەوەی كۆشـیعرێك بەناونیشـانی (بـورجی عـاج-١٩١٧) وڵاتـی خـۆی بـەرەو فەرەنسـا بەجێهێشت. تا ساڵی ١٩٢٨ لـە پـاریس مایـەوە، لـەو ماوەیـەدا لـە ژێـر كاریگـەری پاوەند، ئیلیوت و سیمبولیستەكانی فەرەنسادا بوو. دوو كۆمەڵـە كورتـە غـەزەلی بەناوی (زەماوەندی شاد -١٩٢٤) و (شەقامەكانی مانگ-١٩٢٦) بڵاو كـردەوە كـە تاقی كردنەوەی خۆی بوو لە مەیدانی وەزن و قافیەدا. كۆمەڵە شیعرێكی دیكـەی بەناونیشـانی "كونكویسـتادور-١٩٣٢" بـڵاو كـردەوەو خـەڵاتی "پولیتسـر"ی لەسەر وەرگـرت. ئـەم شیعرە درێـژە پێكادانی دوو شارستانییەتی روو لـە نـەمان وێنـە دەگرێـت. لـە سـاڵانی سـییەكانی سـەدەی بیسـتەمدا چـەند كۆشـیعرێكی دیكەی بڵاو كردەوە، لەوانە (سەرزەمینی ئازادان-١٩٣٨، ئـەمریكا خـاكی میعـاد بوو-١٩٣٩، و (شیعران: ١٩١٧-١٩٥٢) ١٩٥٢ كـە خـەڵاتی پۆلیتسـەری وەرگـرت. مكلیش لـە سـاڵانی سییەكانی سـەدەی بیسـتەم دا زۆر شانۆنامەی شیعری بڵاو كردنەوەو دەنگیان دایەوە.

هەندێ شانۆنامەی پـەیامی سیاسـیان لـەخۆ گرتـووە لەوانـە: "ترسـی بـێ بـنج و بناوان-١٩٣٥، وێرانسازان-١٩٤٢، كەوتنی شار-١٩٣٧".

مكلـیش لـە سـاڵانی جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا تـەواو سـەرگەرمی مەسـەلە مرۆڤانییەكان بوو. لە ساڵی ١٩٣٩دا لە كتێبخانـەی كۆنگرەدا پۆسـتی كتێبـداری وەرگرت و دەورێكی چالاكی لـە دامەزرانـدنی یۆنسكۆدا هـەبوو. پاشـان كۆمـەڵێك كـاری دیكـەی دەوڵـەتی وەرگـرت و لـە سـاڵی ١٩٤٤دا گەییـە پۆسـتی یاریـدەدەری وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریكا. شـیعری ئـەم قۆناغـەی ئـەو لێوانلێـوی سـۆزی نەتـەوەیی و نیشـتمانپەروەرییە. مكلـیش سـێیەمین خـەڵاتی پولیتسـەری لەسـەر شانۆنامەی شیعریی ئەیوب- ١٩٥٨ وەرگرت. لەم شانۆنامەیەدا كە لە حیكایەتی ئـەیوبی نـاو كتـێبی پـیرۆز وەرگـیراوە، بـەراوردێك لـە نێـوان ئـەیوب و مرۆڤـی سەردەمی تازەدا هەیە كە چۆن كەوتۆتە دنیایەكەوە ناتوانێ لە یاساكانی حاڵی ببێ.

"ئەسپی تەروا-١٩٥٢" بەرهەمێکی گرنگی دیکەی مکلیش-ە کە شانۆنامەیەکی رادیۆیی و تەنزییە لەسەر ترس لە کۆمۆنیزم، هەروەها "چەند گۆرانییەك بۆ حەوا-١٩٥٤" کە ئەمیش لە کتێبی پیرۆزەوە هەڵێنجراوە.
یەکێك لە بەرهەمەکانی دیکەی مکلیش تۆژینەوەیەکە بەناوی نامەسئولان-١٩٤٠ کە دەربارەی شاعیر و پەیامەکانی شاعیرە، پاشان کۆمەڵە وتارێکی هەڵبژاردەی بەناونیشانی "کاتی کار-١٩٤٣" بڵاو کردووەتەوە.

## ١٢٠- ماكسويل ئاندیرسۆن

**١٨٨٨-١٩٥٩**

**يەكێك بوو لە درامانووسانی وەچەی ئونیل كە لە واری تازە كردنەوەی ژیانی درامــادا لــە پلــەی دوای ئــەوەوە دێ. ئاندیرســۆن هــەوەڵی تەمــەنی لاوی لــە پەنسـیلڤانیا، داكۆتـای بـاكور و كالیفۆرنیـا بـە دەرسـگوتنەوە و رۆژنامـەوانی گوزەراند. پاشان بۆ نیویورك رۆیی و سەركەوتووترین بەرهەمی خۆی لەوێندەر نووسی. شۆرەتی ئاندیرسۆن دەگەڕێتـەوە بۆ پڕ ئـەزموونی لـە بـواری درامـای شـیعری و سـوور بـوونی لەســەر زەرورەتــی خــەباتی ئـەخلاقی دەروونــی، و كارامــەیی لــە زەمینــەی درامـای مێژوویـیدا. یەكـەمین شـانۆنامەی ئاندیرسـۆن بەناونیشانی "بیابانی سپی" لە ساڵی ١٩٢٣دا بڵاو بووەوە. پاشان بە هاوكاری شــانۆنامەنووس "لــورانس ســتالینگز" كــە هــاوڵاتی خــۆی بــوو، كۆمــەڵێك شـانۆنامەی نووسـی و بـڵاوی كـردەوە لەوانـە: "بـەهای سـەركەوتن ١٩٢٤" كـە دەربـارەی جەنگـە و لـەم شانۆنامەیەدا زمـانی گروبانـانی سوپایی هێناوەتـە نـاو شانۆوە، "یەكەمین فڕین-١٩٢٥" دەربارەی ئەندرو جكسن-ـە، "دزی دەریـایی-١٩٢٥" دەربـاری سـێرهنری مۆرگانـە. ئاندیرسـۆن لـە ئـاخر و ئـۆخری سـاڵانی بیستەكانی سـەدەی بیسـتەمدا كۆمـەڵێك شـانۆنامەی نووسـی لەوانـە: "منـاڵانی شەممە-١٩٢٧" ئەوسا بە هاوكاری هارولد هیكرسون شانۆنامەی (خوداوەندانی هەورە تریشـقە-١٩٢٨) نووسـی كـە دۆز و مەسـەلەی سـاكو- وانزتـی كـردووە بـە هـەوێن. ئاندیرسـۆن پاشـان لـە قـاڵبی شـانۆنامەیەكی شیعریدا بـەناوی "گرووپـی زستانی-١٩٣٥" دایڕشتەوە و بڵاوی كردەوە.**

**ئاندیرسـۆن لـە سـاڵانی سـییەكانی سـەدەی بیسـتەمدا گەڕایـەوە سـەر درامـای مێــژوویی، و دوو تراژیــدیای شــیعری رۆمــانتیكی بــە ناونیشــانی "مەلیكــە ئیلیزابـت-١٩٣٠ و مـاری ئەسـكاتلەندی-١٩٣٣" بـڵاو كـردەوە كـە نـاوەرۆكی هەردووكیانی لە سەدەی شازدەیەمەوە هەڵێنجاوە. هەر لە هەمان سەروبەندا دوو شانۆنامەی تری بڵاو كردۆتەوە بە ناونیشانی "هـەردوو ماڵەكـەی ئێـوە ١٩٣٣" و "گردی بەرز ١٩٣٧".**

**جـەنگی جیهـانی دووەم لــە چــەند شــانۆنامەیەكی ســاڵانی چـلەكانی ســەدەی بیسـتەمی ئاندیرسـۆن دا وێنـەگیراوە. لەوانـە: "مـۆمی بـەردەم بـا-١٩٤١"، ئەمـە درامایـەكی ئـەنتی نازییـە و رووداوەكانی لە پاریس دا روو دەدەن. پاش جەنگ**

دیسـان گەڕایـەوە سـەر درامـای مێـژوویی. یـەكێك لـە كارەكـانی ئـەم بـوارەی شانۆنامەیەكە دەربارەی سوكرات بەناونیشانی "بە پێ خاوسی لە ئەسینا دا-١٩٥١".

هەندێ لە شانۆنامە بەرجەستەكانی ئاخروئۆخری تەمەنی ئاندیرسۆن بریتین لە "گوم بووی نێو ستێران-١٩٤٩" كە ئیلهامی ئەو شانۆنامەیەی لە ڕۆمانێكی ئالن پیتون-ەوە وەرگرتووە. و "وەچەی بەد-١٩٥٥" كە لە ڕۆمانێكی ولیام مارچ-ەوە هەڵێنجراوە.

ئاندیرسۆن بیرو باوەڕی خۆی لەمەڕ شانۆ لە چەند كتێبێكی وەكو (بنەمای تراژیدیا-١٩٣٩) و (ئەوبەری برووردوەی-١٩٤٠)دا دەربڕیوەو نیشانداوە.

## ۱۲۱- پول ڤارلین

### ١٨٩٦-١٨٤٤

ڤارلین شاعیرێکی دەست بڵاوو ئەهلی رابواردن بوو. هاوسەرەکەی لێی جیا بووەوە. بەدەستی خۆی رامبۆی مورید و باشترین دۆستی خۆی بەر گوللە داو بریندار کرد. لەسەر ئەم کارە بۆ ماوەی ساڵ و نیوێك ١٨٧٣-١٨٧٥ لە موون زیندانی کرا. پاشان بۆ پاریس گەڕایەوەو تا کۆتایی تەمەنی بە دەست کورتی و کولەمەرگی ژیا.

شیعری ڤارلین لە باری رازئامێزی، ناسکی، مۆسیقا، دەروونگەرایی و ماخۆلان ئامێزییەوە مەنشورە. هەندێ لە شیعرەکانی رەنگدانەوەی عەیاشی و رابواردن و بێ سەروبەری شاعیرن و ئەوانی دیکەش لێوان لێون لە پەشیمانی و دینداری مەزەبی. یەکەم کۆ شیعری (اشعار کیوانی ١٨٦٦)ە کە دەسەڵاتی پارناسییەکان و و بۆدلێر بەسەر شاعیرەوە نیشاندەدا. (کۆڕی ناسکی ١٨٩٦) کۆمەڵێك وێنەی جوان و دڵگیری ڤێرسای سەدەی هەژدەیەم دەگرێت.

(ئاوازی خۆش ١٨٧٠) بریتییە لە ٢٦ شیعر و لە زەماوەندەکەی خۆی و "موتە دوفلورڤیل"ەوە هەڵیهێنجاوە. "سەربوری ڤیانی بێ گوتار-١٨٧٤" کۆمەڵە شیعرێکی لیریکییە لە ڤارلین دڵتەنگی و بێزاری و نامۆیی خۆی لە " موتە دوفلورڤیل" دەردەبڕێ. (ئاوەز-١٨٨١) کە یەکێکە لە گەورەترین کتێبانی شیعرێن مەزەبی لە جیهاندا و سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی گیانی ڤارلین لە پرەنسیپەکانی کڵێسای کاتولیکی رۆم، و شیعرەکانی ماوەی زیندانی شاعیری لەخۆ گرتووە. "مانگەشەو، ئاسمان، لە سەربان، گۆرانی پایزی" لە شیعرە هەرە بەناوبانگەکانی ڤارلین-ن.

## ١٢٢-جان ئارتور رامبۆ

### ١٨٩١-١٨٥٤

دۆست و موریدی ڤارلین بوو، تا تەمەنی ١٩ ساڵی هەموو شیعرەکانی خۆی گوت و لەوە بەدواوە هەرگیز شیعری نەگوت. پاش ئەوەی بەینی لەگەڵ ڤارلینی مامۆستایدا تێکچوو، چەند ساڵێك لە پاریس و ئەوروپادا مایەوە و لەم ماوەیەدا گەلێك کاری هەمەجۆری کرد وەکو مامۆستایەتی، فیتەری کەشتی، سەربازی، وەرگێڕی، ماموری سەربازگیری، سەندوقداری و دیدەوانی راووشکار. لە ساڵی ١٨٨٠دا چوو بۆ کەناری رۆژهەڵاتی ئەفریقا و ماوەی یازدە ساڵی لە حەبەشەدا بە کڕین و فرۆشتنی (قاوە، چەك، کۆیلە) بردە سەر. شیعری رامبۆ لە رووی ریتم و ئاهەنگەوە لە شیعری ڤارلین ناسکترە. دیارترین تایبەتمەندی شیعری رامبۆ بریتییە لە: "رەنگی تۆن، سادەیی هزر، دوورە پەرێزی لە یاسا و رێسا، سوود وەرگرتنی کەم لە شیعری ئازاد، رستەی کورت و ئاڵۆزاندنی بە ئانقەست، رازاندنەوەی وێنەو.. دوو کۆشیعری زۆر بەناوبانگی هەیە بەناونیشانی (ئیشراق-درەوشانەوە، و وەرزێك لە دۆزەخ). هەڵبەتە وەرزێك لە دۆزەخ ژیاننامەی قۆناغی پێگەیشتنی شاعیرە. هەڵبەتە چەند بەیتێکی بەناوبانگیشی هەیە بە ناونیشانی "بەلەمی مەست و سوناتای پیتێن دەنگدار ".

## حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایک بووە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلێژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.

• یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.

- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

*لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی کوردستان بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ٢٠١٠/٨/٢٠راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.

- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێک لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆک، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧
٣- بەیداخ، چیرۆک، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆک ،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆک،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆک، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ
٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی

٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧

١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راە کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.

١١- هاومالّەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گولّان

١٢ – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦

١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق

١٤- دوورە ولّات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گولّان

١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨

١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر

١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥

١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەلّە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦

١٩- جیٚ پیٚ (کۆمەلّە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك

٢٠- زندە خەون، کۆمەلّە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی

٢١- چیرۆکستان ،کۆمەلّێك دەقورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك

٢٢-دیدارو دەقو رەخنە،چ٢٠٠٥،١

٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١

٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك

٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٢٧- مێژووی رەگ و رەچەلّەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨١،١

٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤

٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦

٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧

٣١ –کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨

٣٢- چینی کۆن، چ١(  )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی

٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر

٣٦- به دوعا شاعیرەکان، شانۆنامه، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامه،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامه، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامه، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو به چاو، شانۆنامه، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامه، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایه، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامه، عەبدوڵڵائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵه دارینه، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییه؟ کۆمەڵه چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٥- شوانه بچکۆلەکه، چیرۆکێکی درێژی چینی یه بۆ منداڵان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامه بۆ مناڵان)
٤٧- چەند چیرۆکێك له ئەفسانەی یونانی کۆنەوه (٢٣ئەفسانه)

---

٤٨- له گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوه. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیاده، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

---

٥١- گۆڤەنـد و زنـار (فەرهـەنگی فارسـی - کـوردی) حەمـه کـەریم عـارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ له شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

---

٦١- راگەیاندن له پەراوێزی دەسەڵاتدا (به شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٢-راگەیاندن له نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمه کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

---

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٦- ریالیزمودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ٢٠٠٤،١،دەزگای سپیرێز
٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ٢٠٠٦،١دەزگای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦
٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ٢٠٠٧،١
٧٥- دەربارەی رۆمان و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨
٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك
٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩
٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()
٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤
٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف
٨١-بووکی هەزار زاوا، کۆچیرۆك، بزورگی عەلەوی
٨٢-ئەبوزەر، د.عەلی شەریعەتی
٨٣-ریوایەت، ڕۆمان، بزورگی عەلەوی
٨٤-وقفات في رحاب الثقافة الكوردية، حەمە کەریم عارف
٨٥-هەژاران، ڕۆمان، دوستوفسکی
٨٦-دەیڤد کۆپەرفیلد، (رۆمانی کورتکراوە بۆ نەوجەوانان) چارلس دیکنز
٨٧-ئۆدیسە، داستان، هۆمیرۆس
٨٨-ظل الصوت و قصص اخرى، تقديم و ترجمة جلال زنگابادی
٨٩-شازادە و گەدا، رۆمان، مارك توین
٩٠-شاکارێن ئەدەبیاتی جیهان
٩١-سفرەی فەقیران....... حەمە کەریم عارف

* لە راپەڕینەوە تا نەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...

# له پێناوی ڕاستیدا
# ئەوەی گیزە گیز بچێنێ، نابووتی دەدورێتەوە.

## حەمە کەریم عارف

ڕۆژی ٢٠٠٦/٨/٢٩ بوو،چوومە دەوام بۆ دەزگای ڕۆشنبیری شەفەق لە کەرکوك،لە ژووری خۆم دانیشتبووم ، سەعات دەو بیست و یەك دەقیقە بوو،ژمێریار مووچەکەی بۆ هێنام، تەماشای لیستی مووچەکەم کرد ، سەیرم کرد کرابوو بە شەش سەدوپەنجا هەزار دینار،لە کاتێکدا مووچەی بەندە حەوت سەدو پەنجا هەزار دینـاربوو،(بەنەسرییەوە کە پەنجا هەزار دیناربوو)،واتە مووچەکەم کەم کرابووەوە،( لە کاتێکدا پەیمانێکی چەند خاڵی لە بەینی بەندەو بەدران ئەحمەدا هەبوو،کە خاڵێکیان ئەوە بوو مووچەکەم بە هیچ جۆرێ کەم ناکرێتەوە...)،بە هەر حاڵ لیستەکەم ئیمزاکردو لە ئاستی ناوەکەمدا نووسیم (ئافەرین بۆ خۆتان!!).

دوای نیو سەعاتێك هەستام ، بچم بۆ ماڵی خوشکم لە گەڕەکی کوردستانی کەرکوك کە هەندێ نانیان بۆ کردبووین تا بیبەمەوە، سواری ئوتومبێل بووم وچوومە ئەوێندەر، دوای چاك وخۆشی و هەواڵپرسین،سواری ئۆتۆمبیلەکەم بووم وبەناوجەرگەی کەرکوکدا بۆ سلێمانی وەڕێکەوتم، بە سەیتەرەکانی کەرکوك، قەرەهەنجیر ،چەمچەماڵ، تەکیەدا ڕەت بووم، هیچ نەبوو،گەییمە کانی شەیتان، مەفرەزەیەکی مرور ڕایانگرتم:

- بێ زەحمەت کوا ڕەقەمەکەت ؟

دابەزیم سەیری پاش و پێشی ئۆتۆمبیلەکەم کرد ژمارەی پێوە نەما بوو،خۆ بە یانی تابلۆی ژمارەکانی پێوە بوو، خۆ ئۆتۆمبێل جگە لە دەزگای شەفەق لە چ شوێنێکی دیکە ڕانەگیراوە، پێم گوتن :

من حەمە کەریم عارفم، لە دەزگای شەفەقی کەرکوك کار دەکەم، ئیجرائاتی یاسایی ئاسانم لە گەڵ بکەن و ئیشەکەم لێ قورس مەکەن، ئید ی بەدەم پسوڵە نووسینەوە کەوتنە قسە کردن،

- ماموستا تۆ شانست هەیە، چۆن بەبێ ژمارە بەناو کەرکوکدا هاتوویت و تووشی مەفرەزەی ئەمریکییەکان نەبووی، باوەڕبکە بیانگرتبای بە ئیرهابیان لەقەڵەم دەدایت و تیادەچوی، ئێستاش هیچ عاجز مەبە خۆت و سەیارەکە دە بێ حیجز بکرێن،ڕەنگە چاوپۆشی لە حیجز کردنی خۆت بکرێت، بەڵام ئۆتۆمبیلەکە مەحاڵە، تا ئەو تابلۆی ژمارانە نەیەتەوە بەربوونی نییە،بەم شێوەیە لە بەرواری ٢٠٠٦/٨/٢٩ بە ژمارەی ت/٢٠٠٦ نوسراویان بۆ کردم و پۆلیسێکیان لەگەڵ ناردم بۆ گەراجی دەست بەسەراگرتنی ئۆتۆمبێل،ئوتومبیلم تەسلیم کردو بۆ ماڵ هاتمەوە ،بیرم کردەوە،ناکرێ ئەم ژمارانە مرور لەبەر موخالەفەیەك لێیکردبنەوە، ئەگەر بە ڕێکەوت کەوتبێ ما قوول نییە هەردووکی بە جارێ بکەوێ، کەواتە دەبێ کەسێك ئەم کارەی کردبێ بۆ تووش کردنی من ...ئۆتۆمبیلم تەنیا لە دەزگای شەفەق ڕاگرتووە ونەمبردۆتە شوێنێکی دی و خۆ ماڵی خوشکم کاری وا لەگەڵ مند ا ناکەن.. بەبێ تاقەتی کەوتمە

تەماشاکردنی دە فتەری تەلەفۆناتەکەم، لە پڕ چاوم بە ژمارەی تەلەفۆنی کاك دکتۆر نوری کەوت، کە هاوکاری نزیکی جەنابی نێچیرڤان بارزانییە، تەلە فۆنم بۆکردو ڕوخسەتم لێ خواست کە یەك دوو دەقیقەیەك گویّم لیّ بگرێ ، بەحەقیقەت دڵسۆزانە گوێی لێگرتم و بەندەش حیکایەتەکەم لە نووکەوە بۆ گێڕایەوە...ئەوجا وتی:

– کاك حەمە تۆ تەلەفۆنەکەت داخە، من تۆزێکی دی جوابت لێدەگێڕمەوە..

دوای تۆزێکی دی بە لوتفی خۆی قەرزارباری کردم و تەلەفۆنی کردەوە:

–کاك حەمە تەلەفۆن بۆ شاخەوانە، کێیە بکە با هەر ئێستا تابلۆی ژمارەکانت بۆ بگێڕێتەوە...

شاخەوان تایپیست و هەڵەچنی دەزگای ئاراس بوو،بەدران ماوەیەك بوو ناردبووی بۆدەزگای شەفەق وگوایە کردبووی بە جێگری خۆی!!..کوڕینە پیاو تا شاخەوان کەرکۆکی نەبینێت قەدری مامۆستا بەدران!! نازانێت،هەربۆیە ئەم تەیرە گولە ئاشقی ئەو داری زەقنەبووتە بووبوو وهێنابوویە کەرکوك.. بە هەرحاڵ تەلەفۆنم بۆکردو هیچ حاشای لێنەکرد، بە نەبەدڵی گوتی:

–باشە وەرە بۆی...

گوتم:

–بابەگیان من خۆم و ئۆتۆمبیلەکەم لە حیجزداین چی بێم بۆی ! چۆنت ڕەقەمەکان دزی ئاوا بینێرەوەو ئەمە ئەمری سەرەوەیە و حەتمەن ئاغات (بەدران) تەلە فۆنی بۆ کردوویت..

ئیدی بەپەلە سایەقەکانی بانگ کردبوو ، کێ ماڵی حەمە کەریم عارف دەزانێ ؟

ئیدی پرسیاریان کردبوو بۆچی ،ئەویش بەناچاری باسی ناردنەوەی ڕەقەمەکانی کردبوو،تومەز کە ڕەقەمەکانی بە دزییەوە کردبووەوە لە دەزگا دای نەنابوو، بەڵکو ناردبوویەوە بۆ ماڵی خۆیان!..بەهەرحاڵ تەماحی نابووە بەر سایەقەکان هەر کەسێك ڕەقەمەکان بەرێتەوە بۆ سلێمانی بەنزینی ئەمسەرو ئەوسەری بۆ دەکرێت ، نانخواردنی ڕێگەشی لە سەر ئەو..بەو جۆرە سڕەکە هەڵماڵراو سیحرو بەتاڵبوونەوەی سیحرەکە کەشف بوو!..سیحری قەڵب سەری ساحێبی!..

سایەقەکان ملیان نەدابوو،پاشان یەکێکیانی بردبوو بۆ ماڵی خۆیان (کەئێستا بەبێ هیچ هۆیەك دەرکراوە!) ڕەقەمەکانی دابوویێ، ئەویش ڕەقەمەکانی بە برایەکی مندا کەپەیوەندی بە شەفەقەوە نەبووە، ناردبووەوە بۆ سلێمانی،بە هەرحاڵ دوای دوو ڕۆژ ئەمسەرو ئەوسەرو موراجەعەی دایەرەکانی سلێمانی و ٣٠ هەزار دینار غەرامە، ئۆتۆمبێلەکە لە حیجز بەردرا.

دیارە من ئەم ڕووداوەم بۆ زۆر کەسی دیکەش گێڕاوەتەوە وبەنووسین ودەست خەتی من لای هەندێ کەس پارێزراوەو وەکو خەبەریش لە سەرەتاکانی مانگی ٢٠٠٦/٩ لە ڕۆژنامەی (کەرکوکی ئەمڕۆ) ئاماژەیەکی خێرای پێدراوە...

هەڵبەتە من لە ٢٠٠٦/٨/٣٠ وە ئیدی نەچوومەوە بۆ دەزگای شەفەق، چونکە قەناعەتم وایە بەرپرسێك ئەو ڕێگە پێچاوپێچە بگرێتەبەرو زەرەیەك ویژدانی نەبزوێ و ئەو هەموو ناهەقییە بکات و هەر بە مەبەستی تووشکردنی من تابلۆی ژمارەی سەیارە بەدزییەوە لێ بکاتەوە، دەشتوانێ لە شارێکی پڕ ئاژاوەی بێ خاوەنی وەکو کەرکوکدا قونبەلەیەك بخاتە ژێر ئۆتۆمبیلەکەم و تیابچم و کەسیش گومان لەو نەکات!.. بەمەش خزمەتی خۆی بکات!! هەڵبەتە

ئەمـەش شـێوەیەك بـوو لەشـێوەكانی دەركـردن و دەركـردنیش لـەوە ئاشـكراتر نـابێ.. بەڕاسـتی مەسئولیەت هەر وادەبێ! بژی مەسئولیەت !

هەڵبەتــە لــە ٢٠٠٦/٨/٢٣ دا ،( شــاخەوان كــەركۆكی) لــە كۆبوونەوەیــەكی ڕەسمیــدا و بــە ئامـادەبوونی كۆمـەڵێك كارمەنـدی دەزگـا، بەتایبـەت سـتاڤی ئەوسـای گۆڤـاری نەوشـەفەق،كە هـەموویان مـاون پێـی ڕاگەیانـدنم كـە (كـاك بـەدران ) گوتویـەتی گۆڤارەكـە زۆر بـێ مسـتەوایە و دایدەخـەم، مـن پـێم گـوت : كـەیفی خۆیـەتی ، ئەمـە بیـانووە، دەنـا بـە درێـژایی مێـژووی شـاری كەركوك لە پێش زاینەوە تا ئەمڕۆ بە هیچ زمانێك گۆڤاری لەو مستەوایە لە كەركوك دەرنەچووە، هەڵبەتـە مـن بـاوەڕ ناكـەم نـەكاری كردنـەوەی ڕەقـەمی سـەیارەكەی بـەبێ پـرس كردبـێ و نەئـەو قسەیەشـی (داخسـتنی نەوشـەفەق)لـە گیرفـانی خـۆی دەرهێنـابێ، چـونكە یەكـەم نوێنـەرێكی وەفـاداری بەدرانـەو بابایـەكی مـەئمورەو مـەئموریش مـەعزورە، بەتایبـەتی ئەگـەر خزمـەت و پێگەیشتنی خۆی(هەڵبەتە بەپێی تێگەیشتنی خۆی لە پێگەیشتن) بەلاوە گرنگ بێ با لەسەر حیسابی خەڵكیش بێ، دووەم هەر ماوەیەكی زۆر كەم لە دوای دەوام نەكردنی بەندە، گۆڤارێكی دیكە لەدەزگای شەفەق بە ناوی (كانیاو) دەرچوو... دیارە ئەمە بەو نیازە بوو كە (كانیاو) جێی نەوشەفەق بگرێتەوە كە وادەرنەچوو..لەلایەكی دیكەشەوە درێژە بە(نەوشەفەق) نەدرا، چونكە بەنـدە سەرنووسـەری بـووم و مۆڵـەتی گۆڤارەكـە بـەناوی كـاك فەلەكـەدین و بەنـدەوە بـوو كەبەنووسـراوی ٢٢٩لـە ٢٠٠٣/٤/٣٠ مۆڵـەتی ژمـارە ١٤١ ی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری هـەرێمی كوردستانی عێراقی پێدراوە..دیارە ئێمە ئەو هەنگاوە یاساییەمان نا،لەو باوەڕەوە بوو كە جۆرە بەستنەوەیەكی كەركوك بوو لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە بە هەرێمی كوردستانەوەو بەشدارییەكی ڕۆشـنبیرانە بـوو لـە خـەباتی گەڕاندنـەوەی كـەركوك بـۆ سـەر هـەرێمی كوردسـتان، بۆیـە ئـەو مۆڵەتەمان زۆر مەبەست بوو، بەبێ ئەو مۆڵەتەش ئیشمان نەدەكرد..

جا ئەگەر بە ناهەق ناوی بەندە وەكو سەرنووسەر لەسەر گۆڤاری نەوشـەفەق لابرایەو ناوی كەسێكی دی دابنرایـە ئـەوا ئـەو پرسیارە دروست دەبوو،ئەدی حەمە كـەریم عـارف!.. نـەخێر داخستنی گۆڤارەكە لە هەمووی مەسڵەحەتترە! هەم ناوی حەمە كەریم عارف لادەبرێ، وهەم ئەو سین و جیمەش بەرۆكان ناگرێ..(ڕێگاكەش ڕێگایەكی پێچاوپێچەو هەموو كەس پەی پێنابات، ئافەرین خوتتەی جەهەننەمی) ئەگەر مەسەلەكە ناو وناوبانگ بێ خۆ بەندە پێشتر سەرنووسەری گۆڤاری گولانی عەرەبی بووم كە بەر بلاو ترین گۆڤاری كوردستان بوو، و بەڕای گەلێك لە گەورە نووسـەران و هزرڤانـانی عـەرەب یـەكێك بـوو لـە گۆڤـارە هـەرە باشـەكانی كوردسـتان ، بـەڵكو سەرانسەری عێراق، هەندێ لەو ڕاوبۆچوون و هەڵسەنگاندننامانە لە یەكێك لە ژمارەكانی گولانی عەرەبیـدا بلاوكراونەتـەوە، پـێم وایـە ژمـارە حـەفتاو چـوارە،بۆیە سەرنووسـەری مـن بـۆ گۆڤـاری نەشەفەق تەنیا جۆرە كەركوكچیایەتییەك بوو بۆ ئەم قۆناغەی ئێستای كەركوك ، دەنا نە ئیمتیاز بوو نەخێرێك بوو پێم كرابێ، نە خزمەنكردنی خۆم (كەس دەتوانێ بە حەوسەدو پەنجا هەزار دیناری ڕووت و قووت خزمەتی خۆی بكات!) واتە شەفەق و دەزگای شەفەق پێویستیان بە من بوو ، نەك بە پێچەوانەوە ،ئەوان خۆیان بە من خزمەت كرد نەك بە پێچەوانەوە...جا گەلۆ، ئەوە

حەوت مانگی ڕەبەقە من لە ماڵی خۆم دانیشتووم،و تاقە عانەیەکم وەرنەگرتووە، وئەگەر هەر پارەیەك بەناوی منەوە وەرگیرابێ ئەوا بەدران و پۆلیسەکەی (شاخەوان کەرکۆکی!)لێی بەرپرسن.. بەداخەوە نەوشەفەق ئەو حەوت مانگە دەرنەچوو،جا لەم مانگەدا (مانگی سێ)لەبەر ئەوەی کانیاو نەبوو بەو ئەسپە ڕەسەنەی گرەوی لەسەر بکرێ، و خەمخۆرانی ڕۆشنبیری وە ئاگا هاتنەوە و هەستیان کرد غیابی نەوشەفەق بۆشاییەکی دروستکردووە، هەرکەسەو بە شێوازی خۆی کەوتە پرسیارو کارکردن بۆ گەڕاندنەوەی نەوشەفەق.. بۆیە بەپەلە پیرۆزێ، لەم مانگی سێیەدا برادەران بایان دایەوە سەر گۆڤارە (بێ مستەواکەی نەوشەفەق!) ژمارە چل و دوویان دەرکردەوە.. بەراستی مەگەر حیکایەتی شووتی و فەقێکان پاکانە بۆ ئەمە بکات!..

بەهەرحاڵ دەرکراوەتەوە، لە چ ئاستێکدایە، چی دەبێ، ئەمە پەیوەندی بە خۆیانەوە هەیە، چ پاکانەیەك بۆ خۆیان و هەڵوێستی خۆیان دێننەوە ئەمە کەیفی خۆیانە... بەڵام ڕوونکردنەوەیەکیان نووسیوە کە بە گەلە کۆمەکێ نووسراوە، چونکە لە هەندێ شوێن بە ڕاناوی لکاوی یەکەم کەسی تاك دەدوێن و لەهەندێ شوێندا بە ڕاناوی لکاوی یەکەم کەسی کۆ دەدوێن... بەهەرحاڵ لەو ڕوونکردنەوەیەدا جگە لەوەی هەندێ بوختانی زەقیان بۆ کردووم ، کۆمەڵێك منەتی خۆڕاییشیان بە سەردا کردووم، کە بە پێویستی دەزانم هەڵوەستەیەکی خێرایان لە سەر بکەم و خەمخۆرانی ڕاستییان لێ ئاگادار بکەمەوە، هەڵبەتە لە دوو تویێ ئەم وەڵامنامەیەدا بەشی یەك دوو چێرۆکی دیکەم هێشتووەتەوە، تەمەننا دەکەم ناچار نەبم بیانگێڕمەوە...

بە هەرحاڵ لە ڕوونکردنەوەکەدا دەڵێن((...کاك حەمەکەریم عارف کە سەرنووسەری کۆوارەکە بوو لە ڕۆژی ٢٠٠٦/٨/٣٠ بەبێ هۆیەکی دیار لە دەزگاکەمان و کارەکەی دابڕاو سەری نەکردەوە بە دەزگاکەماندا، ئێمە لە دەزگای شەفەق هەر چەندە تێبینی زۆرمان هەبوو لە سەر شێوازی کارو جۆری مامەڵە کردنی ئەو برادەرە لەگەڵ نووسەران و ڕۆشنبیرانی شاری کەرکوك، بەڵام ئەو ماوەیە هەر چاوەڕوان بووین کە ڕوونکردنەوەیەکی هەبێت بۆ ئەو دابڕانە، کەبەداخەوە نەیبوو، و بە پێچەوانە ڕێگەی پێچاوپێچی گرتەبەر بۆ ئەوەی کارێك بکات کە تەنها خزمەتی خۆی بکات وەکو چۆن لەکاتی کارکردنی لەدەزگا هەر بەو شێوەیە ڕەفتاری دەکرد، ئەمە وای کرد دەزگا بڕیار بدات بەبێ ئەو کۆوارەکە دەربکاتەوەو خوا یار بێ بەم شێوەیەی ئێستای بەردەوام دەبێت...)).

خوێنەرانی ئازیز:

بەندە لەسەرێ ڕا شێوازی مامەڵەو ڕەفتاری برادەرانی دەزگای شەفەقم ڕوونکردەوە، بەویژدانتان ئەوە دەرکردن نەبێ چییە؟، ئەگەر ئەوە هۆیەکی دیار نەبێت پێم وایە ڕۆژیش بە دیار نازانرێ، ئەرێ ئێوە لەجێی من بن سەر بە شوێنی وادا دەکەنەوە!.. دەوام نەکردنی من شێوازێکی شارستانیانەی بەرەڤانییە لە خۆم، دیارە ئەو برادەرانە حەز ناکەن کەس بەرەڤانی لەخۆی بکات ، جا من پێم وایە هەر کەسێك هەوڵنەدات فێر بێ چۆن بەرەڤانی لەخۆی بکات، بۆئەوە باشە وەکو کۆیلە مامەڵەی لەتەکدا بکرێ، کەبەدرێژایی مێژووی بەشەریەتیش هەر

واكراوە... هەڵبەتە من نە یەکەم کەسم و نە دوا کەسیش دەبم ئابەو شێوەیە لە دەزگای ناوبراو ڕاوەدوونراوم، خۆ لەسەرەتاوە کۆمەڵێك ڕۆشنبیری دیکەش لەو دەزگایەدا کاریان دەکردو هەر یەکەیان بەشێوازێك دەرکران، بێگومان هەر یەکێك لەوانە لە واری خۆیدا سیمایەك بوو، سەنگێکی ڕۆشنبیری هەبوو، واجیهەیەکی جوان بوون بۆ خاوەنی دەزگاکە .. ئەو ڕۆشنبیرانە بریتی بوون لە : ئەحمەد تاقانە، جەلیل کاکە وەیس، هیمەت کاکەیی، جەلال زەنگابادی، و تاریق کارێزی...) هەڵبەتە یەکەم و دووەمی ئەو زاتانە بەیاننامەشیان دەرکردو بە ڕاشکاوی خاڵیان خستبووە سەر حەرفان و خەتاباریان دەست نیشان کردبوو کە مامۆستا بەدرانە!!!،ئەو دوو بەیاننامەیە ماون ، هەندێکی دیکەشیان شوێنی بەرزیان ئاگادار کردۆتەوە ، دەڵێم کە ئەو ڕۆشنبیرانە کە هەریەکێکیان بە شێوەیەك دەرکران، بۆچی برادەرانی شەفەق بسکەی سمێڵیان دەهات وبە دڵو بە گیان ئەمری وەهمیان دەر هەقیان جێ بە جێ دەکرد!

برادەرانی شەفەق تێبینیان زۆرە... غافڵن لەوەی کەئەگەر ئەوان تێبینی یەکی نەهەق و هەڵبەستراویان لەسەر خەڵکێك هەبێ، ئەوا خەڵکی دەیان تێبینی بەڵگەداریان لە سەر وان هەیە.. من یەکێکم لەوانەی قاییل نیم بەوەی کەسێك بەدڵی هەموو کەس بێ، هەموو کەس ڕازی بکات، چونکە ئەوە دیاردەیەکی سەلبییەو مرۆڤ لە سیفەت و خەسڵەتە مرۆڤانییەکانی خۆی دادەماڵێ و دووچاری خیانەت لە ئینسانیەتی خۆی دەبێ.. من لە دەزگای شەفەق کارم دەکرد،کاریش، بە تایبەت کاری جددی دەرهاوێشتەی خۆی هەیە، من سەر نووسەر بووم ، هەر سەرنووسەرێك داینەمۆو فیلتەری بڵاوکراوەکەی خۆیەتی ، جا ئەگەر من لەبەر هۆیەکی ڕۆشنبیری یان هونەری بابەتێکم ڕەفزکردبێ یان دوام خستبێ و خاوەنەکەی گلەییەکی لێ کردبم، بائێستاش بیکات،چونکە من مومارەسەی سەلاحیەتی خۆم کردووە، و ئەمە یەکێکە لەو ڕاستە ڕێگایانەی کەمن باوەڕم پێی هەبووە و بە گوێرەی دەرفەتیش گرتوومەتە بەر ... من بە خەیاڵی ڕەحەت و ویژدانی ئاسودەوە دەیڵێم کەبەرانبەر بە هیچ نووسەر یان ڕۆشنبیرێکی شاری کەرکوك نە غەڵەتم کردووە ، نەغەدرم کردووە، نەنانی کەسم بڕیوە،خەڵکی دیکە هەموو ئەوانەشی کردووە و لە خێلڕوانی برادەرانی شەفەقەوە، لێی جوانە و باریکەلای بۆ دەکرێ!! هەڵبەتە خوێنەران ئاگادارن کە گۆڤاری نەوشەفەق ناوی دەستەیەکی ڕاوێژکارانی بەسەرەوەیە، ئەوانە لە هەر چوار نکالی دنیاوە کۆکراونەوتەوە، دیارە بەندە پرسم بەیەك بە یەکیان کردووە ئەوجا ناوم داناون،زۆربەیان زەحمەتیان کێشاوەو نامەیان بۆ ناردوم ، نامەی زۆریانم لە یەکێك لە ژمارەکانی نەوشەفەقدا بڵاو کردۆتەوە،دەتوانن ئەو نامانە بەسەر بکەنەوە و بەخۆتان بزانن ئەو نامانە بە چ لوتف و دۆستایەتی یەکەوە نوسراون، (هەڵبەتە ئەگەر ئەو هەموو تێبینی یەی برادەرانی شەفەق گوایە لەسەر منیان هەبووە،دروست بوایە، ئەو برایانە بەو گەرمی یە بەدەنگ منەوە نەدەهاتن)،چونکە هیچ یەکێك لەو برادەرانە پێویستیان بەناو نییە،بۆ خۆیان ناودارن ولە ئاستێکی ڕۆشنبیری وەهادان لە هەر مەجلیسێکی ڕۆشنبیریدا بەسەفیری ڕاستەقینەی کوردو کەرکوك بزانرێن،تۆ بڵێی ئەمە نیشانەی مامەڵە خراپی بەندە بێ!!

جا گەلۆ من لە ٢٠٠٦/٨/٣٠ وە لە ماڵی خۆم دانیشتووم و ئەمە بە شێوازێکی شارستانیانەی بەرەڤانی لە خۆم دەزانم، کەچی کەچروانانی شەفەق تاوانبارم دەکەن کە ڕێگەی پێچاو پێچی گرتۆتە بەر، خزمەتی خۆی کردووە، و خزمەتی خۆی دەکات...

کەسێ نەزانێ دەڵێ ڕەنگە حەمە کەریم عارف کلکی کەری قازیی بڕی بێ! بەخودای کاری وام نەکردووە، بەڵام لە برادەرانی شەفەق وایە هەرکەسێك وەکو خۆیان نەبێ ئەوا ئیدی ڕێگای پێچاوپێچی گرتۆتە بەرو خزمەتی خۆی کردووە..دیارە ئەوەی من بناسێت دەزانێ من لەوەتەی فامم کردۆتەوە کوڕی ڕاستە ڕێگایان بووم و پێچاوپێچم نەناسیوەو بەرەڤانی کردنیش لە خۆ بە ڕێگەی پێچاوپێچ نازانم...بۆ مەسەلەی خزمەتکردنی خۆ ... پێم وایە هەر خزمەت کردنێك لە سەر حەساوی خەڵکی دیکە نەبێ کارێکی باش و حەڵاڵە، کە من لە ژیانمدا لە سەرحیسابی هیچ کەسێك خزمەتی خۆم نەکردووە ..لەهەرەتی پارە زۆری دەزگای شەفەقدا،بەهەموو ئیمتیازاتێکەوە تەنیا حەوت سەد وپەنجا هەزار دینارم وەرگرتووە،کە هەموو کەس دەزانێ ئەمە وەکو هەق نیوەی هەقی من نەبووە چ وەك ڕەنج و و ماند وو بوون چ وەك بواری کاریش...بەڵام بۆ کەرکوکەو بە خەسار ناچێ...ئەو خەڵکانەی من دەناسن، شایەتن لە سەردەمی منداڵیمەوە تاکو ئێستاش هەر بە هەژاری ، ئەمما سەربەرزانە وەکو پیرەمەگرون ژیاوم و دەژیم خودا شاهیدە پاروویەکی حەرامم نەخواردووە! لە سێبەرێکی حەرامدا دانەنیشتووم، ڕەنگە بەغیلی ئەوەم پێببەن بۆیە کەوتوونەتە دەڵبیێژی و نەهەقی کردن و بوختان هەڵبەستن...خۆ هەموو موڵك و ماڵی دونیای من قەڵەمێکی موتەوازیعە،و ئەویش بە ئیعترافی دژمن بەر لە دۆست، لە پەڕەی گوڵ پاکترەو من تا ئێستا پتر لە هەفتا کتێبم هەیە کە ئەگەر کۆسپ و تەگەرەی لابەلاو بەغیلی نەهەق نەبووایە ئێستا لەسەرووی سەد کتێبم دەبوو...جا ڕەنگە برادەرانی شەفەق بەغیلی ئەوەم پێببەن، لە جیاتی بڵێن دەست وچاوت خۆش بێ و خەرمان بەرەکەت...بەڵام دەڵێی چی مرۆڤ شیری خاوی خواردووە...خودا هیدایەتیان بدات.

جا برادەرانی عازیزی شەفەق، سەرێ هەڵبڕن، بزانن خەڵکی گەییوەتە کوێ و ئێوە لە کوێ چەقێنراون، وچۆن لە شوێنی خۆتانا پاگیرەتان پێ دەکرێ ، و چ گیزە گیزێکیان پێ ناونەتەوە!برادەرینە وریا بن ئەوەی گیزە گیز بچێنێ نابووتی دەدورێتەوە...

دەرچوونەوەی گۆڤارەکەش ، بڕیاری ئێوە نەبوو، خۆتان مەخڵەتێنن ، چونکە ئەمەش چیرۆکێکی هەیە، ئەگەر جارێ منیش نەیگێڕمەوە، ڕۆژگار دەیگێڕێتەوە..((ئەرێ بۆ لەخۆتان ناپرسن بۆچی گۆڤاری نەوشەفەق بەناوی کەرکوکەوە لە هەولێر دەردەچێت. تۆبڵێی ئەم ماستە گوریسێکی تیا نەبێ)).

هەر بژین

ڕێ بە ڕاست بەد بەخوا

حەمەکەریم عارف– کەرکوك:٢٠٠٧/٤/٨